# سەردەم

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بیانی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم دەریدەکات
ژمارە (12) ک.1ی. 2000 — ساڵی دووەم

خاوەنی ئیمتیاز : شێرکۆ بێکەس

سەرنووسەر : ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین : ئازاد بەرزنجی

دەستەی نووسین :

ڕێبین هەردی

شوان ئەحمەد

شاهۆ سەعید

دەرهێنانی هونەری : قادر میرخان

مۆنتاژی کۆمپیوتەری: یادگار ئەوڕەحمان

ناونیشان:

سلێمانی — فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن : 29839 یان 4347

بۆ پەیوەندی کردن لەدەرەوەی وڵاتەوە

سەنتەری سەرچنار

Tel: 0044 162 84 86008 - Fax: 0044 162 84 77660

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لەڕێی سندوقی پۆستی ژمارە

14665/615 و 14665/616 تاران

# سەردەم

ژمارە (12) ک. 1ی 2000 ساڵی دووەم

# فیکرو فەلسەفە

- یورگن هابرماس — هاشم ساڵح
- تێڕوانین بە ئاراستەی ساڵی 2000 — گیێردا لیێرنر
- ژن و نووسین — محەمەد نورەدین ئەفایە

# یۆرگن هابرماس:

## ئەقلانیەت و مۆدێرنیتی (2)

■ هاشم سالّح

● و. لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

.. کەواتە "هابرماس" بۆ ئەوە هات تا چارەسەرێك بۆ ئەو قەیرانەی مۆدێرنێتی بخاتە بەردەست کە لە ساتەوەختی ئێستادا دووچاری خۆرئاوا هاتووە* . هەروەك پێشتریش باسمانکرد "هابرماس" لە دەست نیشانکردن و لێکدانەوەکانی "ماکس ڤیبەر"ە وە دەستی پێکرد. دەستپێکردنی لەویشەوە بۆ ئەوەبوو تا فەلسەفەیەکی نوێ بۆ مۆدێرنیتی دەستەبەر بکات، بەبێ ئەوەی دەستبەرداری چەمکی ئەقڵ بێت. بەم پێیەش ئەو رزگارکەری ئەقلانیەتی ئەوروپییە. لێرەوە جێی سەرسوڕمان نییە کە فەرەنسیەکان پەنای بەرنە بەر، لەدوای ئەوەی بێزاربوون لە هەڵکۆڵینی ئارکیۆلۆژی بەشێوەی "میشیل فۆکۆ"، یاخود لێك



هابرماس

* ئەم وتارە بەشی دووەمی نووسینێکی درێژی (هاشم سالّح)ە سەبارەت بە (فەلسەفەی هاوچەرخی ئەڵمانی). یەکەمین بەشی لە ژمارەی پێشووی سەردەم (11)دا بڵاوکراوەتەوە.

شیتاڵکردنی ناوخۆیی میتافیزیکای خۆرئاوا (واتا ئەقڵانیەتی خۆرئاوا) بە شێوەی "جاك دێریدا".

لەبەر ئەمە لەم چەند ساڵانەی دوایدا بزوتنەوەیەکی بەرفراوان بۆ وەرگێڕانی بەرهەمەکانی بۆ سەر زمانی فەرەنسی دەستی پێکرد. هاوکات چەندین کتێب و کارنامەی زانکۆیی لە بارەیەوە نووسرا. تەنانەت هەندێك "کانتێکی نوێ"ی تێدا دەبینن کە هاتووە بۆ ئەوەی تۆزوغوبار لە ئەقڵی خۆرئاوا داماڵێت و، سەرلەنوێ لەسەر ڕێسایەکی پتەو دایبمەزرێنێتەوە. بەجۆرێك کە تەواوی دەسکەوتەکانی زانستە مرۆڤایەتیەکان، ئەو دەسکەوتانەی بە درێژایی چل ساڵی رابردوو بەدەست هاتوون لەبەرچاو بگرێت. هەر لە سۆسیۆلۆژیاوە بۆ ئەنترۆپۆلۆژیاو دەروونشیکاریو زمانەوانی نوێ و.. هتد.

"هابرماس" پێی وایە کە (نائومێدی جیهان) یاخود پەراوێزکەوتنی لێکدانەوەی میتۆلۆژی لەسەر رووبەری جیهان و شتەکان بەو ئەندازەیەی "ماکس ڤیبەر" مەزەندەی دەکات جێی مەترسی نییە. ئەویش لەبەرئەوەی لێکدانەوەی میتۆلۆژی بۆ جیهان وەك لێکدانەوە خودهوشیاری بەخۆی نییە. بەڵکو پێی وایە لێکدانەوەی ئەو بۆ جیهان خودی جیهانو خۆیەتی و، ناتوانێت لەوە بگات خوێندنەوەی ئەو تەنها خوێندنەوەیەکە لە ریزی ئەو خوێندنەوانەی تر کە دەشێت بۆ جیهان بکرێت. تەنانەت ناتوانێت رەهەندێکی رەخنەیش لە نێوان خۆی و لێکدانەوەکانیدا دروست بکات بۆ ئەوەی جیهان وەکی خۆی ببینێت، بە واتای لە دەرەوە را لێی بڕوانێت. بەم پێیەش ئەوا وەها لێکدانەوەیەك ناڕەخنەییەو هەڵەش قبوڵ ناکات. ئەوە لە کاتێکدا لێکدانەوەی ئەقڵانی بۆ جیهان کە پاش کەمبوونەوەی رۆڵی لێکدانەوەی میتۆلۆژی و "نائومێدبوونی جیهان" هاتە ئارا، دان بەوەدا دەنێت کە لێکدانەوەیەکی رێژەییەو مەرجە بشکەوێتە هەڵەوە. لە هەمان کاتدا تێکەڵیەك لە نێوان خۆیی و جیهاندا دروست ناکات و، لە نێوان لێکدانەوە بۆ واقیع و خودی واقیع لە خۆیدا جیاکارییەك دەکات. لەبەرئەوەی ئەم دوو شتە هاوتاو هاوشێوەی یەکتر نین. لێرەوە مرۆڤ بۆ یەکەمجار توانی جیهان وەکی خۆی ببینێت: بەمانای جیهانێکی خاڵی لە ئەفسون و سەرنج راکێشی و دیاردە سەرسوڕهێنەرەکان.

مرۆڤ بۆ یەکەمین جار گەیشتە ئەوەی دەست بە کەشفکردنی یاسا زانستیەکان بکات، ئەو یاسایانەی بەشێوەیەکی فعلی و واقیعی ئاراستەی دیاردەکان دەکەن و، هاوکات دەستبەرداری ئە و لێکدانەوە میتۆلۆژیانەش بێت کە لەوەو بەر بەسەر مرۆڤەوە باڵادەست بوو. مۆدێرنیتی کتومت ئا لێرەوە دەست پێدەکات: مۆدێرنیتی بەمانای گواستنەوە لە تەفسیرکردنی میتۆلۆژیانەوە بۆ جیهان، بەرەو تەفسیرکردنێکی ئەقڵانی یاخود زانستی بۆ جیهان. ئەمە لە هەمان کاتدا بە مانای کۆنترۆڵکردن و دیسپلین کردنی جیهانیش دێت.

ئەوەش یەکێك لەو لایەنە سلبیانەی لێدەکەوێتەوە کە بەردەوام لە ساتەوەختی ئێستا لەلایەن رەخنەگرانی مۆدێرنیتییەوە سەرکۆنە دەکرێت: ئەو لایەنەش بریتییە لە گۆڕینی جیهان بۆ یەك نمونەی لێکچوو هاوشێوە کە سەرتاسەری گۆی زەوی دەگرێتەوە.

لێرەوە مەترسی سڕینەوەی کلتورە جیاجیاکانی مرۆڤایەتی و گۆڕینی بۆ تەنها کلتورێکی لەیەك چوو دێتە ئارا کە خۆرئاوای خاوەن هێز هەناردەی تەواوی ناوچەکانی جیهانی دەکات. بەمجۆرە دەبینین تەعمیمکردنی ئەقڵانیەت لەیەك کاتدا لایەنی پۆزەتڤی و نێگەتڤی خۆی هەیە. چونکە رەنگە ئەقڵ لە پێناو چارەسەرکردنی گیروگرفت و ئازادی و رزگاربووندا بەکار بهێنرێت، هاوکات دەشێت لە پێناو

خزمەتكردنی مەرامە تایبەتیەكان و دەستگرتن بەسەر كەسانی تردا بەكار بهێنرێت. تەنانەت رەنگە عەقڵ بۆ پێچەوانەی ئاراستەی خۆی وەرگەڕێت و ئەقڵانیەت بە نائەقڵانیەتێكی سەركێش و ماڵوێرانكەر بگۆڕێت، هەروەك ئەوەی لە ماوەی ئەوجی هەڵچوون و تورەیی نازیزم یان فاشیزم یاخود كۆمۆنیزمی ستالینیدا رویدا. لەم كاتەدا ئەقڵ (واتە ئەقڵی تەكنەلۆژی و زانستی) وەكی ئامرازێكی تۆقێنەر بۆ پاكتاوكردنی دەستەجەمعی مرۆڤ، یان تەنانەت بۆ كاولكردنی تەواوی گۆی زەوی بەكاردەهێنرێت. واتە لەوانەیە چەمكی ئەقڵ لە رێی چاكەدا یاخود لە رێی شەڕو خراپەدا بەكار بهێنرێت.

بە درێژایی دوو سەد ساڵی رابردوو واتە لەوكاتەوەی مۆدێرنێتی و ئەقڵانیەت هێدی هێدی دەستیان بەسەر ئەوروپادا گرت، زیاد لە جارێك بە هەردوو بارەكەیدا بەكارهێنراوە. چونكە خۆرئاوا لایەنی چاكەو لایەنی خراپەشی تێدایە، واتە تەواوی خۆرئاوا خراپەكاری نییە وەكی هەندێك پێیان وایە. گەر وەها بوایە شارستانیەت نەیدەتوانی بەدرێژی هەموو ئەو ماوەیە خۆی لە بەرامبەر ئەو هەڕەشەو مەترسیە زۆرانەدا رابگرێت كە لەسەر ئاستی ناوخۆ و دەرەوە بەرەو رووی بوونەوە.

هەرچۆنێك بێت و سەرەڕای هەموو ئەو ماڵوێرانی و لادانانەش كە روویاندا، بەلام "هابرماس" نایەوێت قوربانی بە بیرۆكەی ئەقل بدات وەكی ئەوەی چەندین بیرمەندی دیكەی لە وێنەی (نیچە یان نیهلیستیەكان یاخود قوتابخانەی فرانكفۆرت و مارتن هایدگەر، یان ئەوانەی پێیان دەوترێت فەیلەسوفانی پاش بونیادگەری: بەتایبەت فۆكۆو دێریدا) كردیان. بەڵكو ئەو دەیەوێت چەمكی مۆدێرنیتی و چەمكی ئەقڵ رەخنە بكات، ئەویش لە رێگای پێشنیاركردنی چەمكێكی تازە بۆ ئەقڵ و بۆ ئەقڵانیەت.

لێرەوە هەندێك وەكی وتمان (كانتێكی نوێ)ی تێدا دەبینن كە هاتووە بۆ ئەوەی ئەقڵی خۆرئاوا لەسەر بنەمایەكی پتەو دابمەزرێنێت وەك ئەوەی (كانت) بەر لە دوو سەد ساڵ پێی هەستا، كاتێك كتێبە بەناوبانگەی (رەخنەی ئەقڵی پەتی) لە ساڵی ***1781***دا نووسی. "هابرماس" بوونی نائەقڵانیەت لە مێژوودا رەتناكاتەوەو، ئەوە دەزانێت كە رەنگە مێژو و لە ساتەوەختێكدا، هەرچی رق و تووڕەییە لە ناخیدا خاڵی بكاتەوە. هەروەها ئەوەش دەزانێت كە مێژوو دەركەوتنی "قارەمانی" پاسیڤی هەڵەشەی لە شێوەی "ئەدۆلف هتلەر" بەخۆوە دەبینێت كە سەركێشی بەهەموو شتێكەوە دەكەن و لەكاتێكی سەرشێتی ماڵوێرانكەردا تەڕوو وشك بەیەكەوە دەسوتێنن.

ئەو چۆن ئەوەی لەبیر دەچێت لەكاتێكدا خۆی ئەڵمانیەو زۆری بەدەست: ئەو ناوبانگە رەشەوە چەشتووە كە "هتلەر" بە میراتی بۆ ئەڵمانیاو شارستانیەتەكەی بەجێ هێشتووە؟ لەبەرئەوە "هابرماس" زۆر سوورە لەسەر رزگاركردنی بیرۆكەی ئەقڵانیەت و دەسكەوتە ئیجابیەكانی مۆدێرنێتی بەهەر نرخێك بووە. ئەو لەمڕۆ بەدواوە نایەوێت شێتی بەسەر مێژوودا یاخود نائەقڵانیەت بەسەر ئەقڵانیەتدا باڵادەست بێت.

**"هابرماس" و تیۆرەی كردەی كۆمنیكاشێونخوازی**

كەواتە بابگەڕێینەوە سەر بیرۆكەی ئەفسانەو ئەقڵ، ئەو بیرۆكەیەی لە ساتەوەختی گریكەوە تا ئەمڕۆ باڵادەستی بەسەر فەلسەفەی ئەوروپی و غەیرە ئەوروپیەوە هەبوو. ئاخۆ تەواوی مێژووی فیكر بۆخۆی بریتی نەبووە لە جۆرە ململانێیەكی نێوان ئەفسانەو ئەقڵ، نێوان ئەفلاتون و ئەرستۆ، نێوان خەیاڵێكی سەركێش و ئەقڵێكی سەنگین، نێوان نیچەو كانت، یاخود لە سەردەمی ئێستاماندا لە نێوان فۆكۆو هابر ماسدا؟

ئاخۆ چەمکی ئەقڵ جێگە بایەخ و گرنگی فەیلەسوفەکان نەبووە لە سەردەمانی کۆنەوە هەتا ئەمڕۆ؟ ئایا فەیلەسوفی مەزن ئەو کەسە نییە کە دەتوانێت بکاتە مانایەکی تازە بۆ ئەقل و -هاوکات بۆ حەقیقەتیش- لەسەردەمێك لە سەردەمەکان و لەناو نەتەوەیەك لە نەتەوەکاندا؟ ئەم چەمکە تازەیەش توانای ئەوەی دەبێت چارەسەری کێشەکانی چرکەساتێکی مێژووی بکات و کەلێنێك بکاتە دیواری مێژووی کلۆمدراو.

کاتێك مێژوو بێ ئەندازە ناهەموارو دژوار دەبێت و، رەش و سپی لێك جیاناکرێنەوەو، بەهاکان لنگەوقوچ دەبن، ئا لەو کاتەدا مەزنە بیریارەکان دێنە ئاراوە بۆ ئەوەی گەلەکانیان لە کەوتنە ناو تەونی عەدەمیەت و لەبەریەك هەڵوەشان و تێئاوارەبوون رزگار بکەن. هەر ئەم کارەش بوو "ئەفلاتۆن" لە ساتەوەختی خۆیدا لە دژی سۆفیستەکان و "دیکارت" لە دژی سکولائیستە ئەرسۆدەکسیەکان و "کانت" لە دژی گومانکارەکان کردیان و، هەروەها "هیگڵ"یش. هەر ئەم کارەشە کە "هابرماس" لەمڕۆدا هەوڵدەدات بە ئەنجامی بگەیەنێت.

گەورەیی پرۆژەکەی "هابرماس" و مەترسی ئەو ئەرکەی لە ئەستۆی دەگرێت لێرەوە سەرچاوە دەگرێت. تەواوی ئایندەی خۆرئاواش لەسەر ئەمە راوەستاوە. بەڵام ئێستا ئێمە لێرەدا ناچینە ناو وردەکاری ئەو مەسەلەیەو درێژەی نادەینێ، چونکە چونە ناو وەها مەسەلەیەك ئاڵۆزو زەحمەت و ناهەموارە. بۆیە هەوڵدەدەم کەم تا زۆر رۆنانەکەم روون و ئاشکرا بێت و خوێنەر تێی بگات.

"ماکس ڤیبەر" ترسی لەوە هەبوو سەردەمی مۆدێرنیتی ببێتە مایەی لەبەریەك هەڵوەشانی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان بەهۆی هەرەسهێنانی بەها تەقلیدیە (یاخود مەسیحی)یە رەهاکان، ئەو بەهایانەی بەسەر ئەقڵی مرۆڤەکاندا باڵادەست بوون. لەسەردەمی مۆدێرنێتیدا بەهاکان بوونە رێژەیی و فرە بەهای هاتە ئاراوەو، مرۆڤ سەرپشك بوو لەوەی پەیرەوی ئەو سستمی بەهایە بکات کە لەگەڵیدا دەگونجێت. فەردگەرایی بووە بنەما لە بری مانەوە لە فەلەکی گروپ و ژیانی کۆمەڵایەتیدا. لە و جێگایەی "ڤیبەر" لە دەست دانی مانای تێدا دەبینی و بەهەڕەشەیەکی عەدەمیەتی دەزانی، "هابرماس" لەو جێگایەدا تالێکی وردی ئەقلانیەتی بەدی دەکرد کە "ڤیبەر" پەی پێ نەبردبوو، لەبەر هۆیەکی سادەو ساکار ئەویش ئەوەیە کە نەی بینیووە.

دەبێت بڵێین بیرمەند هەرچەندە مەزنیش بێت ناتوانێت هەموو شتێك ببینێت، چونکە بەهۆی گرنگی دان بە هەندێك شت بە پێویست لە ئاست هەندێکی تردا نابینا دەبێت. "هابرماس" پێی وایە کە پەیامی ئەفسانە بەشێوەیەکی کوێرانەو کاڵفامانە لەلایەن خەڵکیەوە پەسەند دەکراو، تەنانەت ئەو گروهانە لە ئەفسانەدا جۆرێك لە ئەفسانەیان نەدەبینی. بەڵکو بە حەقیقەتێکی حاشاهەڵنەگریان دەدایە قەڵەم. بەم پێیە ئەوا هەرەسهێنانی سەردەمی ئەفسانە یاخود پاشەکشەکردنی لەسەر رووی جیهان نابێتە مایەی بێمانایی یان رۆچوون لە دەریای عەدەمیەتدا وەك ئەوەی "ڤیبەرو نیچە" ترسیان لێی هەبوو، بەڵکو دەبێتە مایەی ئەوەی پێبنێینە ناو سەردەمێکی تازەی چەمکی حەقیقەت و ئەقڵ. لێرەوە بۆ یەکەم جار جیهان دەبێتە تەنێك لە دەرەوەی خۆمان و، قەوارەیەك کە لە گەڵیدا تێکەڵ بەیەك نین. بە واتایەکی دی وشەکان لە شتەکان جوێ بوونەوەو، بۆچوونمان دەربارەی جیهان (یاخود واقیع) نەبووە خودی جیهان خۆی. جیهان هەیەو لێکدانەوە یاخود لێکدانەوەی جیاجیای خۆشی هەیەو، پێویستە لە فرە لێکدانەوە نەترسین لەبەرئەوەی جیهان بەبرشت و هەمەڕەنگەو ناشێت هیچ لێکدانەوەیەك لە بێخی بهێنێت. ئەگەرچی حەقیقەت لە سەردەمی

مۆدێرنیتیدا بووە شتێکی ڕێژەیی پاش ئەوەی لە رایردوودا رەها بوو، بەلام دەبێت ئەمە زۆر نەمان ترسێنێت، لەبەرئەوەی ئەمە نابێتە مایەی گەیشتن بە عەدەمیەت. تەنانەت حەقیقەت کاتێك بوو بە ڕێژەیی زۆرتر مرۆڤ دۆستانەترو کەمتر سەرکوتکەرترو دیسپۆتیزمی تر بوو، هاوکات وای لێهات مشتومڕی لە بارەوە بکرێت و بەردەوام راستبکرێتەوە یاخود بە بەردەوامی پەرەی پێ بدرێت. لێرەوە کار گەیشتە ئەوەی "گاستۆن باشلار"ی باوکی ئەبستمۆلۆژیای فەرەنسی هاوچەرخ بڵێت: حەقیقەت هیچ نییە جگە لەو هەڵەیەی بە بەردەوامی هەوڵی راستکردنەوەی دەدەین!

هێندەش بەسە کە سەرنجێکی پەرەسەندنی زانستەکان و بەدوایەکدا هاتنی تیۆریا زانستی و فەلسەفیەکان بدەین تا لەوە دڵنیا بین، ئەم تێگەیشتنە تازەیە بۆ حەقیقەت لەو تێگەیشتنە رەهایەی کۆنی قوتار کردین، کە دەبوو بە شێوەیەکی کوێرانەو بێ هیچ مشتومڕێك پەسەندی بکەین. لەم سەروبەندەدا "هابرماس" پێی وایە- جەوهەری تیۆریاکەشی لێرەدایە- تەنانەت لە گفتوگۆیەکی زمانەوانی ئاسایدا کە لەنێوان دوو مرۆڤ لە هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی دیاریکراودا رودەدات، بڵێسەیەکی ئەقڵانی یاخود وزەیەکی ئەقڵانی هەیە. لەبەرئەوەی بونیادی دیالۆگ خوازانەی زمان لێوان لێوە بە ئەگەرەکانی هاوپەیمانێتی و پێکەوە ژیان و ئەقڵانیەت. بەم پێیە ئەو تەباییەی لە ئاکامی دیالۆگی زمانەوانی یاخود پەیوەندیدارێتیەوە دروست دەبێت بەرزترین ئاستێکە کە جێگای شکۆمەندی ئەفسانە لەسەردەمانی پێشوودا دەگرێتەوە.

بەلام هەندێك رەخنە لە "هابرماس" دەگرن و دەڵێن: مەرج نییە گفتوگۆی زمانەوانی یان کۆمینکاشیۆنی ببێتە مایەی پێکهاتن و ئاشتبوونەوەو چارەسەری ئەقڵانی، بەڵکو رەنگە سەرنەگرێت و ببێتە هۆی شەڕو پێکدادان.. دواتر دەبینن چۆن چۆنی "هابرماس" وەلامی ئەمجۆرە بۆچوونە دەداتەوە.

هەرچۆنێك بێت ئەم تەبابوونە دیموکراسیەی دەرەنجامی دیالۆگی زمانەوانی یاخود کۆمنیکاشیۆنیەو بۆخۆی گرەنتی ئازاد بوون و کامڵ بوونی ئەقڵەو، دەبێتە مایەی دەرفەت دان بە رزگارکردنی وزە شاراوەکانی ئەقڵانیەت. دەرەنجامی ئەمەش ئازادی و سەربەخۆیی شەخسیە. لەسەر بنەمای ئەم تەباییە چاوەڕوانکراوە "هابرماس" هەوڵدەدات تیۆریاکەی خۆی کە پەیوەندی بە ئەقلانیەتەوە هەیە دابمەزرێنێت. ئەویش تیۆریایەکە وەك دەبینین لەسەر چەمکێکی سەرەکی دامەزراوەو بریتییە لە: چەمکی ئەقڵی کۆمنیکاشیۆنی. ئێمە ئەوە دەزانین کە (تیۆریای کردەی کۆمنیکاشیۆنی) ناونیشانی گەورەترین کتێبی "هابرماس"ەو لە دەقە ئەڵمانیەکەیدا زیاد لە هەزارو دووسەد لاپەڕە دەبێت. بەلام بەپێی تێگەیشتنی "هابرماس" ئەقلانیەتی کۆمنیکاشیۆنخوازی چی دەگەیەنێت؟

"هابرماس" پێی وایە ئەقل جەوهەرێك نییە، بەڵکو سیفەیەکە. واتا پێویست بە کات بە فیرۆدان ناکات لەوەی قسە دەربارەی جەوهەری ئەقڵ بکەین وەك ئەوەی میتافیزیکیەکان دەیانکرد، بەڵکو ئەوەی پێویستە ئەوەیە قسە لەوە بکەین چی لە قسەو کرداردا ئەقڵانییە یان نائەقڵانییە. چونکە ئەمە ئاسانترو نزیکە دەستترە. ئەگەر گوتارێك هەبێت گفتوگۆ یان رەخنە رەتبکاتەوە ئەوا خۆبەخۆو بەشێوەیەکی ئۆتۆماتیکی خۆی لە مەیدانی ئەقڵانیەت دوور دەخاتەوە. لێرەوە مەزنە فەیلەسوفی ئەڵمانی دەکاتە جیاوازی کردن لە نێوان دوو جۆر لە ئەقڵانیەت:

### 1-ئەقڵانیەتی مەعریفی -ئامێرخوازی:

ئەمەش ئەقڵانیەتێکی بەرتەسکە لەبەرئەوەی ئیکتیفا بە پێودانگە پراگماتیکیەکانی سەرکەوتن و نشوستی دەکات لە بەڕێوەبردنی کاروباری تەکنەلۆژی و ئامێرو ئامرازەکاندا. ئامانجیش گەیشتنە بە سوود و قازانج بەهەر شێوەیەك بێت. راستە وەها ئەقڵانیەتێك پێویستە بۆ کۆمەڵگا لە پێناو دەستگرتن بەسەر سروشتدا لە رێی تەکنەلۆژیاوە، بەڵام رەنگە لە رێگای خۆی لابدات و ببێتە ئەقڵانیەتێکی هەلپەرست و ژمارەیی ساردوسڕ کە ئامانجی زۆرترین قازانجە. ئەمەش ئەو ئەقڵیەتەیە کە بەسەر ناوەندی کۆمپانیا سەرمایەداریە زەبەلاحەکاندا باڵادەستە، ئەو کۆمپانیایانەی بەردەوام لە بازاڕی تازەو قازانجی تازە دەگەڕێن.

ئەم ئەقڵانیەتەش بوو کە نەوەی یەکەم لە قوتابخانەی فرانکفۆرت (واتە هۆرکهایمەر ئادۆرنۆ) سەرکۆنەیان کردو بەلادانێکیان لە پرانسیپەکانی ئەقڵی رۆشنگەری لە قەڵەم دا. ئەمە بەکارهێنانی ئەقڵە لەپێناو مەبەستی تایبەتی و کۆنترۆڵکردنی زیاتری بازاڕو کۆکردنەوەی ماڵ و سامان (ئەمەش خەسڵەتی ئەو ئەقڵیەتە سەرمایەداریە چاوچنۆکەیە کە تێر نابێت).

### 2-ئەقڵانیەتی کۆمنیکا شێونخوازی:

ئەمە ئەقڵانیەتێکی بەرفراوان و چاکترە لەبەرئەوەی پشت بەهێزی گفتوگۆو قەناعەتپێکردن دەبەستێت بەبێ هیچ زەبرو زۆرێك. دەرەنجامی کۆدەنگیە لە گفتوگۆی ئازادی نێوان سەرجەم ئەندامانی کۆمەڵ بەبێ پەیڕەوکردنی هیچ جۆرە فشارێکی دەرەکی لە بەرامبەریاندا، مەگەر تەنها فشاری بەڵگەی ئەقڵانی روت نەبێت. بە واتایەکی دی دەتوانین بەپێی بۆچوونی "هابرماس" ئەوکاتە بە بەکارهێنانی مەعریفەیەك بڵێین ئەقڵانیە کە مل بدات بۆ مشتومڕو گفتوگۆ لەسەر کردنی لەلایەن کەسانی خوێندەوارەوە. ئەوەش گفتوگۆیەکی ئازادەو خاڵیە لەهەر فشارو زەبرو زۆرێك. بەم پێیە هەر بۆچونێك مل بۆ تاوتوێکردن و قسە لەسەرکردن نەدات لەلایەن خودەکاراکانەوە ناشێت بە ئەقڵانی لە قەڵەم بدرێت بەپێی تیۆریاکەی "هابرماس". کاتێکیش ناکۆکیەك بەهۆی بیرۆکەیەکی تایبەت یاخود یاسایەکی دیاریکراوەوە دروست دەبێت ئەوا تاکە دەزگایەك کە لە باریدا بێت ئەو کێشەیە یەکلایی بکاتەوە ئەو دادگا بابەتیەیە بۆ گفتوگۆی ئازادو ئەقڵانی لە نێوان خودەکاراو چالاکەکاندا. کارێك کە دەبێت تەنها پشت بە سەنگ و قورسایی باشترین بۆچوون ببەستێت.

ئەم دادگا ئەقڵانیەش پێماندەخاتە ناو حەرەمی کردەی کۆمنیکاشیۆنی کە "هابرماس" باسی لێوە دەکات. بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە ئەگەرچی "هابرماس" کتێبێکی قەوارە گەورەی هەزارو دووسەد لاپەڕەیی بە ناونیشانی (تیۆریای کردەی کۆمنیکاشیۆنخوازی) داناوە، بۆمانی روونناکاتەوە کە مەبەستی لەم چەمکە چیە. بەڵکو بەوەندە دەوەستێت کە بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆو پچرپچڕ لێرەو لەوێ لە توتوێی کتێبەکەیدا باسی لێبکات. ئەو لە رێگای لێدوان لەسەر تیۆریای بیریارانی دیکەی وەك (ماکس ڤیبەر یان دورکهایم یاخود زانای ئەنترۆپۆلۆژیای بەناوبانگی ئەمریکی مارگریت میر)ەوە، باس لەم چەمکە دەکات. پێویستە لەسەرمان لە میانەی خوێندنەوەی کتێبەکەوە بەدوای مانای ئەم زاراوەیەدا بگەڕێین کە لە مێژووی فکری تازەدا ناوبانگی پەیدا کردووە.

پێویسته ئەوەشمان لەیاد نەچێت کە تیۆریاکەی "هابرماس" تەنها ناوەندە فەلسەفیەکانی لە ئەڵمانیاو فەرەنسا بەخۆیەوە سەرقاڵ نەکردووە، بەڵکو بەشێوەیەکی تایبەتی ناوەندە فەلسەفیەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکاشی بەخۆیەوە خەریک کردووە.

زۆرجار "هابرماس" بانگهێشتی زانکۆکانی ئەمریکا دەکرێت تا بەرگری لە تیۆریاکەی بکات و وەڵامی ئەوانە بداتەوە کە گومان دەکەن یان بە گران تێی دەگەن. دیارترین کەسێك لەوانەی لە ئەمریکا مشتومڕی گەرمی لەگەڵ "هابرماس"دا هەیە فەیلەسوفێکی گرنگە کە لەم چەند ساڵی دوایدا ئەستێرەی بەختی لە درەوشاندنەوەدایەو ناوی "ریچارد رۆرتی"یە. ئەمەو لەگەڵ فەیلەسوفێکی دیکەدا کە هیچی لەو کەمتر نییە ئەویش: "جۆن رۆلس"ە، خاوەنی کتێبێکی بەناوبانگە (دەربارەی دادپەروەردی) و بەم دواییە وەرگێڕدرایە سەر زمانی فەرەنسی و مشتومڕێکی زۆری دروستکرد. کاتێکیش مشتومڕی نێوان "هابرماس" و "ریچارد رورتی" توندبووەوە "رۆڵس" راستەوخۆو بێ هیچ دوودڵییەك داکۆکی لە "هابرماس" کرد. لەبەرئەوەی ئایندەی ئەقڵانیەت لەهەر ئیعتبارێکی شەخسی یان نەتەوەیی گرنگترە. "من ئەفلاتونم خۆش دەوێت. بەڵام حەقیقەتم زیاتر خۆشدەوێت" وەکی "ئەرستۆ" دەڵێت.

**سەرچاوە:**

***هاشم صالح- قراءة في الفكر الاوروبي الحديث- الطبعة الاولى، 1994.***

# تێڕوانین بە ئاراستەی ساڵی 2000

■ گێردا لێرنر

● و. لە ئینگلیزییەوە: لاوك سەلاح

دەتوانین چ جۆرە ئاییندەیەك بۆ ساڵانی پاش 2000 پێشبینی بکەین؟ چۆن بزانین بارودۆخی جیهان چ جۆرێك دەبێت؟ مرۆڤ دەتوانێت بەدوو جۆر وەڵامی ئەم پرسیارە بداتەوە: یان بە رەشبینیەکی تەواوە کە دەڵێت جیهان بەرگەی مانەوە ناگرێت بۆ ئەوەی بگاتە سەدەی بیست و یەك یاخود بە تێڕوانینێکی یۆتۆپیایانەوە بەرەو رووی ئەو پرسیارە بچین. رەنگە ئەم شێوازە چاکترو تەنانەت پراکتیکانەتر بێت لەو دووبارە بوونەوە بێ کۆتاییەی کە سیاسەتمەداران و سەرکردە سوپاییەکان و پیاوانی دەوڵەت دەینوێنن. ئەو دووبارەبوونەوەیەی لە حیکمەت و کلێشە نەگونجاوەکانی سەدەی نۆزدەوە ماونەتەوە، ئێمە دەبێت پەیڕەوی ئەو جۆرە رەفتارە بکەین کە لە خراپترین بارودۆخدا شتی چاك دەدۆزرێت، تاوەکو ئەم کارە ئەنجام دەدەین ئێمە بەندی سستی و نائومێدی و بێدۆستی و هەتیووین. لەم پێودانگە ئاوێتەیەی باشی و خراپییەوە دەخوازم وەڵامی ئەو پرسیارەی سەرەوە بدەمەوە.

### سەدەی هۆلاکۆست

ئێمە بە درێژایی ساڵانی سەدەی بیست لەگەڵ شۆڕشی ئەتۆم و راگەیاندن و زانستی کۆنترۆلکردنی پەیوەندیەکان ژیانمان بەسەربرد، ئەمە وێڕای شۆڕشە سیاسیەکان. جەنگی یەکەمی جیهان کۆتای بە جیهانی ئارامی دەوڵەتە ئیمپریالیەکان و دەسەڵاتیان بەسەر ئیمپراتۆرە کۆلۆنیالەکاندا مێناو دەستەڵاتی فاشیەکان و ئەو رژێمانەی دەبێت کوێرانە گوێڕایەڵی بکرێن دەستی پێکرد.

سەدەی بیست بەتەواوی سەدەی هۆلاکۆست بوو، کارەساتێکی بێ وێنە بوو لە مێژوودا. جەنگە شەڕانگێزەکان، کۆیلەکردنی میللەتە داگیرکراوەکان، سەرکوتکردنی درندانەی ئۆپۆسیسیۆنەکان لەلایەن رژێمە دیکتاتۆرەکانەوە لە مێژووی مرۆڤایەتیدا کارێکی نوێ نییە. ئەوەی ئەم سەدەیە زیاتر بەسەدەیەکی هۆلاکۆست دەناسێنێت بەکارهێنان و بەگەڕخستنی تەواوی تەکنەلۆژیای نوێ و سەرتاپا

سەرچاوەکانی میللەتە شارستانیەکان بوو بۆ دارشتنی پیلان بە مەبەستی کوشتنی بەکۆمەڵ و بازرگانیکردن بە چارەنووسی میللەتانەوەو پەیوەندی بەستراوی کارگە پیشەسازیە مۆدرێنەکان وەك ئای. جەی. فاربێن و هۆشسست بۆ کۆیلەکردنی کرێکار و کامپە روخێنەرەکان و دروستکردنی سابون لە قەڵەوی مرۆڤ و پڕکردنی دۆشەکەکان لە قژی مرۆڤ و تاقیکردنەوە پزیشکیەکانی هەندێ لە رێکخراوەکان لەسەر بەندکراوە زیندووەکان کە لە ناو کامپەکانی مەرگدا پیادەیان دەکرد. لە راستیدا ئەم کارەساتانە لە مێژوودا بێوێنەن. هۆلاکۆست گوزارشتی لە توانای شەیتانی لە ڕادەبەدەری مرۆڤ کردو مەرگی یەزدانی کردە دۆخێکی راستەقینەو هەموو بیروڕایەکی مرۆڤ بە مەبەستی پێشکەوتنی عەقلانیەتێکی رۆشنگەریانە پێشێل کرد.

## فاشیزم، جەنگی ساردو کەلێنی نێوان خواپێداوەکان و هەژاران

لە کاتێکدا جەنگی دووەمی جیهان کۆتایی بەسەرکەوتنە بەرفراوانەکانی فاشیزم هێنا، بۆمبارانکردنی بە کۆمەڵی خەڵکی مەدەنی لەگەڵ خۆی بەهۆی هۆکارە کلاسیکیەکانەوە هێنایە کایەوە کە بەدارمانی هیرۆشیماو ناگاساکی گەیشتە ترۆپك. دوابەدوای ئەمە، چل ساڵ لە جەنگی سارد لە نێوان زلهێزە ئەتۆمیەکان بەردەوام بوو کە ئاکامەکەی بە خولقاندنی باروددۆخی نە دۆڕاو نە براوە، نائومێدی، سەرکەوتنی بیرۆکراسیەتی ناتەواوی دەوڵەتە پێشکەوتوەکان کۆتایی هات، هەروەها فراوانکردنی بەردەوامی کەلێنی نێوان دونیای خواپێداوەکان و هەژاران. ئەمڕۆ ئابوری جیهان زیاتر لە جاران پێکەوە لکێنراوە. کۆمپانیا هەمەلایەنە نەتەوەییەکان کۆنترۆڵی دیمەنی ئابووریان کردووە، لە راستیدا دەستەڵاتیان لە دەستەڵاتی حکومەتەکان تێپەڕ دەکات. لەژێر رۆشنایی ئەم قسانەداو پێیەپێی ئەوەی زانستی تەکنەلۆژی و مەعریفە بوونەتە دوو فاکتەری جیهانی، چەمکی ئاسایشی نەتەوەیی دەبێت سەرلەنوێ پێناسە بکرێتەوە. چیدی دەستەڵاتی سوپایی، تەنانەت لە رادەبەدەر، زامنی کۆنترۆڵی سوپایی و سیاسی ناکات و هێزە ئەتۆمیەکان ناتوانن، لەبەر هەر هۆیەك بێت، خۆیان لە جەنگ هەڵقورتێنن یان تێوەگلێنن بەبێ ئەوەی خۆیان و ئەم کەوکەبە نەخەنە ژێر مەترسی دارمانی تەواوەوە.

## گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی و رەهەندەکانی

گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی ریشەیی کەپێکهاتبێ لە دابەشکردنێکی یەکسانی داهات و دەستکەوتەکانی دونیا لە ناو هەر نەتەوەیەکداو لە نێوان نەتەوەکاندا پێداویستیەکی رەهایە بۆ مانەوەی رەگەزی مرۆڤ. پرسیاری ئەمێستاکە ئەوەیە چۆن مرۆڤ دەتوانێت لە هەلومەرجی ئێستادا گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی بێنێتە دی، بەر لەوەی وەڵامی ئەم پرسیارە بدەمەوە دەبێت رەچاوی هەندێ گیروگرفت بکەین کە پەیوەستن بە کاتی ئێستاوە. ئەگەر گریمان شۆڕشی ئەتۆم سنوورێکی بۆ دەستەڵاتی سوپایی دارشت بێت، ئەوا شۆڕشە تەکنەلۆژیەکانی سەدەی بیست رەچاوکردنی بەکارهێنانی سنووورداری سەرچاوەو داهاتەکانی لە پێشبینیە مەنگەکانی فەیلەسوفەکان و عاشقانی سروشت گواستەوە بۆ ناو ناوەندی گوتاری سیاسی. تاکەی بەرهەم هێنانی مادده بێ بەهاکان بەردەوام بێت کە کاردەکاتە سەر توانای کەمی مانەوەمان، مەترسی روخاندنی ئۆزۆن، دارمانی دارستانەکان بەهۆی مەترسی ترشە بارانەوە، پیسکردنی رووبارو گۆمەکان و دەریالوشەکان و گرفتە پیشەسازیەکان پێداویستی بۆ چارەسەر لەسەر ئاستی جیهان دێننە ئاراوە.

## کاریگەری گەشەسەندنی تەکنەلۆژیا

پەرەسەندن و گەشەسەندنی زانستی تەکنەلۆژیا لە سەدەی بیستدا ئەو توانایەی پێبەخشین زیاتر لە کۆدەکانی رەگەزی مرۆڤ تێبگەین و بگەینە مانگ. ئێستاکە زانیاری تەواومان لەبەردەستایە کە چۆن ژیان بەهۆی ئەندازیاری رەگەزی دروستکراو بخولقێنین و سەفەر بەناو ئەستێرەکاندا بکەین و ناوچەی فراوانتر بۆ نیشتەجێکردن بدۆزینەوە. بەهرەمەندی لە زانست و تەکنەلۆژیادا یارمەتی داین زیاتر سەرپەرشتی تەندروستی پتەوتر بکرێت و نەخۆشی و برینە زگماکیەکان کەمکرێنەوەو تەمەنی مرۆڤ لە رادەی ئاسایی خۆی درێژتر بکرێتەوە بەشێوەیەك کە هەرگیز مێژوو ئەمانەی بەخۆیەوە نەدیووە، هەروەها توانامان بۆ دەست خستنە ناو پرۆسەی ژیان و مەرگ چەندان مەسەلە و تەنگەژەی ئەخلاقی هێنایە گۆڕێ.

شۆڕشە تەکنەلۆژی و پەیوەندیە سەرەکیەکانی ئەم سەدەیە پەیوەندیەکانی نێوان مرۆڤ و کاری گۆڕی. ئەمڕۆ چیدی ئەو سیستمی کارەی کە پێویستی بە کەسێکی پسپۆڕی درێژخایەن هەیە بۆ پێداویستەکانی کۆمەڵ گونجاو نییە؛ تەنانەت، رەنگە، وەك بەرهەمێکی بەرپەرچدانەوە لە قەڵەم بدرێت. ئەگەر هەر ئەندامێکی کۆمەڵ تا تەمەنی ***60*** ساڵ هەفتانە ***40*** سەعات کاربکات ئەوا هەلومەرجی کاری تەواو نابێت کە بەشی هەموو کەسێك بکات. گۆڕانکاریە خێراکان لە پێداویستیەکانی کارامەییدا پێویستی بەهێزی کار هەیە کە زیاتر لەگەڵ پێشکەوتنەکانی تەکنەلۆژیادا بگونجێ نەوەك لەوەی لەگەڵ سیستمی خوێندنماندا. ماوەو درێژی ژیان لەگەڵ خۆتەرخانکردنی کەمتر بۆ کارێکی پاداشتکراو پێویستی بە هێنانەکایەی دەزگای جیاواز هەیە، هەروەها پێویستی بەوەیە کەسەکان خاوەنی کارامەیی جیاوازبن ئەمە ئەوەندەی پەیوەندی بە هەلومەرجی کارەوە هەیە.

## ئاکامی رووداوەکانی سەدەی بیست

ئەو زنجیرە کارەسات و گیروگرفتانەی کە بێ چارەسەر مانەوە لەگەڵ ناکۆکییە ئاشکراکانی سەدەی بیست بەتەواوی رەنگدانەوەی هەرەسی دەزگاکان و بیروڕاکان بوو. ئێمە، بەدرێژایی دەیەکانی رابردوو، توانیمان هەندێ لە ئامانجەکانمان وەدەست بهێنین بەڵام هیچ جۆرە گۆڕانکاریەکی سەرەکیمان لە شێوازی بیرکردنەوەدا پێنەکرا، نموونەی ئەم قسانە، خۆلادانە پراکتیکیەکانی زلهێزە ئەتۆمیەکان بوو بەهۆی شێوازە کلاسیکیەکانی بیرکردنەوە کە دەیانخوازی پێکدادان لە مەسەلەکانی بەرگری کردن و سەروەری نەتەوەیی و ئاسایش و سەپاندنی هێز بەسەر نەتەوەکانی دیکەدا دروست نەبێت. من ئەم بارودۆخەو ئەم لەت لەت بوونەو نەبوونی کاریگەری و ستاندەردی کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی وەك پێشین تەماشا دەکەم بۆ ئەوەی لە ئاییندەدا سیستم بخولقێت.

لەژێر سایەی سیستمی باوکسالاریدا، کە بۆ شارستانیەتی رۆژئاوا لەگەڵ دروستبوونی دەوڵەتە خاوەن شێوازە کۆنەکان لە رۆژهەڵاتی دوور ***3*** هەزار ساڵ پێش زاینی دەستی پێکرد، هەوڵەکان بۆ هێنانەدی پێشکەوتن یاخود گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی بەشێوەیەکی ئاشکرا خۆی لە شەڕی پڕ توندو تیژیدا بینیوەتەوە، تەنانەت هانی ئەوە دەدرا کە هەوڵەکانی ریفۆرم ببنە پرۆسەیەکی خاو بۆ بەگونجاوکردنی دەزگا باڵادەستەکان بەهۆی هەڕەشەو مەترسیەوە یاخود بوونی واقیعێکی سەپێنراوی پڕ توندو تیژیەوە. گۆڕانکاریە شۆڕشگێڕیەکان بۆ میللەتانی سەدەی بیست، بێگومان بەدەر لە بزووتنەوە ئاشتیخوازەکان، جۆرە چەمکێکی سەرەکی بوو کە بەهۆیەوە مەزەنەی پرۆسەی مێژوویی ئەم سەدەیەمان دەکرد. زۆربەمان لەو بڕوایەدا بووین، لەبەرئەوەی هەر ئەوەندەمان لە

مێژوو دەزانی، کە رووخاندن بەهۆی بەکارهێنانی هێز و توندو تیژییەوە تەنها رێگەچارەیە بۆ هێنانەدی گۆڕانکارییەکی کۆمەڵایەتی بەرفراوان. بیرۆکەی حەتمیەتی سیستمی گرەیسد (پلە) ئەوەندە پانتاییەکانی رابردوو و ئێستای داگیرکردبوو کە خەڵکی نەیاندەتوانی، لەبری ئەو سیستمەی کە هەبوو، بیر لە جۆرە ئەلتەرناتیڤێکی دیکە بکەنەوە کە رووخاندن تەنها رێگا نەبێت. سەرکوتکراوەکان بوونە باڵادەست و، بەسەرە، سەرکوتکەرەکانی پێشووتر بوونە سەرکوتکراو.

## نسکۆی رێگەچارەکانی توندوتیژی

من لەم باسەدا دەمەوێت بڵێم رێگەچارەکانی سەدەی نۆزدە بۆ خولقاندنی گۆڕانکارییەکی کۆمەڵایەتی گونجاو نیین. بۆ ئەم رۆژگارە، رووخاندنی حکومەتەکان لە رێگای هێزو توندوتیژییەوە تا دێت کەمتر پراکتیکانەترە، بۆیە ئەو بیروڕا شۆڕشگێڕانەی کە لەسەر بنەمای ئەو تیۆرانە بنیاتنراوە بۆ رووخاندنی حکومەتەکان بە مەبەستی هێنانەدی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی بیروڕایەکی دروست نییە. رووخاندن بەهۆی توندو تیژییەوە ئەو بارودۆخە لەگەڵ خۆی دێنێ کە گروپی باڵادەستی پێشتر دەکاتە پاشگری خۆی، کە لە ئاکامدا دەبێتە هۆی خولقاندنی سیستمی هایراکی لە رژێمێکی شۆڕشگێڕانەدا. هەروەها زەمینە بۆ دروستبوونی دژە خەبات دژی گروپە نوێ سەرکوتکەرەکە خۆش دەکات. توندوتیژی هەر توندوتیژی دەخاتەوە. هەر هەمان بازنەی شێتگیری سەرلەنوێ دەستپێدەکاتەوە. دیکتاتۆرە یەك لەدوای یەکەکانی ئەو وڵاتانەی تازە لەدەست دەوڵەتە کۆلۆنیالەکان رزگاریان بووە، جەنگی ناوخۆی ئێرلەندا، ململانێی عەرەب و ئیسرائیل بەدرێژایی سەدەی بیست نموونەی ئەو راستیەن کە دەڵێ پیادەکردنی توندوتیژی بە مەبەستی هێنانەکایەی گۆڕانکاری کۆمەڵایەتی بەرەو ئەوەمان دەبات توندوتیژی قبووڵ بکەین وەك سیمایەکی سەرەکی و حەتمی ئەو گۆڕانکارییە.

سەرهەڵدانی لینینیزم و ستالینیزم هاوکات لەگەڵ شێوەکانی رووخاندن و توندوتیژی و جەنگە ناوخۆیەکان ئەوەیان سەلماند کە کەمایەتی حوکمی زۆرینە دەکات بەناوی زۆرینەکانەوە و دەبنە پارتی سەرکردەی پرۆلیتاریا. دەشێت ئەمە ئۆتۆکراتیەتێکی روخێنەرانەو شێتگیرانە بێت وەك هەر توێژێکی دیکە. هیچ کام لەو سیستەمە سۆشیالیستانەی سەدەی بیست، تەنانەت ئەوانەی تا ئێستا ماونەتەوە، نەیانتوانیوە مۆدێلێکی نوێ و بڕواپێکراو لە شێوەکانی بەڕێوەبردن و کارگێڕی بێنەکایەوە. سەرکوتکردنی ئۆپۆسیسیۆن و کەمکردنەوە یاخود نەهێشتنی سەربەستی قسەکردن و سەربەستی رۆژنامەگەری سیمای سەرەکی هەریەکێك لەو رژێمانە بووە. تا ئەم ساتەوەختە، لە سەرتاپای جیهاندا سۆشیالیستی مرۆڤخوازانە بەزێنراوە یان دەستی کردووە بە دۆڕاندنی هێزو دەستەڵاتی بەر لەوەی لەدایك ببێت. لە قۆناغی پاش هیرۆشیما، توێژە دەستەڵاتدارەکان، تەنانەت لە وڵاتە بچکۆلەکانیشدا دەستیان دایە وەدەستهێنانی چەکە خۆکوژەکان بەمەبەستی بەربەست دانان لە بەرپابوونی هەر جەنگێکی ناوخۆ لەلایەن هەر گروپێکی شۆڕشگێڕانەوە کە خوازیاری دەستەڵات بێت.

زلهێزە ئەتۆمیەکان ناتوانن خۆیان لە جەنگە گەورەکان، بۆ وەدەستهێنانی هێز، بگلێنن و پشتگیری لە گروپێکی شۆڕشگێڕی بکەن یاخود بیانەوێت بەرگری لە بەرژەوەندیە ئابووری و ناوچەییە سەرەکیەکان بگرن بە بێ ئەوەی خۆیان و کەوکەبەکەمان نەخەنە مەترسیەوە. لە چل ساڵی

رابردوودا، ئەو زلهێزە ئەتۆمیانە کە نوێنەرایەتی چەندان سیستمی کۆمەلایەتی و فەلسەفەی جیاوازیان دەکرد وەك دڕندەیەکی ئیفلیج رووبەڕووی یەك راوەستان و نەیانتوانی جوولە بکەن لەبەر ئەو چەکە سوپەرانەی کە هەیان بوو. بەرامبەر ئەم باردۆخە کە هیچ جۆرە گۆڕانکارییەکی بەخۆوە نەدی. ئێمە رووبەڕووی سیناریۆیەکی وەك ئەوەی لە ڤێتنام روویدا یان کێشەی موشەکەکانی کوبا دەستەوەستان ماینەوە. ئەو هێزە ئەتۆمیانە هەموو شتێکیان کرد لە توانایاندا بوو بۆ پاراستن و بەرگریکردن لە بەرژەوەندیە ئایدیۆلۆژی و ناوچەییەکان.

جەنگەکانی ئەفگانستان و ڤێتنام رادەی ئەم سیناریۆیەیان دەرخست. لە هەندێ هەلومەرجی تایبەتیدا و لە هەندێ ناوچەدا کە بایەخی کەمتری بۆ بەرژەوەندیە ناوچەییەکانی زلهێزە ئەتۆمیەکان هەبوو رژێمە شۆڕشگێڕەکان دەتوانن هەمان دەستکەوت بەدیبهێنن بەلام ئەکم کارە باجی خۆی هەیە تا رادەی خۆدۆڕاندن. پێویستی بۆ دەستانە خەباتێکی چەکدار دژی زلهێزێك یان نۆکەرێکی، بەرەو سەرهەلدانی رژێمێکی سوپایی و ناوەندی بەکێشمان دەکات. ئەو جۆرە رژێمانە بۆ ئەوەی بمێننەوە دەبێت زۆر بیرۆکراسی و سەرکوتکەری ئۆپۆسیسیۆنەکانی خۆیان بن لەناو ولاتەکەی خۆیاندا. ئەو جۆرە رژێمانە بەهیچ جۆرێك بوار بە ئۆپۆسیسیۆن نادەن سەر بترووکێنن.

هەولێك دەکەن کە گروپە شۆڕشگێڕەکان دەیدەن. هەندێك گروپی دیکە کە توانیویانە تا رادەیەك و بۆ ماوەیەکی کورت بەرەنگاری ئەو ولاتە سەرکوتکەرانە ببنەوە گروپە تیرۆریستەکان بوون. سەرهەلدانی تیرۆریزم لەسەر ئاستێکی فراوان لە دوا سالەکانی سەدەی بیستدا جۆرە وەلامدانەوەیەك بوو بۆ نەبوونی پارسەنگی هێز لە نێوان بالادەست و ژێر دەستدا و بزربوونی رێگەچارەی دیموکراسی لەلایەن بالادەستەکانەوە و بوونی نائومێدی لەلایەن گروپە ژێردەستەکانەوە لە پاش ئەوەی بێ توانایی خۆیانیان بۆ دەرکەوت لە گۆڕینی هەلومەرجەکان و هێنانەکایەی ریفۆرمێك بۆ دابینکردنی داواکاریەکانیان. ئەو گروپانە بۆیان دەرکەوت دەبێت، ناچارانە، وەك راستیەك بەو ئاکامانە رازیبن. بەلام هەر وەك چۆن توندوتیژی بەکۆمەل بووە هۆی شێواندنی خەلك و بزوتنەوەکان، پەیڕەوکردنی شێوازەکانی تیرۆریزمیش هەمان ئەنجامی لێکەوتەوە، تەنانەت ئەگەر ئەو گریمانە پەسەند بکەین، هەرچەندە هیچ جۆرە رووداوێکی مێژوویی لەم جۆرە بەر لە ئێستا نەبووە، ئەگەر گروپە تیرۆریستەکان رژێمێکی چەسپاو و دامەزراو بڕوخێنن لە دواجاردا ئەوانیش دەبنە سەرکوتکەری ئەو رژێمە روخێنراوە. ئەزموون و مێژووی بالی راستی زایۆنیزم و هەندێ لە رژێمەکانی ئەفەریقیا ئەم ئامانجانە دەسەلمێنن.

## تیرۆریزم و شێوازی کاردانەوەی

گەشەسەندنی تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو بۆ چاودێری کردن و بۆ بۆسەدان و کۆنترۆلکردنی بیروڕای سەرتاپا جەماوەر دەستەلاتێکی زیاتری بەتوێژە بالادەستەکاندا کە هەرگیز بەخۆیانەوە نەدیبوو. ئەم جۆرە دەستەلاتانە هەولی مانەوەی درێژ خایەن دەدەن و گومان، تارادەیەکی زۆر، لەهەر

## توێژی بالادست و هۆکارە تەکنەلۆژیەکان

ئەو رووداوەی کە بە بەردەوامی چەندبارە دەبێتەوە دامەزراندنی دیکتاتۆریەتێکی فاشیستانەیە کە ئەمیش وەك وەلامدانەوەی هەڕەشە تیرۆریستە هەنووکەیەکان یان پێشبینکراوەکان کاری کردووە. تەنانەت کە هۆکارە تەکنەلۆژیە پێشکەوتوەکان کەوتە بەردەستی توێژە بالادەستەکان، چەندان

کاری بەد ئەنجام و پڕ کارەسات دەرهەق بەو کەسانە کرا کە دەیانخواست گۆڕانێکـی کۆمەڵایـەتی ڕیشـەیی بێننەدی. ئەو کارانە ئامادەیی ئەو توێژانەی سـەلماند بۆ ڕووخاندنی گروپە شۆڕشگێڕەکان بەشـێوەیەك کە هـەرگیز مێـژوو ئـەو جـۆرە ڕەفتـارە دڕندانانـەو ئـەو تواناییـەی بـۆ تـیرۆرکردن، تەنانـەت بـۆ تـیرۆری جەستەیی، بـەخۆوە نـەدیووە. لـە سـەدەی شـانزەدا چەندان گروپ باڵی چـەپی ڕیفۆرمیسـتە پرۆتستەکان بـە تـەواوی سڕانەوە. "دوا ڕێگاچـارەی هتلـر" وەك نموونەیەکی دیکەی تۆقێنـەری سـەدەی بیسـت ڤیـت دەبێتـەوە. هتلر تـەنیا نەبـەزێنرا لەبەرئـەوەی 12 ملیۆن کەسی، لە ناویاندا 6 ملیۆن جوولەکە، لەناوبرد و تاڕادەیـەك هـەر هـەموو قەرەجـەکانی ئـەورووپای قڕکرد، بەڵکو دۆڕاندنەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پلانـە فرەخوازیـە ناوچەییانـەی کـە هەڕەشـەی کـردە سـەر بـەرژەوەندیی نەتـەوەیی و ئـابووریی زلهێزەکـان. بەداخـەوە، هـەردەم ئەگـەرێکی پێشـبینکراوە کـاتێك توێـژە باڵادەسـتەکان ئۆپۆسیسـیۆنەکانی خۆیـان لەناودەبەن هیـچ جـۆرە پاراستنێك یـان پشـتگیریەك لەلایـەن دەوڵـەتانی دیکـەوە بـۆ ئۆپۆسیسـیۆنەکان بەدیناکرێت.

## گۆڕانکـاری کۆمەڵایـەتی لـە دەوڵەتـە پێشکەوتووەکاندا

بۆ ئەوەی خۆمان لە ڕوودانی کارەساتی ئـەتۆمی بپارێزین دەبێـت گۆڕانکاریـەکی کۆمەڵایـەتی ڕیشـەیی لە ناو دەوڵەتـە خـاوەن ئەتۆمـەکاندا ڕووبدات، لـەناو ئـەو دەوڵەتانـەی کـەتازەترین پێشـکەوتنی تەکنەلۆژیای بەخۆوە دیوە، وە ئەگـەر بێتـو پـەیامی ئەو گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیە ئاراستەی واقیع نەکرێت، بێگومـان، ڕەچـاو نـاکرێت. بـۆ نموونـە هـەندێ لـە پارتەکان وەك پارتی کۆمۆنیستی ئیتالی و حکومـەتی شیللی لـەژێر سـایەی ئـەلیندادا توانیـان تەکتیکـە ڕیفۆرمەکان و شۆڕشگێڕەکان ئاوێتەی یەکبکەن. ئەم جۆرە پارت و حکومەتانە تا ڕادەیەکی زۆر توانیویانە خۆیـان لـە بەرەنگاربوونـەوەی توندانـە بپارێزن هـەر بۆیـە بـە ڕێگـەچارەی دیموکراسیانەوە هاتنـە سـەر حوکم. لە هەردوو حاڵەتەکـەدا وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکا ڕۆڵـی بینـی لـە گەشەسـەندنی پرۆسـەی دیموکراسـی بەتایبـەتی لـە شیلی دا کـە ئاکامەکـەی ڕوخاندنی ڕژێم بـوو. کـارێکی سـتەمە، مەزەنـەی ڕوودانـی گۆڕانکاریەکی کۆمەڵایـەتی بکـەین بـە بـێ بوونی پشتگیری دەوڵەتانی دیکە. ئەمە سیناریۆیەکی هیـوا بەخشـە بـۆ هێنانەکایـەی ئـەو گۆڕانکاریانـە، ئەوەندەی پەیوەستە بـە گۆڕانکـاری کۆمەڵایـەتی لـە دەوڵەتـە زلهێزەکـاندا هێشـتا نادیـارە چـۆن دەخولقێنرێن.

## پیادەکردنی داد لە دابەشکردنی داهاتدا

ئەوەی گرنگە ئەوەیە، گۆڕانکاریـەك بێتەکایـەوە کـە پێکهاتبێ لـە پیـادەکردنی داد و دابەشـکردنێکی یەکسانی داهات و سەرچاوەکان لەنێوان نەتەوەکاندا، هەر ئەم ئامانجە دەبێتە زامنکردنی مانەوەی مـرۆڤ. ئـەو جـۆرە گۆڕانکاریـە دەخوازێـت کۆتـایی بـە ئایدیۆلۆژیـە هایراریکیـەکان بێنێـت، وەك سیاسـەتە ڕەگەزپەرسـتیەکان و سێکسـیزم (مەبەسـت پیادەکردنی یەکسـانیە لـە نێـوان خـەڵکدا، وەرگێڕ)، بەبێ فەناکردنی ئـەم چەمکانـە سیسـتمی هـایراریکی کۆتاییان پێنایەت. کارێکی بێهودەیە، گۆڕانکـاری لـە ئـابووریی و پەیوەندیـە کۆمەڵایەتیـەکاندا ڕووبـدەن بـەڵام هێشـتا سێکسیزم مابێت و نایەکسانی لـەناو خـێزان و هۆشمـەندی پیـاو و ئـافرەتدا مـابێت. سیسـتمی هـایراریکی هـەر دەمێنێتـەوە ئەگـەر ئـەو پیاوانـەی پابـەندی هێنانەکایـەی گۆڕانکاریـەکی کۆمەڵایەتین، کە سوودیان لە سیستمی کۆنترۆڵکردنی باوکسالاری وەرگرتووە، نەتوانن خواستەکانیان بێنە

بەر بەبێ مۆبلیزەکردن و سازدانی تواناو بەهرەی شاراوەی ئافرەت.

## ڕۆڵی ئافرەت لە گۆڕانکاری کۆمەڵایەتیدا

من لەو بڕوایەدام کە بزووتنەوەکانی ئافرەتان و پرۆگرامەکانیان ڕێگەچارەو فەلسەفەی گونجاون و لە بەردەستی پیاو و ئافرەتدایە بۆ هێنانەکایەی ئەو گۆڕانکاریانە. لەلایەکی دیکەوە، ئامانجی بزاڤی ئافرەتان ناپێکێنرێت ئەگەر شۆڕشێکی ڕۆشنبیری بەرپا نەبێت و هەموو دامودەزگاکانی کۆمەڵ، بەتایبەتی دەزگای خێزان، بەشداری تیانەکات. بۆ ئەوەی گۆڕانکاریە کۆمەڵایەتیەکان بەهای خۆیان هەبێت پێویستە بەر لەوەخت هەمەلایەنەی هێزو بازووی کۆمەڵ مەزەنە بکرێت. تەنیا بزاڤەکانی ئافرەتان دەتوانن ئەو گۆڕانکاریە کاریگەرە بەرپابکەن. پەیوەندی ئافرەت لەگەڵ ئەو گروپانەی کۆنترۆڵیان دەکەن جیاوازترە وەك لە گروپەکانی دیکە. لەبەرئەوەی ئافرەتان دابەشبوونەتە سەر چینە جیاوازەکانی کۆمەڵ ناتوانن وەك چینێکی باڵادەست مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت، بەڵکو ئەمانە دەکرێنە پاشکۆی گروپەکانی دیکە. ئافرەت لە هەموو شوێنێکە، ناشکێنرێن، قەلاچۆناکرێن. لەلایەکی دیکەشەوە لەبەرئەوەی نزیکیو تێکەڵیان لەگەڵ ئەندامانی ئەو گروپانە هەیە کە کۆنترۆڵیان دەکەن وەك باوك، برا، مێرد، کوڕ، ناتوانن توندوتیژی دژیان بەکاربهێنن بۆ ئەوەی بەسەربەستی بگەن. ئافرەت پشت ئەستورە بە هەندێ تاکتیك و فشاری کۆمەڵایەتی بۆ ئەوەی کاربکەنە سەر ئەو گروپانە. هەر بۆیە بزاڤی ئافرەتان ڕوخێنەر نییە یان مەبەستی ڕوخاندن نییە بەڵکو مەبەستی هێنانەکایەی گۆڕانە. لەم بارەیەوە هەندێ نموونەی مێژوویی هەن. هەرچەندە ململانێکانی ناو مەسیحیەت و ریفۆرمەکانی پرۆتستانتەکان توندوتیژیەکی زۆری بەخۆوە دی و بووە هۆی ڕشتنی خوێنێکی بێشومار بەڵام، بێگومان، ئەمە بەهۆی هۆکارە دینییەکانەوە بووە کە هەوڵدەدرا بەربەست لە بەردەم چەسپاندنی بیروڕا نوێکان دابنێن، خۆشبەختانە، لەم کارەدا سەرکەوتوو نەبوون. سەد ساڵ لە جەنگێکی خوێناوی لە ئەوروپادا لە ساڵی *1648* کۆتایی پێهات بەوەی کاسۆلیك، کە گۆڕانێکی بەرچاوی بەخۆوەدی، لەگەڵ کلێسەکانی پرۆتستانت، کە دواجار بڕواو پرۆگرامی دوورکەوتەوە لەوانەی دامەزرێنەرەکانی بانگەشەیان بۆ کرد، پێکەوە بژین. لەم سەردەمەدا کە جەنگەکان نەتەوە سەرەکیەکانیش دەگرێتەوە، تەنیا هیوا لە چنگی بزاڤە کۆمەڵایەتیەکاندایە بۆ داڕشتنی تیۆرو پراکتیزەکردنی گۆڕانکاریەکان. بیرکردنەوەیەکی ناواقیعانەیە ئەگەر وا مەزەنە بکەین ئافرەت بەتەنیا دەتوانێت گۆڕان بەسەر سیستمی باوکسالاریدا بێنێت و شێوازو سیستمێکی دیکەی جیاواز بێنێتەدی، بەڵکو، پێویستە زنجیرەیەك پەیمان و ڕێکەوتننامە لەنێوان ئەو ڕێکخراوانەدا هەبێت کە هەمان ئامانجیان هەیە وەك ڕێکخراوی ئاشتیخوازی جیهانی یان ڕێکخراوەکانی ژینگە یان ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیەکانی دیکە کە خوازیاری ئازادی زیاترن بۆ مرۆڤ. ئەم ڕێکخراوانە بەوە ناسراون کە کارەکانیان لە چینی کۆمەڵایەتی و نەتەوە تێپەڕ دەکەن و گاڵتە بە دەزگا سیاسیەکان دەکەن و دوژمنایەتی عەسکەرتاریەت و ناشنالیزم و پیادەنەکردنی داد و نەبوونی سەروەری دەکەن، ئەم هێزانە دەتوانن پەیمان لە نێوان خۆیاندا ببەستن.

ڕێکەوتنە، فیمینیزم لە پراکتیکدا بەو شێوازەی کە خاوەنێتی و خولقێنەری هەست و کارە مۆدێلێکی چاك لە بەشدارکردنی سیاسی تاکەکەسی دەبەخشێ. ئەم ڕێبازە ناخوازێ دەسەڵاتی ئافرەت بەسەر خەڵکانی دیکەدا بەهۆی ئەم جۆرە ڕێکەوتنانەوە

بسەپێنرێ. بەڵکو دەخوازێ کە دەستەڵات لەسەر خەڵکی لابرێت و بەشداریکردنی هەموو لایەك پتەوکرێت لە پێناوی هێنانەکایەی بەرژەوەندی هاوبەشدا. تۆوەکان بۆ چاندنی ئاییندەیەکی ڕۆشن لە چنگماندایە، مەترسیترین هەڕەشە لەسەر مانەوەی ڕەگەزی مرۆڤ ئەو هەستەیە کە نێرینەیەك فریو دەدات شانازی بە نێرینەیی خۆیەوە بکات کە ئەمەش زۆرجار لە پیادەکردنی دەسەڵاتدا ڕەنگدەداتەوە. ئەم هەستە لە هەموو حکومەتەکانی ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، بەبێ ئەوەی لە ڕەوت و بونیادی خۆی بگات پەرش و بڵاوە. ئەم هەستە بۆ وڵاتە پێگەیشتوەکان و تازە پێگەیشتووەکان وەك یەك خەتەرناکە. تەنانەت ئەگەر لە هێزی سوپایی یان لە سەرکردایەتییەکی هاوبەشدا یان لە یەکێتی بازرگانیدا بێت، لەبەرئەوەی مەبەستیان فراوانکردنی قازانجە تا بەرزترین ئاست بتوانن. لە وەهمی دەستەڵاتدا، کە لە چنگیاندایە، دەژین. ئەم جۆرە کەسانە بە ئاسانی و بە خێرایی ناتوانن، ئەوە ئەگەر بیانەوێ، خۆیان لەگەڵ ئەو پرۆسێسە بگونجێنن یان لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریانەی کە مانەوەی مرۆڤ زامن دەکەن (قسەکانی من، لە ڕاستیدا، هەندێك لەو ئافرەتانەش دەگرێتەوە کە ئێستاکە وەك پیاو بیردەکەنەوەو ڕەفتار دەکەن. تاوەکو هەموو دەزگاکانی کۆمەڵ بە یەکسانی لەنێوان پیاو و ئافرەت دانەمەزرێت و سەرکردایەتی ئەو دەزگایانە بە هاوبەشی بەڕێوە نەچێت شێوەی سەرکردایەتیکردنی ئافرەت و ئەلتەرناتیڤی بە نادیاری دەمێنێتەوە). هەرچەندە ئێستاکە خەسڵەت و چەندایەتی ئەو سەرکردایەتیە لە هەردوو ڕەگەزەکە تاڕادەیەك ئاشکرا بووە زۆر لەو شێوازانە دەچێت کە ئافرەت بەدرێژایی سەدەکانی ڕابردوو خەباتی بۆ کردووە. هەستکردن بە ئازاری خەڵکانی دیکە، تواناو ئیرادە بۆ وەدووکەوتن، مێوری و ئارامی، ئاشتیخواز، شێوازی بەرەنگاربوونەوەی دەستەڵات، توانا بۆ چاودێریکردن و پاراستنی زەوی و سەرچاوەکانی هەروەها یارمەتیدانی ئەو مرۆڤانەی پێویستیان بە یارمەتی هەیە، ئەمانە سیفەتە سەرەکیەکانی ئەو خەباتەیە. ئەم چەندایەتیەو ئەم جۆرە سەرکردانە لەناوماندا دەژین، ئەوەی پێویستە ئەوەیە بزانین چۆن ڕێکدەخرێن و دەنرخێنرێن و وەك نموونە بەسەردەکرێنەوە. لە ئەزموونی بزووتنەوە ئاشتیخوازەکانەوە دەتوانین نموونە هەڵهێنجێنین کە چۆن ئەلتەرناتیڤ بۆ جەنگ دەخولقێنرێت و ڕێگەچارەی ئاشتیخوازانە بۆ ململانێکان دەدۆزرێتەوە. لە ئەزموونی بزووتنەوەکانی ژینگەوە دەزانین چۆن سەرچاوەو داهاتەکان بە فیڕۆ نەدرێن و وردتر بیربکەینەوە، هەروەها لە ئەزموونی خەڵکانی سەر بە نەتەوە جیاوازەکانەوە فێردەبین چۆن ڕێز لە جیاوازی و هەمەجۆریی و فرەلایەنی بگرین و زیاتر دەوڵەمەندی مرۆڤ بنرخێنین. ئایا دەکرێت لە ماوەیەکی کورتدا، بەر لە ڕوودانی کارەسات، فێری ئەم هەموو کارە ببین. ئەوەندە دەزانم کە دەبێت دەستبەجێ بە بڕواوە کاری بۆ بکەین.

## دوا دەرئەنجام

دواجار ئەمە دەمگەیەنێتە ئەو پرسیارە کە دەڵێت ئایا تاکەکەس دەتوانێت چ جۆرە ستراتیژییەك پیادە بکات بە ئاراستەی مەزەنەکردنی داهاتوو. من لێرەدا دەتوانم باسی خۆم بکەم وەك پسپۆڕێکی فیمینیزم کە خوازیاری لێکدانەوەیەکی ئاشکراو ڕوون و تەواوی ڕابردوو و ئێستام بە شێوەیەك کە ڕاستگۆیی و پراکتیزەکردن دابین بکات. من لەو بڕوایەدام کە تا ئێستا هەموو سیستەمە ئایدیۆلۆژیەکان و ئایینیەکان بە مەزەنەیەکی بێ مەعریفی باوکسالاریەوە خولقێنراوون. لە هەوڵی خۆمدا بۆ ڕزگارکردنی خودی خۆم، دەخوازم تەنیا دوای یەك جۆر شێواز نەکەوم و واقیعانە بڕوانم و

بیربکەمەوە. هەوڵی تێگەیشتن لە تیۆرەکان دەدەم و ناوەندێتی ئافرەت و پیاو بە درێژایی مێژوو دەنرخێنم و هەوڵی تاقیکردنەوەی تیۆرەکان دەدەم تا بزانم تا چ مەودایەك پیادە دەکرێن، ئەگەر پیادەکران، هەوڵدەدەم بزانم راستن، ئەگەر نەکران ئەوا راستنین.
من لە ژیانی تایبەتی خۆمدا تا ئەتوانم هەوڵ دەدەم سادە بژیم و بە وریایی سەرچاوەو داهاتەکان بپارێزم، رێزی سروشت بگرم. هەوڵ دەدەم ببمە بەشێك لە پرۆسەی بیناکردنی کۆمەڵ لە هەموو بوارە جیاوازەکانی ژیانماندا و هەردەم لە نقووم بوونی خود خۆم بپارێزم و رەچاوی بەرژەوەندیەکانی خەڵکانی دیکە بەر لە هی خۆم بکەم. ئایا لە هەر یەکێك لەم بوارانەدا سەرکەوتن بەدەست دەهێنم، نازانم، بەڵام دەبێت بەردەوامبم. وەك کەسێك کە لە چەندان کارەسات قووتار بووە هەروا دەمێنمەوە کە لە سەرەتادا باسمکرد، پڕ گومان و هەندێ جار نائومێد و رەشبین. وەك هەر مەخلوقێکی دیکە پێویستم بە جیهانبینینێك و عەقڵێکی یۆتۆپیانە هەیە کە تیایدا ئافرەت و پیاو مێشکیان لە بیروڕای باوکسالاری رزگار کردبێت، پێبەپێی ئەمەش خۆیان لە دەستەڵاتی هایراریکی رزگار کردبێت بەرەو دونیایەك هەنگاو بنێت کە بە راستی مرۆڤخوازە.

***خاتوو گێردا لێرنەر*** *نووسەرو مێژوونووسی ناوداری ئەمەریکییە کە بە رەچەڵەك جوولەکەیە. لە ساڵانی سی و چلەکاندا لە کامپی نازیەکان هەڵاتووەو لە ئەمەریکا نیشتەجێ بووە. لەسەرەتادا وەك وەرگێر کاری کردووە. ئێستاکە لە زانکۆی وزکۆنسین- مادیسۆن مامۆستای مێژووە.*

**سەرچاوە:**

*لە کتێبی "بۆ مێژوو گرنگە" ساڵی **1977**، لاپەڕە 112-103*

# ژن و نووسین

■ محەمەد نورەدین ئەفایە
● و. لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

"پەیوەندیی ژن بە حەقیقەتەوە چییە؟ لە بنەچەوە هیچ شتێك ئەوەندەی حەقیقەت نامۆ، ناکۆك و دوژمن نییە بەلای ژنەوە، چونکە هونەری مەزنی ئەو لە درۆدا خۆی دەبینێتەوەو بالآترین مەسەلەشی لە خۆدەرخستن و جوانیدا بەدەردەکەوێت (نیچە).

**1-سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان ژن و نووسین:**

مەبەستی ئەم توێژینەوەیە هەوڵدانێکە بۆ دارشتنی پەیوەندیی ژن و نووسین بە شێوازو دەربڕینە جۆراوجۆرەکانی، بەو پێیەی ئەم پەیوەندییە کورت ناکرێتەوە بۆ ئامادەبوونی ژن، وەك توخمێکی چالاك، لە بواری نووسیندا بە شێوەی دەستنووسی مەتریالیستانە. بەلکو گەرەکیەتی قسە لەسەر ژن بکات بەهەموو جومگەگیرییەکانیەوە لەگەڵ مەسەلەی جەستە، حەقیقەت، ئارەزوو و نێردا. کرداری نووسینیش، وەك درێژکراوەیەکی هەبوونخواز، لە کاغەزی نووسراودا بەدەردەکەوێت، هەروەها دەشێ لەسەر جەستەی مێیینەیەکی تەواو شاعیرانە و فریودەر خۆی بنەخشێنێ.

ئەوەی بڕیاردەرانە بەلامانەوە گرنگە، راگەیاندنی دڵتەنگی و ناڕەزاییە بەرامبەر بەو کۆمەڵە دارشتنە زمانەوانیانەی دەستیان بەوە کردوە بە جۆرێك لە سەفسەتەی ئایدیۆلۆژیی، ساتێك دەمامککراو و ساتێك روو هەڵماڵراو، ژن وەك گرەوی پیرۆزی خۆیان بخەنەگەڕ. بۆ ئەمەش لەوەوە هەنگاو هەڵدێنین کە مەسەلەی ژن، جا لە پەیوەندیدا بێت لەگەڵ پیاو یا دیموکراتیەت یان نووسین یاخود خودی خۆی، زۆرجار خۆی لەدەست جەمسەرگیریی ئایدیۆلۆژی قوتار دەکات، چونکە ئەوەندە ئەفسوون و راکێشان و توندوتیژی بەدەستەوەیە کە وا لە گوتاری ئایدیۆلۆژیی، بەتایبەتی شێوە ساویلکەکەی، دەکات لەوە بەدبەختتر و هەژارتر بێت کە بتوانێ تاوتوێی مەسەلەی ژن بکات.

ئەم وتارە– ئەگەرچی قسەکردن یان وتار زۆرجار بەهانای ویستەوە نایەن– مەبەستیەتی بەپێی توانا لە دەربڕینی ئەو ئیشکالیەتە نزیکبێتەوە کە زۆرجار ویستی دەستنیشانکردن لە بەردەمیدا واقوڕماو رادەوەستێ. چۆن کرداری نووسین دەتوانێ پەیوەندیی نێوان ژن و ئەنجامی کردار دیارییکات؟ چۆن ژن لە نووسیندا، کە بوارێکی مۆنۆپۆلکراوی پیاوە، ئامادە یان پیوار (غائب) دەبێت؟ ئایا پیواری ناوی ژن یان دەگمەنبوونی، وەك نووسەر لە ئاڵوگۆڕکردنی هێمایی (رمزی) باودا، مانای ئەوەیە نووسین دژوار یاخود نامۆیە بە پانتایی جەستەی ژن؟ سروشتی ئەو گرژییە چییە کە دەشێ واوی پەیوەندیی نێوان ژن و نووسین هێمای بۆ بکات؟

بەو جۆرە دەڵێین، ئێمە کۆششدەکەین بۆ هەژاندنی کۆمەڵە بەڵگەنەویستێك کە بە درێژایی ڕۆژگار و مێژوو لە هۆش و ڕۆحەکاندا چەسپیوون یاخود لەنێو هەندێ کەسدا، بەهۆی چەند دارێژراوێکی گوتاربێژانەوە، کە قسە لە باڵادەستیی نێرسالاری و ئازادبوونی مەزن لە دەستی نابەرابەری و دەسەمۆکردن دەکەن، بەڕێوەن بچەسپێن. ئەم هەژاندنە لەو باوەڕەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ کە پێیوایە دەشێ هەموو زمانێك لە ئاست خستنەوەی دژەکانیدا نەوەستێ، هەموو گوتارێکیش -جا بابەتەکەی ئازادی بێت یان باڵادەستی– دەست لە بەرهەمهێنانی دژەکانی خۆی هەڵنەگرێ. بۆیە پێمان وایە گوتاری ئازادیی ژن، جا لە ژنەوە دەرچووبێ یاخود پیاو، دەبێ بە وریایی تەواوەوە مامەڵەی لەگەڵ بکرێ، ئەمە بێ دەستهەڵگرتن بۆ چرکەساتێکیش لە پشتگیری کردنی تەواوەتی ئازادیی ژن.

بە رادەی قسەکردنمان لەسەر ژن، پیاو لە باسەکەدا ئامادە دەبێ، ساتێك لە ڕێڕەوی ململانێ و جەنگی ڕۆژانەداو ساتێکیش لە ڕێڕەوی کارلێککردن و پێکەوە ژیاندا. ئەمە لەگەڵ دانانمان بەوەدا کە "شێتی"یەکی پیاوانەی تایبەتی لەو گۆڕێیەو لە گوتەیەدا پوختە دەکرێتەوە کە دەڵێ پیاو هەمیشە لە ژن بەهێزترە.

شتێکی نائاگایانە لە پیاودا هەیە، ڕێگە لەوە دەگرێ دان بەهیچ توانایەکدا بنرێ کە دەشێ ژن هەیبێت، جگە لە توانای خیانەت و درۆکردن. بە واتایەکی دیکە، ژن توانای نووسین یان داهێنانی نییە، ئەو تەنیا وەچە دەخاتەوەو منداڵی دەبێت، کاری داهێنان و نووسینیش بوارێکە تایبەت بە پیاو، چونکە مێژوو فێری ئەوەی دەکات ژن بێتوانایە لە ئاست داهێنان و نوێکردنەوەو نۆژینەوەدا، ئەمەش واقیعێکی ژیاریی (حضاری) پایەدارە لە دەستووری پیاودا.

بەڵام دەسەڵاتی پیاو بە شێوەیەکی شاراوەی ریسواکارانە نەبێت خۆی دەرنابڕێ، چونکە ئەو چووکەی (قضیب) جڵەوی پیاو دەکات و هەمیشە شوێنەوارێکی پیرۆزی پێ بەخشراوە، پیاوی کردۆتە نموونەی ڕەهای هەمو مێزو توانایەك، بەجۆرێك پیاو هەمیشە کاریکردوە بۆ دەربڕینی ئەو مێزو توانایە بەشێوەی مەتریالیستانە لە زۆر باردا یان بە شێوەی وێنەی هێمایی لە ڕێگەی یاسادانان و ئەدەب و نووسنەوە.

بەو جۆرە ژن لە بواری نووسین رەتدەکرێتەوە؛ چونکە مێژووی نێرسالاری (نکوری) بڕوای لاوازی و بێتوانایی لە بواری داهێناندا تێدا دەچێنێ. ئەم بەڵگەنەویستەش هەموو دەق، بەڵگەنامە و هێماکان دوپاتیدەکەنەوە. لێرەوە ژن دەستدەکا ت بە دوورکەوتنەوە لە بواری داهێنان و نووسین، چونکە هەست بە ترسێکی بێوێنە دەکات بەرامبەر بەم دنیا تەلیسماوییەی لەلایەن پیاوەوە سازدراوەو سیستەمێك پێکدێنێ کە بە پێی ستراتیژێکی نێرسالاری ئاشکرا دانراوەو لە چوارچێوە دراوە.

بەشداریی ژنیش لەم سیستەمەدا، لە ڕێگەی کرداری نووسینەوە، ڕوونادات پاش پێشکەشکردنی خۆبەختکردنی بێسنوور نەبێت، بە جۆرێک ژن پێشوەخت دەزانێ ئەو خۆبەختکردنانە، وەک مردن یان نەخۆشی یاخود بێنوێژبوون، چارەنووسی ئەو پێکدێنن.

کاتێکیش سیستەمی هێمایی نێرسالاری ڕێگە بە ژن دەدات نووسینی خۆی ڕاگەیەنێ، ئەوا لە ڕێزلێنانێکی تایبەتی بۆ بەهای نووسین و بەرهەمهێنانی ژنەوە هەنگاو هەڵناهێنێ، بەڵکو زیاتر کۆششکردنیەتی بۆ تێوەگلانی نووسینەکە و دەرخستنی وەک نووسینێکی لاواز، کە ناتوانێ بە ئاستی نووسینی پیاودا ڕابگات. هەروەها کارکردنیەتی بۆ ئەوەی بە ژنی ڕابگەیەنێ ناتەواوەو ئەگەر توانیشی بنووسێ، ئەوا ناتوانێ داهێنان بەرهەمبێنێ، بەو پێیە سیستەمی نێرسالاری تەڵەیەکی بێسنورە بۆ شیان و ئاسانکردنی بە کەمزانینی داهێنانی ژن.

نێر لە ڕێگەی پەرژینکردنی ئازادیی ژنەوە تێدەکۆشێ بۆ ئازادی و بۆ سەپاندنی نووسینی خۆی وەک نووسینێکی بلیمەتانەی ڕەها، کە نووسینی لاوازی ژن مەحاڵە هاوشانی بێت، مەسەلەکە گرێدراوە بە ململانێی هێزەکان و مەسەلەی ئازادییەوە، چونکە ئارەزووی بەدەستهێنانی ئازادیی تەواوەتی پێویستی بە ڕەتکردنەوەی ئازادیی ئەوانی دی هەیە، بەو پێیەی ئەوانی دی ئەو کۆسپانە پێکدێنن کە ئارەزوی ئازادیی گشتگر ڕووبەڕوویان دەبێتەوە. بەو جۆرە بەلای نێرەوە: "دووپاتکردنەوەی جیاوازیی جەوهەریی خۆی لەگەڵ ژن، مانای دووپاتکردنەوەی هوشیارییە لە نۆخی بەهێزییەکی نیمچە خوایانەدا، مانای دووپاتکردنەوەیەتی بۆ ناوەڕۆک"[7].

کاتێک نووسینی ژن لەنێو پێوەندگی نێرسالاریدا خۆی دەسەپێنێ، تەنانەت ئەگەر وەک پەراوێزیش بێت، ئەوا پیاو ئاتۆرەی ژن نەبوون یان نێرەموکبوونی بەسەردا دادەبڕێ، چونکە ژن لێرەدا بە پێری ئەو تایبەتمەندییە مێینانەوە ناچێت کە گرنگن بۆی و چییەتی و توخمە دامەزرێنەرەکانی ناوەڕۆکی خۆی گومکردوە. واتە بۆتە بوونەوەرێک کە هیچ ڕوخسارێکی نییە، لەبەرئەوەی تەنیا بە دیمەن ژنە.

بەو جۆرە ژن لە هەموو ئاستەکاندا، لە هەبوون، بەها، سەربەستی و داهێنانیدا، خۆی بە گەمارۆدراو دەبینێتەوەو ئەوە بەدیدەکات کە دەسەڵاتی نێر بەردەوام خۆی بۆ ماتداوە، تەنانەت ئەگەر بارودۆخ و عەقڵیەتەکانیش گۆڕان و ژن توانی لە ڕێگەی نووسینەوە ئارەزووی یەکسانبوون بە پیاو دەربڕێت.

کەواتە ژن بوونەوەرێکی هەستییە (حسسی)، بەندی شتەکانی جەستەی خۆیەتی و ناتوانێ هەڵکشێ بۆ ئاستێکی پێشکەوتووتر لە ڕوی فیکرییەوە، چونکە ئەم ئاستە تایبەتە بە پیاو. بەوەش پیاو دوالیتی میتافیزیکانەی بەختەوەری و عەقڵ دەچەسپێنێ و خۆراکی دەداتێ و جەستەی ژنیش دەبێتە ئەو شتەی نێگەتیڤ و زیرونە و عەقڵی پیاویش ئەو توخمەی پۆزەتیڤ و چالاکە. شایانی باسە، ئەو خەونە بەجۆشوخرۆشەش کە هەموو پیاوێک بە نەمرییەوە گرێدەدات، لێرەوە سەرچاوە هەڵدەگرێت. پیاوی نووسەر لە ڕێگەی درێژبوونەوەی ناوییەوە بە درێژایی ڕۆژگار، پیاوی سیاسی بەهۆی بەخشینی سیما تایبەتیەکانی خۆیەوە سەبارەت بە مێژوو بە قۆناغەکەی خۆی، پیاوی ئاسایش بەهۆی سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی ناوی خۆیەوە لە کوڕەکەیدا.

هەموو ئەم پرۆسانە پشت ئەستوور بە دوورخستنەوەو ملکەچکردن و پەراوێزکردنی ژن ڕوودەدەن. ژن تەنیا بە فرمانێکی لاوەکیی هەبوون هەڵدەستێ کە لە لە دایکبوون و سەرلەنوێ

بەرهەمهێنانەوەی جۆردا خۆی دەبینێتەوەو پێویست ناکات ئەوە رەتکات و بەرەو جۆرە لەدایکبوونێکی تر، بۆ نموونە نووسین، بڕوات. چونکە پیاو دەزانێ زکی ژن بە پیتەو رێگەی پێنادات بە پیتی لە زکی خۆیەوە بۆعەقڵی خۆی بگوێزرێتەوە. پێویستە ژن تەنیا وەك دایك بمێنێتەوەو پیاو خۆیشی بەدەستهێنانی دایکایەتی شتەکانی دیکە مسۆگەر دەکات، لەوانە نووسین. بەو جۆرە "بێگومان ژن منداڵی دەبێت، بەڵام دامێنەریش بە دەوری خۆی خولقاندنێکی هێمایی دەبەخشێتە دنیا.. چونکە لە دایکبوون مەزنترین سەرچڵی مرۆڤانەیە، کە بەلای ژنەوە ئۆرگانیکیە و بەلای پیاوەوە هێمایی"[(2)].

ئایا ناشێ وای دابنێین کە کرداری دامێنان ئەنجامی داواکاریەکی گرنگە بۆ یەکالاکردنەوەی ناکۆکییەکی دیاریکراو کە پێکهاتووە یاخود پێکدێت، تەنانەت ئەگەر ئەو یەکالاکردنەوەیە پێویستی بە زەبرو زەنگێکی دیاریکراویش هەبێت؟

تۆرجار ژن نووسین بەکاردەهێنێ بۆ یەکالاکردنەوەی ناکۆکیەکانی خۆی لەگەڵ پیاو یان دایك یاخود کۆمەڵگەی نێرسالاریدا بەشێوەیەکی گشی، ئەو لە پێناو کۆنترۆلکردنی پیاودا نانووسێ، وەك پیاو بەهۆی یاسا و ئەدەبەوە ئەنجامیدەدات. چونکە کاتێك ئەو دەیەوێت بەسەر پیاودا زاڵبێت، ئەوا جۆرە نووسینێکی تر بەکاردەهێنێ کە پیاو ناتوانێ بە ئاسانی هێماکانی هەڵوەشێنێتەوە. ئەو مەبەستی لە نووسین و ئاخاوتن، تەقاندنەوەی هەموو درزو پێچ و پەناکانی جەستەی خۆیەتی، وێڕای ئەوە نووسینەکەی تەواو دوورە لە ئارەزووی بەجۆشوخرۆشی خۆی بۆ بەدەستهێنانی ئەو زمانەی بۆ دارشتنی ئارەزووی نووسین گرنگە، ئەمەش وەك هەوڵدانێك بۆ رەتدانەوەی ئەو سەرپێدانەواندنە هەبوونخوازە گشتییەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتی و ئەخلاقی و دەروونییە نێرسالارەکان لەگەڵیدا پێڕەریدەکەن.

کەواتە نووسین تەقاندنەوەی چەپێنراو (مکبوت) و شاراوەیە. ژنیش، لە رێگەی شێوازە جۆراوجۆرەکانی نووسینی جەستەیی و هێماییەوە، ئەو چەپێنراوە بانگهێشتدەکات کە بە درێژایی رۆژگار کەڵەکەبووە، بۆ ئەوەی لە دیالۆگ - ململانێی خۆیدا لەگەڵ پیاو رایگەیەنێ، بەتایبەتی کاتێك ئەو نووسینە لە بزوتنەوە فیمینیستیەکان (*Feministe*) دەئاڵێ.

وێڕای ئەوە، دەتوانین بپرسین: تا چ رادەیەك گوتاری ئازادیخوازانەی ژنان توانیویەتی روخسارەکانی خۆی دابڕێژێ و ئەڵتەرناتیڤەکانی خۆی دەستنیشان بکات؟ ئایا زمان و گوتار دەتوانن لە رووی ستراتیژییەوە بە مانای ئەو پرۆسە هەمەلایەن و بنەڕەتیەی دارشتنەوە بێن؟

## 2-گوتاری ئازادی یاخود ئازادیی گوتار:

خەلیل ئەحمەد خەلیل دەڵێ: "وشەی امرأة (ژن) لە زماندا لە کرداری "مرأ" واتە تام یان چێژ داتاشراوە، لێرەدا رووبەڕووی پەیوەندیی ژن بەخواردنەوە دەبینەوە. دەوترێ مرأ فلان مرءا، واتە لە رووی روخسارو ئاخاوتنەوە وەك ژنی لێهاتووە. هەروەها "المرأة" لە وشەی تریشەوە هەڵدەهێنجرێ و دەوترێ "نساء و نسوة" و بە مێینەی پیاویش دەناسرێ، "نساء"یش واتە "مارە براو"، لێرەدا رووبەڕووی پەیوەندی ژن بە سێکسەوە دەبینەوە، ئەگەر تاوتوێی بنەڕەتی "النساء" بکەین، ئەوا بۆمان دەردەکەوێ کە لە کرداری "نسا، لینسو" وەرگیراوە کە مانای دەستهەڵگرتن لە کار دێت، وەك ئەوەی ژن مانای بێکاری بێت. هەروەها "المرأة" گرێدەدرێتەوە بە چەند کردارێکی سەرەکییەوە، یەکەمیان کرداری "حرم" واتە "یاساخکردن". "الحرم" واتە "ژنان بۆ

یەك پیاو". دەشوترێ "حرمة الرجل" واتە ژن و خێزانەکەی، "الحریم"یش واتە (النساء) ئەوەی حەرامکراوەو دەستی بۆ نابردرێ. وشەی "حرامی"یش لەم کردارەوە وەرگیراوەو واتەی بکەری حەرامە. دووەمین کرداریش کرداری "جمع"ە کە جامع "مزگەوت" و مێینەکەی (جامعة)ی لێوە هەڵهێنجراوە، هەروەها وشەی "الجماع" واتە جووتبوون، سێیەمین کرداریش "زوج"یە واتە پەیمان بەستن و سازکردن و وەرگرتن و تێکەڵاوبوون، لەویشەوە "الزوج" واتە مێردو "الزوجة" واتە ژنی مێرددار هاتووە"[3].

لەم دەقەوە ئەوە هەڵدەهێنجین، ئەو زمانەی دەشێ وەك ئامراز بەکاربهێنین بۆ دارشتنی گوتارێکی ئازادیخوازانە، پێشوەخت دەستنیشانی شوێنەواری ژن و فرمانەکانی لەنێو کۆمەڵگەدا دەکات. واتە بەر لە دانانی ئەو یاسایانەی بە مانای پیاوەوە دێن بۆ دەستەمۆکردن و پەرژینکردنی ئامادەیی و ریتمی ژن وەك بوونەوەرێك، زمان بە شێوەیەکی سەرەتایی ئەوەی دەخاتە بەردەست کە مەبەستیەتی. کەواتە ژن ئامادەبوونی بوونەوەرێکە، رۆڵی کورتکراوەتەوە بۆ تێرکردنی سێکسی و دەستەپاچەیی و رێکخستنی کاروبارەکانی دامەزراو، بۆ بەردەوامیی جۆرو ئەو سیستەمە گشتییەی لەلایەن پیاوەوە حوکمکراوە.

وێڕای ئەوە، ناودارترین نووسینە عەرەبیەکانی تایبەتن بە مەسەلەی ژن و دەیانەوێ رەهەندی ئازادیخوازانە بدەنە خۆیان، جا پیاوان پێیانهەڵسابن یاخود ژنان. ئەوە لە یاددەکەن کە زمان بە مانایانەوە نایەت بۆ قسەکردن لەسەر "ئازادی". زمان هەردەم ملکەچی نیەتەکانی گوتار نییە، گوتاریش بە دەوری خۆی دەشێ دژی خۆی هەڵگەڕێتەوە بێئەوەی مرۆڤ بتوانێ دەرکی پێبکات، چونکە تیایدا ژیوار بە مێژوو، سیاسەت و دەروونناسی دەگات. لەبەرئەوەی زمان تەنیا ئامرازی دەربڕین یان ئامێری پێکگەیشتن و ئاڵوگۆڕکردنی هەست و بیرەکان نییە، بەڵکو هایدگەر وتەنی ئارامگەو پشتوپەنای بوونەوەرەو بوونەوەر نائاگایانە بەکاریدەهێنێ بۆ دارشتنی ناسنامەی خۆی و راگەیاندنی خودی خۆی بۆ ئەو و ئەوانی دی. لەبەرئەوە پێدەچێ مامەڵەکردن لەگەڵ زمان، لەکاتی دارشتنی گوتارێکی ئازادیخوازانەدا، پێویستی بە جۆرێك لە وەئاگاهێنانەوەی پرسیارکارانە بەرامبەر واتاکانی ئەو هێماو بزووتنەوانە هەبێ کە جەستە دەیاندرکێنێ و زمان دەریاندەبڕێ.

ئەمە جگە لەوەی زمانی عەرەبی توانای بێوێنەی لەخۆگرتووە بۆ دەربڕینی گوتاربێژی. گوتاربێژی ریتمێکی ئاخاوتنئامێزە تێدا پشت بە وشەی وا دەبەسترێ کە کاریگەری ئەفسووناوی و بەهێزیان لەسەر رۆحی خەڵك هەیە، ئەمەش بە مەبەستی بزواندنی خرۆشانەکان و شتە خەفەکراوەکانیانە، زیاتر لەوەی بە مەبەستی گفتوگۆکردن بێت لەگەڵ عەقڵیان. بۆیە دەشێ گوتاری ئازادیی ژن تێکەڵ بە گوتاربێژی ببێت، بەو جۆرەش مەسەلەی حەقیقەت لەنێو ئەتمۆسفێری خرۆشاندن و پەرچەکرداردا ونبێت.

نامانەوێ بگەڕێینەوە بۆ بیریارەکانی سەردەمی "رۆشنگەری" بۆ دیاریکردنی روخساری هەڵوێستەکانیان بەرامبەر بە ژن، بەڵام دەشێ بە وریاییەوە بڵێین مەسەلەی ژن، جا لەکاتی وێناکردنی ئیسلامییەوە بێ لە رۆژگارە جۆراوجۆرەکانیدا، یاخود لای بیریارەکانی رۆشنگەری بێ بە سەلەفی و لیبرالیەکانیانەوە، یاخود لای بزووتنەوەی پێشکەوتنخوازی بێ بە ئاقارە جۆربەجۆرەکانیەوە، تەنیا یەکێك بوو لە پەراوێزەکانی ئەو بەرنامانەی پرۆژە ریفۆرمیست یان شۆڕشگێڕییەکان لەخۆیان دەگرت. بەو پێیەی ئەوە پیاو بووە هەمیشە شوێن و

شوێنەواری ژنی لە پرۆژەی داهاتووخوازدا دیاریکردوە، ئەویشە هەندێ جار ناچارە خۆی لە مەسەلەی ژن هەڵقورتێنێ، ئەگەرچی ئەو تا سەر مۆخ خولیای پێویستیی ملکەچکردن و بەکاربردنی ژنە.

کەواتە ژن ئاکۆکی پیاوە، ئەگەرچی وشەی "ئاکۆك" بەهێز خۆیشی بنوێنێ. سیاسەت یاخود ئەو پرۆژە سیاسیانەی لە روی پێناسەوە ئامانجیانە هێزەکان دەستەمۆ بکەن و ئامادەیانبکەن بۆ کارپێکردن و رێزگرتنی پێوانەکانی سیاسەتەکەی خۆی، دەبنە هۆی وەژێرەوەنانی چەندین توێژی کۆمەڵایەتی دیاریکراو، یەکێك لەوانە ژنە، لێرەوە پێداچوونەوە بە سروشتی پەیوەندیی نێوان ژن و شێوازی قسەکردن لەسەر ژن، یاخود نێوان ژن و گوتاری سیاسی کارێکی پێویستە.

لەبەر ئەوەی گوتاری سیاسیی سنوور بۆ دانراو، جا سروشتی نیەتی هەرچۆنێك بێت، بریەتی لە بایەخپێدانی نێرسالاریی بەهێز، ئەوا گوتاری عەرەبی، جا ئەو گوتارە کۆڵەکەکانی لە کەلەپووری عەرەبی- ئیسلامییەوە بەدەستدێنێ یاخود ئەوەی لە پانتایی رۆشنبیریی خۆرئاواییەوە هەڵیدەێنجێ، لەو پەرژینە لاهوتیە خۆی رزگار نەکردووە کە گەمارۆی هەموو قسەکردنێك لەسەر ژن دەدات. چونکە جەستەی ژن لە گوتاری ئیسلامی راستبڕوادا بەری دەسەڵاتی نێرسالاریی پیرۆزەو ئەو بوارە زیندووە پێکدێنێ کە نووسینی نێرسالاری لێوە هەڵدەقوڵێت. بەو پێیەی جەستەی ژن خاوەنی ئازادیی سێکسی خۆی نییە، ملکەچی ئەو یاسا و سیستەم و دامەزراوانەیە کە خەسڵەت و پێوانەکانی خۆیان لە رەهاو لاهوتەوە بەدەستدێنن. بەو جۆرە جەستەیی و پیرۆزیی لە بنەمای عەرەبی ئیسلامیدا زۆر تێکهەڵکێشن. ئەم پیرۆزییەش جەستەی ژن دەکاتە پانتاییەك بۆ دەستوورسازی و نووسین لە پێناو کۆنترۆلکردنی داهێنان و خوڵقاندنی ژندا.

ئەگەر مرۆڤ ئەو کەسە بێت کە خوا خوڵقاندویەتی، وەك ئیماندارێك داوای لێبکرێت ملکەچی خوا بێت و بیپەرستێ، ئەوا ژن بەپێی پێداویستی پیاو، بۆ تێرکردنی ئارەزووە سێکسیەکانی ئەو، شوێنەواری دیاریدەکرێت، بەو جۆرە "نموونەی جوانیی مێینە ملکەچی، بێدەنگی و نەبزووتنە. واتە رەقهەڵاتن و نێگەتیڤبوون کە خاسیەتی پڕوپووچ و تەسك مەودان و ژن زۆر لەوە دورە بەوانە جیاکارەبکرێت. لە واقیعدا ئەم سێ خەسڵەتەی جوانیی مێینە سێ خەسڵەتەکەی ئیماندارە بەرامبەر خوای خۆی، چونکە ئیماندار پێویستە ژیانی خۆی تەرخانکات بۆ ملکەچکردن بۆ خوای خۆی و پەرستنی و رێزگرتنی ویستی"[4].

بیری رۆشنگەریش، کە زەمینەی بۆ گوتاری لیبرالیی خۆشکرد، ئەگەرچی لەسەر بناغەی رەخنە دامەزرابوو و لە هەموو بوارو ئاستەکاندا کاریپێدەکرد، وێڕای رەخنەگرتنی لەو نووسینە ئەدەبیەی لە سەدەی هەڤدەهەمدا وێنەیەکی تایبەتی سەبارەت بە ژن بەرهەمهێنابوو، بەڵام زۆر گۆڕانی بەسەر مەسەلەی مامەڵەکردن لەگەڵ ژندا نەهێناو ملکەچیی ژن بۆ ئاسمان و لاهوتی مەسیحی هێنایە خوارەوەو گۆڕیی بۆ ملکەچیی بۆ سروشت.

"راسین" (*Racine*) ناونیشانی ژنانەی بەخشییە زۆربەی شانۆگەرییە تراژیدییەکانی خۆی و ئەوەی دوپاتکردەوە کە ئەو کەسایەتیەی گۆیەند دەخوڵقێنێ و بەرپرسیاریی تراژیدییەکانی مرۆڤ، لە زۆربەی کاتدا، دەکەوێتە ئەستۆی ژن. چونکە ژن بەشێوەیەکی هەبوونخوازانە بێ ناوەڕۆکەو ئامادەبوونی تەنیا لاوەکیانەیە و لە وەچە خستنەوەو سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەدا چڕدەبێتەوە. بەو جۆرە نووسینی ئەدەبی لە سەدەی حەڤدەهەمدا بە وێناکردنی لاهوتی بۆ مرۆڤ و ژن پەرژینکرابوو.

ئەو رەخنە بنەڕەتیەی بیری ڕۆشنگەری لە لاهوتی مەسیحی و کلێسا و پەیوەندییە کۆمەلایەتیەکانی گرت، لە وێناکردنیدا بۆ ژن، بنەڕەتی نەبوو. "ڕۆسۆ" سەبارەت بە پەیوەندیی ژن و پیاو دەڵێت: "یەکێك دەبێ چوست و بەهێز بێت، ئەوی دیش نێگەتیڤ و لاواز: بە پێویست یەکێك خواست و توانای هەیەو ئەوی دیکەش بە بەرگرییەکی کەم قایلە، بەپێی ئەم پرنسیپە باوە، ژن بەشێوەیەکی تایبەتی بۆ ئەوە هەیە کە سەرنجی پیاو رابکێشێ.. لێرەدا مەسەلەکە پەیوەندی بە یاسای خۆشەویستییەوە نییە.. بەڵکو گرێدراوی یاسای سروشتە، کە پێش خودی خۆشەویستی دەکەوێت"(5).

بەو جۆرە دەردەکەوێت کە گوتاری عەرەبی، جا سەلەفی بێت یاخود لیبرالی، بەندی ئەو مامەڵەکردنە لاهوتیەیە لەگەڵ ژندا کە پێیوایە ژن بونەوەرێکە لە ڕووی هەبوونی مرۆڤانەوە بە پلەی دووەم دێت و توخمێکە سروشت هەڵیبژاردوە بۆ تەنیا هەڵسان بە ئەرکی سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوە.

ئایا نوێ لە ڕوانگەیەکی پێشکەوتنخوازانەوە، جا چوارچێوەی مەرجعیەتی هەرچییەك بێت، هەڵساوە بە دارشتنی ستراتیژییەتێکی ئازادیخوازانە بۆ ژن یاخود زمانی گوتارەکەی گرێدراوی لێکدانەوەی سیاسی و ئایدیۆلۆژیی تەسك بووە؟

داڕشتنی پێشکەوتنخوازانە دەڵێت: دەربڕینی مەسەلەی ژن پێویستە لە ڕێڕەوی چوارچێوەی مێژوویی خۆیدا بێت، بەو پێیەی ئەم مەسەلەیە بەرهاتی کەڵەکەبوونی ململانێی چینایەتیە بە درێژایی مێژوو، بەری دابەشکردنی کاری گشتییە لە کۆمەڵدا -لەوانەش کاری سێکسی- ئەنجامی سەرهەڵدانی خاوەندارێتی تایبەتی ئامرازەکانی بەرهەمهێنانە. دووپاتکردنەوەی ڕۆڵی پیاویش لە کۆمەڵگەدا و لەسەر حسابی شوێنەواری ژن ئەنجامی هەموو ئەوانەیە.



راسین

ئەم دەربڕینە، لە ڕوانگەیەکی مێژووییەوە، دەربڕینێکی بڕیاردەرانەیە بۆ چارەسەرکردنی مەسەلەکە بەشێوەیەکی زانستی، چونکە پێشکەوتن و شۆڕش پێویستیان بە بەشدارییەکی خەباتکارانەی ژن هەیە، هەتاکو لە واقیعی پاشکەوتویی و چەوساندنەوە، نەزانی و ئەو کەمارۆدانە هەمەلایە.. رزگاری بێت کە تێیدا ژیاوەو هەنا ئێستاش .. ژێر قورساییدا دەناڵێنێ.

کەواتە، مامەڵەکردن لەگەڵ ژن، پێویستە لە ڕوانگەیەکی خەباتکارانەوە چارەسەر بکرێ، مەبەست ڕوانگەیەکە ئامانجیەتی ئەو بارودۆخە گشتییە بگۆڕێ کە چەوساندنەوەی ژنی لە لایەن پیاوەوە بەرهەمهێناوە. پێویستە ژن بەشێوەیەکی هاوجووت، دژی کۆیلەیەتی بۆ پیاو لەناو ماڵدا و بۆ بەشداریکردن لە خەباتی گۆڕانکاریخوازی گشتی لەناو کۆمەڵگەدا، تێبکۆشێت. بەو جۆرە پرۆسەی ئازادکردن،

پرۆسەیەکی هەمەلایەنە، خۆی دەگەیەنێتە ئابووری، سیاسی و سێکسی. هەروەها ئازادکردن پێویستە هەموو توێژە چەوساوەکانی کۆمەڵگە: ژن و پیاو، بگرێتەوە. ئینجا پێویستە نەکەوێتە هەڵەی جیاکردنەوەی مەسەلەی ژن و پیاوەوە، چونکە بەشداریکردنی ژنی عەرەب، وەك بەشداریکردنی پیاوی "ماوری"ی، بنچینەییە ڕووەو ئاسۆی گۆڕانکاریی ئازادیخوازانەو سۆسیالیستانەی کۆمەڵگە. هەموو ئەوانەش بێ بەدەستهێنانی مافە دیموکراتیە هەمەلایەنەکان مەیسەرنابن، لەبەرئەوەی پێواری ئەو مافانە کۆسپێکی راستەقینەیە لەبەردەم ویستی ڕێکخستنی جەماوەرییدا، کە ژن و پیاو بۆ لای خۆی رادەکێشێ.

ئەمە ئەو هێڵە گشتیانەیە کە داڕشتنی پێشکەوتنخوازانە بۆ ئازادکردنی ژن جیاکارەدەکات، بەڵام ئایا بەکردەوە داڕشتنی گوتارێکی ئازادیخوازانە بۆ ژن، لە ڕوانگەیەکی پێشکەوتنخوازانەوە، ئەنجامدراوە یاخود مەسەلەکە هێشتا ڕوینەداوە؟

دەشێ هەموو پیاوان لەسەر داواکاریی یەکسانیی ئابووریی، لە ڕووی ئاستی کرێ هەردوو توخمەکەوە، ڕێککەون، بەڵام ئایا هەموو پیاوان، ئەوانەشیان لەگەڵدا بێت کە کار بۆ نووسینی گوتارێکی پێشکەوتنخوازانە دەکەن، لەو گرێی باڵادەستبوون بەسەر ژندا ڕزگاریان بووە، کە لە نائاگایی قوڵیاندا نیشتەجێیە؟

ئامانەوێ هەڵوەستە لە ئاست زۆربەی ئەو پرسیارانەدا بکەین، بەڵکو ئەوەی کۆشش بۆ دووپاتکردنەوەی دەکەین ئەوەیە، کە گوتار -هەموو گوتارەکان- ئەگەر بەردەوام کار بۆ ئەوە نەکات بنچینەکانی خۆی و شێوازی بیرکردنەوەی خۆی بگۆڕێ و هەمیشە لەخۆی نەپرسێتەوە، ئەوا دووچاری دووبارەکردنەوەیەك دەبێت، کە جگە لە گەمارۆدانی بزووتنەوەی خودی گوتارەکە شتێکی تری لێ ناکەوێتەوە، چونکە کارکردن لەسەر ئاستی نووسین و بیرکردنەوە، بە پێویست کارێکە ئامانجی گۆڕینی شێوازی ئەو بیرکرنەوەیەی پێشووە کە کارمانپێکردوە، ئەگینا خودی گوتار وەك توخمی چەوساندنەوە دەمێنێتەوە، شتێك دەڵێت کە لە هەمان کاتدا دژەکەی دادەمەزرێنێ.

لەبەرئەوە، لە واقیعدا گوتاری ئازادی پێویستە لەسەری بەردەوام لە دیالۆگدا بێت لەگەڵ ئازادیی خۆیداو لە ڕێگەی کارپێکردنی شێوازێکی ژیانەوە، کە لە خودەوە دەستپێدەکات و وردەوردە بەرەو ئەوی دی درێژ دەبێتەوە، خۆ لە گوتارەکەی خۆی ڕزگار بکات.

### 3-جەستەی نووسەر:

لە سەرەتاوە تاکو ئێستا باس لە نووسین دەکەین و هێمای بۆ دەکەین، بەڵام لە ئاست دەستنیشانکردنیدا نەوەستاوین، تەنیا لەو هێماکردنەدا نەبێ کە بەهۆیەوە ئەوە دەردەکەوێ نووسین تەقینەوەی شتە چەپێنراوەکانی جەستەیە. شایانی باسە، نووسینەکان کردارێکی فرە درێژبوونەوەو فرە چەمانەوەن کە ژیواری، ڕۆشنبیری، کۆمەڵایەتی، ئایدیۆلۆژی و دەروونی چڕدەکەنەوە، بەڵام ئەو فرەییە تا هەر رادەیەك بن، ئەوا ڕووبەری جەستەی نووسەر تێپەڕناکات، جا مەبەستە راگەیەنراو یا شاراوەکانی ئەو جەستەیە هەرچییەك بن.

کەواتە دەشێ لە دووتوێی وشەکاندا، لە چەمینەوەکان و بۆشاییەکانیاندا، لەو شەپۆلانەدا کە "حەقیقەت"ی ئەوەی نووسراوە دیاریدەکەن، بۆ نووسین بگەڕێین. چونکە مرۆڤ، "دولۆز و گواتاری" وتەنی، وەك "ئامێرێکی ئارەزوومەند"، ئەوە لە یاددەکات کە ئارەزووەکانی و ئەوەی جەستەی دوای

هێنانەدییان دەکات، لەو وشە سادە یان کەمانەدا چڕدەبێتەوە کە دەیاندرکێنێ یان دەیاننووسێ.

نووسین دابڕانە لەوی دی و خۆ فڕێدانە باوەشی ئەوی دییەکی جیاوازە بەهۆی وشەکانەوە. چونکە دەقی نووسراو درێژبوونەوەیەکی هەبوونخوازی خودی نووسەرەو چڕکردنەوەی ئەو شتانەی دیکەیە کە رەتیاندەکات. بۆیە باس لە جومگەگیرییانە دەکەین کە لە دیاریکردن یاخێن و تایبەتن بە نووسین، جەستە، دەسەڵات و ژن.

ئاخاوتنەکەمان بەوە دەستپێدەکەین کە ژن نووسینی خۆی بە شێوەیەکی تەواو جیاواز لە شێوەکانی نووسینی پیاو دادەڕێژێ، جا مەسەلەکە سەبارەت بە دەستنووس بێت یاخود شێوەکانی تری نووسین کە ژن لە پەیوەندیی لەگەڵ جەستەی خۆیدا دەست لە کارپێکردنیان هەڵناگرێ، ژن، بەو پێیەی بوونەوەرێکە لە رووی پێکهاتن و جەستەوە جیاوازە لەگەڵ پیاو و لە کۆمەڵگەیەکی پیاوسالاردا خۆی دەبینێتەوە، بەردەوام کار بۆ ئەوە دەکات جەستەی خۆی بەشێوەیەکی جیاواز بخاتەڕوو، بۆ ئەوەی سەرنجڕاکێشێ، تەفرەدان بخاتەوەو پەیوەندیی لەگەڵ ئەوی دیدا دامەزرێنێ. ئەو وێنەیەی ژن سەبارەت بەخودی خۆی هەیەتی شوێنەوارێکی گەورەتر لە جەستەی راستەقینەو واقیعی خۆی داگیردەکات. ئەو دەمامکێك دەبەخشێتە دنیا بۆ ئەوەی مەودایەکی (مسافە) دیاریکراو بۆ جەستە بڕەخسێنێ، ئەو دەرخستنی ئەو وێنەیەی سەبارەت بە جەستەی خۆی هەیەتی بە گرنگتر دەزانێ لە جەستەی هەستپێکراوی خۆی.

ژن بەو شێوازانەی شاردنەوە، کە دەیانبەخشێتە جەستە، راستەوخۆ لەسەر جەستەی خۆی دەنووسێ. ئەو بایەخێکی تایبەتی دەدات بە کونەکانی جەستەی خۆی: چاوودەم، ئەو نیگارکێشە و نیگارەکەشی چڕکردنەوەی ئارەزووی خۆیەتی. پیاویش هەستیارە بەرامبەر بەو هێمایانە.

لێرەدا مەسەلەکە دەربارەی رەوایەتی ئارایشتکردن نییە لای ژن، چونکە مەسەلەکە ئەوە رەتدەکات، بەو پێیەی خۆجوانکردنی ژن بەهۆی جەستەوە ئاهەنگێکی تایبەتیە ریتمێك و نەخشەکێشانێکی جیاواز لەو وێناکردنە (تصور) ساویلکەیە دەخولقێنێ کە پیاو یان تەنانەت ژن سەبارەت بە مەسەلەی رازاندنەوە هەیەتی.

حەزێکی نەگۆڕ لای ژن هەیە، لە منداڵییەوە تا هەرزەکاری و پیری، تەنانەت ئەو کاتەش کە جەستەی لە سەردەمی پیریدا دەپووکێتەوە، ئەویش، حەزی تەفرەدانە. ئەو ژنەی تەفرەنادات، لە بارێکی سڕینەوەی هەبوونخوازدا دەژی و جەستەی مردووە، جا چۆن دەشێ بژێنرێتەوە؟ بە شاردنەوە یان بە نەخشەکێشان لە سەری، واتە پێبەخشینی دەمامکێکی دیاریکراو.

ژن بەهۆی نیگارکێشی جوانکارانەوە رووی راستەقینەی خۆی دەپۆشێت. بەو جۆرە ژن مردن لە جەستەیەکی مردوو رەتدەکاتەوەو روو و جەستەیەکی دیکە بۆ پیاو دەخاتە روو کە دەشێ لە دوانەنجامدا ددانی پێدا بنێت. ئەم ددان پێدانانەی پیاویش زۆرجار تەنیا لەنێو هەستێکی زاڵی بێبڕواییدا دەبێ بەرامبەر بە "حەقیقەت"ی هێماکانی جەستەی ژن. ئەم بێبڕواییەش پیاو هاندەدات بۆ داڕشتنی پرسیارکردنەوەی بێپەڕو لکاندنی بێسنوور، پشتنەستوور بەو واقیعی کەموکورییەی بەردەوام دەیناسێ. دواییش وێناکردنەکانی پیاو لە بازنەی سێنتەری چووکی خۆی *Phallique* دەچنە دەرەوە، بۆئەوەی بتوانێ ماناکانیان دەستنیشانکات. "مەبەستمان لە چووکسێنتەری *Phallocratique* هێماکردنە بۆ پیاوێکی ساختە، ئاشکراو دەمامککراو، ئەو پیاوەی مەندێ واتا دەداتە خۆی، کە لەو خەساندنە خەیاڵییەوە سەرهەڵدەدەن کە ناتوانێ دەستبەرداریان بێت"[6].

ژن دووچاری ڕەتکردنەوەیەکی هەبوونخوازانەی تایبەتی بووە، کاتێکیش بوونی ڕەتکراوەی خۆی لە ڕێگەی هێماو نووسینەوە دەردەبڕێ، ئەوا نووسینێکی بنەڕەتیانە بەرهەمدێنێ. وەك ئاشکرایە نووسینی ڕەتکردنەوە، دوورخستنەوە، یاساخکردن و زیندانیکردن توندڕەوترین و گرژترین جۆری نووسینە. کاتێکیش ئاخاوتن بەلای ژنەوە -تەنانەت بەلای پیاویشەوە- دەبێتە کارێکی بێسوود، یان کاتێك پێکگەیشتن بەهۆی ئاخاوتنەوە پیوار دەبێت، ئەوا نووسین دەبێتە بوارێك کە ئەو پیوارەی پێوە دیار دەبێ یان شێوازێك بۆ پرسیارکردنەوە سەبارەت بە بنەڕتبوونی ئارەزوو، ئەو نووسین و شێوازەش لە هەڵبژاردنی پانتایی و ئامرازەکانی تۆمارکردنی ئەم نووسینەدا بەدەردەکەوێ، واتە هەڵبژاردنی واتایەکی بنەڕەتی کە تەبایە لەگەڵ سروشتی ئارەزووەکەدا.

ئەم نووسینانە ئەو بایەخپێدانە هەمەجۆرانە تێدەپەڕێنن، کە زۆرجار جەستەی نووسەر ددانیان پێدانانێ، لەوانە خواستی ئیستاتیکی، یان ئارەزوو بۆ ئەوەی بەرهەمی نووسراو شایانی خوێندنەوە یا گوێلێگرتن یاخود ناودار یا خۆشەویست بێت. دەشێ لێرەدا خەمێکی نەرجسی بۆ خۆپیشاندان و بەناوبانگبوون و لە دواییشدا وارێکی زۆر بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات خۆیان ماندابێ.

کەواتە کرداری نووسین ڕووەو کوێ دەردەپەڕێت؟ نووسین یان کرانەوەی زمانی نائاگاییە یاخود ملکەچییە بۆ دەسەڵات. بۆیە زۆر نووسەر پێیان وایە کرداری نووسین خۆپاراستنە لەو مردنەی لە کنەکردنە نێو ژیانی هاوچەرخ: سیاسەت، دەسەڵات، جەنگ و خۆکوشتن بەهەموو واتاکانیەوە، ناکەوێت. چونکە جەستە دەستی بەوە کردوە جیاواز بڕوانێتە خۆی، کاتێك وێنەکەی لە ئاوێنەدا دەردەکەوێ، ئەوا بە یەکێکی دی دەچێت کە لە ڕێگەیەوە وێنەیەکی نەگونجاو سەبارەت بە واقیع دەچنرێ. ئەو جەستەیەی لە وێنەکەدا بەکاربراوە ئەوە نییە کە لە خۆشەویستیدا ئامادەیە. بۆیە کاتێك وێنەکە ئاشکرا دەبێت، پیاو یان ژن دەستدەکات بە تێکشکاندنی جەستەکە و پێی وایە ئەو وێنەیە وردو خاشدەکات کە لەمەڕ جەستە لە خۆیان گرتووە. لێرەشدا بێهیوایی، سەبارەت بە شیانی گەیاندنی ئەو شتەی خۆی نەیتوانی تێیبگات یان بیڵێ، زاڵدەبێ و ئەم ململانێیە دەتەقێتەوە کە دەشێ بە مردن یان لە سێدارەدان کۆتاییبێت[7].

بۆچی ئارەزووی پیاو و ئارەزووی ژن پێکناگەن؟ ئایا خولقاندنی منداڵ لە سکی جەستەی بەپیتی ژندا جێی ئەو نووسینە دەگرێتەوە کە پیاو دایدەڕێژێ؟ ئایا ئەمە تەنیا جیاوازیی نێوانیانە لەسەر ئاستی نووسین؟

بێ بەستنەوەی نووسینی ژن بە ڕۆژگاری هاوچەرخەوە، ناشێ لە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە نزیکبینەوە. چونکە ژن ڕوویکردۆتە ئەوەی ئاخاوتنی خۆی بگۆڕێ بۆ نووسین و ئەو پەیامانەی خۆی بە پیاو بگەیەنێ کە هەمیشە ڕۆژگاری پیاوسالاری کاری بۆ لەقاڵبدان و سەرکوتکردنیان کردوە. بەنرخترین بەهایەکیش ژن بخوازێ بە نووسین بەدەستیبێنێ ئەوەیە کە جەستە نەك مردن بە ڕوویەری دنیاو سەرچاوەی ژیان دابنێ، ئەوەیە کە پێیوایە عیشق بەتوندی بە جەستەوە گرێدراوە و لەژێر پەردەی وێنەدا خۆی حەشارنەداوە.

وا پێدەچێ ئەمجۆرە نووسینە تاوتوێکردنی سەخت بێت، چونکە ئەگەر ژن بخوازێ خۆ لە گۆشەگیری خۆی لابدات، ئەوا پێویستە لەسەری گوتاری خۆی، بە تەبابیەکی ڕێژەیی نەك ناکۆکییەکی ڕەها، لەگەڵ گوتاری پیاودا داڕێژێ. ژن هەمیشە لە ڕوانگەی خۆشەویستییەوە پرسیارکردنەوەی ئاراستەی پیاو کردوە، پیاویش لە بەرامبەر ئەمە کاری بۆ خولقاندنی نووسینێك کردوە لەسەر وێنەی

خۆی وەك پیاو، چونكە كاتێك ئەو بۆ دنیا و سەبارەت بە دنیا دەنووسێ، ئەوا ئەو كارە بۆ خۆدەرخستن دەكات، ئەگەر تا ئێستاش "هەموو" شتێكی نووسیبێ، ئەوا ئەوە لە ناخدا ئەنجامی دابڕانی هەبوونخوازی لە ژن رویداوە. پیاو ئامانجی لە نووسین جەمسەرگیرییەكی دیاریكراوە، لە كاتێكدا ژن لە نووسینی خۆیدا لە پانتاییەكەوە هەنگاو هەڵدەنێ كە جیاوازی كۆنترۆڵیدەكات، لەبەر ئەوەی ئەو گەرەكیەتی پیاو رووبەڕووی ئەو شتە بكاتەوە كە دەیەوێ پشتگوێیخات: "چونكە من لە پێناو خۆشەویستی و لە روانگەی خۆشەویستیەوە دەنووسم، لە خۆشەویستییەوە دەست بە نووسین دەكەم و بە خۆشەویستی دەنووسم. نووسین و ژیان هاوشانی یەكن.. نووسین بزووتنەوەی خۆشەویستییە.. بزووتنەوەكەیەتی"[8] بەڵام بەلای پیاوەوە هێشتا جەنگەكە كۆتایی پێ نەهاتووە، چونكە ئەو هەمیشە لە پرۆسەی گەڕاندایە بەدوای جەنگێكی نوێ یان لە خۆگرتن و فراوانبوونێكی نوێ یاخود مردنێكی دیكەدا.

بەڵام ئایا ژن، لە كاتی نووسیندا، ئەو مەرجانەی بەدەستەوەیە كە بەسن بۆ كۆنترۆڵكردنی پەیوەندیی خوی لەگەڵ جەستەی خۆیدا؟

ئەم پرسیارە لەلایەن ژنەوە دەرنابڕدرێت،

چونكە پەیوەندیی بەو شتەوە هەیە كە رەگی بە نائاگاییدا بردۆتە خوارەوە و لە هەبوونیدا، وەك بوونەوەرێك، رەگی داكوتاوە، لێرەوەیە یەكێك لەو ژنانەی لە بواری شیكردنەوەی دەروونیدا كاردەكات دەڵێت: "پەیوەندیی ژن لەگەڵ جەستەی خۆیدا پەیوەندییەكی لە هەمان كاتدا نەرجسیانەو هەوەسخوازانەیە، چونكە ژن چێژ لە جەستەی خۆی وەردەگرێ، وەك ئەوەی جەستەی ژنێكی دیكە بێت. رەفتاری لەگەڵ هەر رووداوێكی سێكسی (هەرزەكاری، ئەزموونە سێكسیەكان، دایكایەتی..هتد)، كە تیایدا دەژی، بەو جۆرەیە كە لە ژنێكی دیكەوە بۆی هاتووە، بەتایبەتی لە دایكەوە، هەموو ئەوانە روودەدەن، وەك ئەوەی مەسەلەكە: "بوون بە ژن" "گۆڕان بۆ ژن" دەرفەتی گەیشتنە چێژێكی جەستەیی دەڕەخسێنێ، بەو پێیەی مێسالارە (انثویة) و یا دایكسالارە (أمومیة)"[9].

وەك چۆن پیاو دایكی تیایدا جێگیرەو هەمیشە كار بۆ رەتكردنەوەی مێبوونی خۆی دەكات، ژنیش بۆ جیابوونەوە لە دایكی خۆی كۆششدەكات. لێرەوە پێویستە سێكسانیەتی (*Sexualite*) ژن و پیاو لێك جیابكەینەوە. هەر نێرێك خۆی وەك بابەت و بەرهەمی دایكی خۆی دەبینێتەوە، لەبەرئەوەی بەشێك بووە لە جەستەی ئەو: "كەواتە دەتوانین قسە لە "مێسالارییەك" بكەین كە خۆی لە مێسالاری دایكایەتیدا حەشارداوە. ئایا كرداری سێكسی بەلای پیاوەوە كردارێكی بنەماییانە نییە، بەو پێیەی كاتێك ئەو كاردەكات بۆ چەپاندنی مێسالاری، ئەو دابڕانە دوبارە دەكاتەوە كە پیاو لە دایكی خۆی جیادەكاتەوە؟"[10].

بەپێی ئەم كارلێكردنە دیارینەكراوەی نێوان خەیاڵی و واقیعی، جەستەی هێمایی پیاو، بەو پێیەی بوارێكە بۆ ململانێیەكی دیارینەكراو، دادەڕێژرێ و ئەو پێوەناڵینانەش (معاناة) سەرهەڵدەدەن كەلە جیاكردنەوە ناكەون، مەبەست جیاكردنەوەی ئەو وێنەیەی خود سەبارەت بە خۆی هەیەتی و ئەو خۆشییەی ئەو خودە دەگرێتە باوەش، كاتێك دەیەوێ لەوی دی ئەوە وەربگرێت كە لەسەر ئاستی خەیاڵكردنەوە حەزپێدەكات.

لە هەموو ئەوەی پێشوو دەگەینە ئەو سەرەنجامەی كە جەستە رووبەرێكی بێكۆتاییە بۆ داڕشتنی هێماكان و نووسین، جا ئەوە جەستەی ژن بێت یاخود پیاو. چونكە هەموو جەستەیەك دەقێكە

دەکەوێتە ئاخاوتن، دیالۆگ، ناکۆکی و ململانێیەوە لەگەڵیدا. هەروەها خود گیرۆدەی ئەوەیە کە لەگەڵ وێنەی خۆیدا جووتنایەتەوە، تەنانەت ئەگەر گەشترین و جوانترین وێنەش بێت.

ژن بە جەستەی خۆی ئەوە دەنووسێت کە سیستەمی هێمایی پیاوسالاری ناتوانێ هەڵیوەشێنێتەوە یان تێیبگات. ژن لە دوورەوە لە ژن تێدەگات، ئەمەش لە رێگەی رەنگەکانی و شێوازەکانی پێکهێنانی روو و پرچ و جلوبەرگیەوە، بەو پێیەی جلوبەرگیش جۆرە زمانێکە، ئەو دەست لە نووسینی ئەو وێنانەی هەڵناگرێت کە بە پێویست وێنەی خۆی نین. لەبەرئەوەی لەرێگەی ئەوانی دییەوە پێکهاتوون یان بەهۆی لێکدانەوەو بایەخپێدانێکی کاتیەوە دروستبوون کە دەیەوێ بە هۆیەوە هەڵکشێ بۆ ئاستی ئەو وێنەیەی جووتە لەگەڵ ئەوەی دەیەوێ ببێ یان هەیبێت. ژن جەستەیەکی ئارەزوومەندە، ئەمە گوتەی پیاوە، یاخود بەلای کەمەوە ئەوەیە واقیع دەریدەخات، بەوپێیەش بوونەوەرێکی نەرجسییە لە دەوری خودی خۆی دەئالێ، بێ ئەوەی هیچ هەوڵێك بدات بۆ لێدەربازبوونی.

ئایا نەرجسیبوونی "هەڵئاوساوی" ژن ئەنجامی ئەو واقیعی چەوساندنەوەیە نییە کە پیاو جڵەویکردوە؟ ئینجا، ئایا ناشێ بڵێین خۆپەرستیی و نووسینی ئالاو لە خودی خۆی و پەرچەکردارەکانی میکانیزمێکن بۆ بەرگریکردن لەنێو پەیوەندیی کۆمەلایەتی چەوسێنەرانەی سەرکوتکەردا؟

### 4-نووسین و شێواز: ژن و حەقیقەت

فلوبیر دەڵێت: "هەموو شتێك لە شێوازدایە". بەمجۆرە ئەو نووسەرە "هەموو" شتێك لە شێوازدا پوختە دەکات. مەسەلەکە تەنیا گێڕانەوە یان نووسین ناگرێتەوە، بەڵکو ئەو شێوازە سەرتاپای شتەکان لە چوارچێوە دەگرێت، پێویستە شێواز رەتکردنەوەی رەتکردنەوەیەکی دی بێت، یان نووسینی خوێندنەوەیەك بێت کە لە رێگەی نووسینەوە نووسراوە، چونکە بەهۆی شێوازەوە خود ناسنامەی خۆی -یان فرەناسنامەی خۆی- و رووخسارە جیاکارەکانی دەنەخشێنێ.

شایانی باسە، ئێمە نامانەوێ شێواز بکەینە بابەتی ئاخاوتنی خۆمان، تا ئەو رادەیە نەبێت کە پەیوەندیی بە دەربڕینی مەسەلەی پەیوەندی نێوان پیاو و ژنەوە هەیە، ئەمەش لە رێڕەوی باسکردنی نووسین و ژن و حەقیقەتدا لە روانگەیەکی ئەنتۆلۆژییەوە و بەپێی هەڵوێستی نیچە لەمەڕ ئەو مەسەلەیە.

جاك درێدا دەڵێت: "پرسیاری شێواز هەمیشە پرسیاری بابەتێکی تیخکەرە، دەشێ هەندێ جار تەنیا پەڕەمووچێك بێت، بەڵام ناشێ پێنووس یان راستتر بڵێین خەنجەریش بێت، بەهۆیەوە دەشێ بە کردەوە هەڵسین بەهێرشبردنێکی توندوتیژ بۆسەر ئەوەی فەلسەفە بە مادده ناویدەبات، بۆ ئەوەی نیشانەیەکی تیا بچێنێ، یاخود شوێنەوار یان شێوەیەکی تێدا بەجێبهێڵێ، بەڵام لە هەمان کاتدا بۆ پەکخستنی هێزێکی هەڕەشەلێکەر و دوورخستنەوەو چەپاندنی و وریابوونە بەرامبەری"[٤٤].

کەواتە شێواز "رووپۆشێکە" دەشێ بۆ خۆپاراستن لە هەڕەشەیەکی ترسناك یان کوشندە بەکاربێت، لە راستیشدا هەڕەشەیەك سەرسەختانە ئامادەیە، ئەویش لە ئامادەبوون یان ناوەڕۆك، مانا یاخود حەقیقەتدا دەردەکەوێ. لێرەدا پێویستە کاریگەریی شێواز، وەك رووپۆشێك، لەسەر مەسەلەی ئاخاوتن دەربارەی ژن و پەیوەندیی بە پەچە یان ئەو شتەوە دووپاتبکەینەوە کە روو دادەپۆشێ یاخود حەقیقەت: حەقیقەتی ژن، لە پشتییەوە خۆی حەشار دەدات.

درێدا پێیوایە، نیچە سڵ لەوە ناکاتەوە ددان بەوەدا بنێ کە بڕوای وایە بە نرخترین شتێکی خودی

ئەو دروستدەکات لای ژنــە. لـێرەدا مەسـەلەی تەفرەدان دەردەبڕدرێ، تـەفرەدانی توندوتیژ کە ژن لـە دوورەوەڕا کاریپێدەکـات، چـۆن دەتوانـین ئـەوە قبوڵبکەین کە مێـژووی فەلسەفە لـە ئەفلاتونـەوە تـا هایدگـەر مێژوویـەکی پیاوسـالارەو لەسـەر واقیعـی دوورخستنەوەی ژن دامـەزراوە، لـە هـەمان کاتیشـدا هاوشانی نیچە ڕێبکەین و بڵێین گرنگترین شتێك کە کەینونەی ئەو پێکدێنێ لە دنیای ژندایە؟

ژن خـاوەنی دەسـەڵاتێکی بێوێنەیـە، ئـەویش توانای تەفرەدان و ڕاکێشانە لە دوورەوەڕا. دەسەڵاتی ژن لـە توانـای تـەفرەدان لـە ڕێگـەی خولقـاندنی مـەوداوە بەدەردەکـەوێ، لـێرەوە مامەڵـەکردن لەگـەڵ ئـەو مەودایەدا کە ژن بە تـەفرەدان دەیچنـێ، پێویسـتی بەوەیـە لـەنێو خـودی ئـەو مەودایـەدا سـەنگەر لێدرێت، ئەمـەش نـەك تەنیا بـە مەبەستی خۆپاراستن لـەم تەفرەدانـە ژنانەیـە یـاخود کارکردن لە دژی. کەواتـە مـەودا بـاری جۆربەجۆر پێکدێنـێ کـە پێویستە لـە گوێ بـۆ گرتنـی نزیکبینەوە، ئەمەش لـە ڕێگـەی خولقـاندنی دوورکەوتنـەوەی پێویستـەوە بـۆ خـۆلادان لـە تـەفرەدانی ژن کـە لـە مـەوداوە سـەرهەڵدەدات. کەواتـە مـاوەی مەوداکە لە لایەکـەوە مەبەستی تەفرەدانـەو لەلایـەکی دیکـەوە مەبەستێتی نەکەوێتـە نێو ئـەو تەلیسمەوە کە لە مەودای ژنەوە سەرهەڵدەدات.

بەپێی ئـەم وتەیـە، ژن ناوەڕۆکی نییـە، گوتاری فەلسـەفی و ئـایینی وا دەبێژێـت، چونکـە ژن جیاکەرەوەیە، لە خودی خۆی دووردەکەوێتـەوەو لـە خودی خۆیدا نقومدەبێ، وێڕای ئەوە بێ ناسنامەیی و بێ جەوهەری و نەبوونی تایبەتمەندی ئاراستەدەکات. کەواتە حەقیقەتێك بۆ ژن نییە، بەڵکو بێ حەقیقەتی ئـەو بـۆ خـۆی حەقیقەتێکـە: "ژن ناوێکـە بـۆ ناحەقیقەتی حەقیقەت"[12].



جاك دریدا

ئەمەیە سەیری نیچەی شاعیرو فەیلەسووف، ئەو بڕوای وایە ژن ژیانە، لە هەمان کاتیشدا لە حەقیقەت بە دووریدەگرێت. چونکە حەقیقەت وەك ژن یان وەك بزووتنەوەی پەچەپۆشین و خۆشاردنەوە خودی گەرۆکی شەیدای حەقیقەت ماندودەکات و ئەو فەیلەسووفە ئەشکەنجە دەدات کە هەمیشە وێڵە بەدوای حەقیقەتدا. شایانی باسە، فەیلەسووفی دۆگمایی نقومبوو لە میتافیزیکیەتی خۆیدا شتێك لە حەقیقەت و ژن تێناگات، چونکە حەقیقەت تەنیا ڕواڵەتێکەو نابێتە حەقیقەتێکی خاوەن ڕوخساری قووڵ و ئارەزو ووروژێن، ئەو کاتە نەبێ کە پەچە بەکاردێنێ بۆ دەرخستنی شەرمێکی تەفرەدەرانە کە حەقیقەتێکی جیاواز حەشار دەدات.

بەلای ژنەوە گەڕان بەدوای حەقیقەتدا گرنگ نییە، کاتێکیش پیاو جێی ئەو دەگرێتەوە بۆ گەڕان بەدوای حەقیقەتدا، ئەوا ژن بڕوای بە بەشێکی کەمی گوتەکانی ئەو هەیە، چونکە ئەو پیاوە پێیوایە قسەکردنی سەبارەت بە ژن یان حەقیقەت بەلای ژنەوە گرنگە، ئەوە پیاوە کە بڕوای بە حەقیقەتی ژن هەیە، کاتێکیش ژن دەچێتە نێو ڕیزەکانی بزوتنەوەی ژنانەوە یان نێو ڕیزەکانی بزووتنەوەیەکی داواکارخوازی تایبەتیەوە، ئەوا نیچە پێیوایە ئەوە پرۆسەیەکی دەمامککراوە، ژن دەیگرێتەبەر بۆ لاسایکردنەوەی پیاو یان خۆچواندن بە فەیلەسووفی دۆگمانی، بەمەبەستی گەیشتنە حەقیقەت یان بابەتێتی یاخود زانست. نیچە لە دەقێکیدا کە بێوێنەیە لە دوژمنایەتیدا بۆ ژن دەڵێ: "پەیوەندیی ژن بە حەقیقەتەوە چییە؟ لە بنەچەوە هیچ شتێك ئەوەندەی حەقیقەت نامۆ، ناکۆک و دوژمن نییە بەلای ژنەوە، چونکە هونەری مەزنی ئەو لە درۆدا خۆی دەبینێتەوەو بالاترین مەسەلەشی لە خۆدەرخستن و جوانیدا بەدەردەکەوێت"(13).

دریدا کۆمێنتار لەسەر ئەوە دەردەبڕێت و دەڵێ سەرتاپای بزووتنەوەی پرۆسەی مێسالاری لە ڕێگەی ئەم ناکۆکییەوە دەردەکەوێ. بەو پێیەی ژن دووجار نموونە پێکدێنێ: ئێمە لە هەمان کاتدا ستایش و تاوانباریدەکەین. ئەو نموونەی حەقیقەتە، چونکە خاوەنی هێزێکی بێوێنەی تەفرەدانە، بەهۆیەوە سەر لە زۆر لەو پیاو و بیریارانە دەشێوێ کەوێڵن بە دوایدا، بۆ بەدەستەوەگرتنی حەقیقەتەکەی، بەلام لە هەمان کاتدا بوونەوەرێکە بڕوای بە حەقیقەت نییە، ئەگەرچی بەرژەوەندیی ئەو لەم حەقیقەتەدایە کە بەلایەوە گرنگ نییە، ئەو خاوەنی توانایەکی بێوێنەیە بۆ مەیسەرکردنی گەمەی خۆشاردنەوە و ئارایشتکردن و درۆ. ئەو هونەرمەندێکە پەنا بە درۆ دەبات و وای نیشاندەدات کە حەقیقەت دەڵێت.

کەواتە سەختە نووسینێك -یان ئاخاوتنێك سەبارەت بە ژن- لە هونەرو شێوازو حەقیقەتدا داڕێژین، بێئەوەی بیخەینە چوارچێوەی مەسەلەی ژنەوە. بەو پێیەی تەنیا بە پێکهێنانی ئەم پەیوەندییە پرسیاری تایبەت بە ناسنامەی ژن دوادەخرێ. قسەکردن سەبارەت بە هەڵوێستی نیچە بەرامبەر بە ژن نابێ بە هیچ جۆرێك لە گرنگیی مەسەلەی سەرتاپای مێژووی خۆرئاوا بەرامبەر ئەم مەسەلەیە جیاکرێتەوە. چونکە ژن گرێدراوە بە مێژووی بیرەوە لە یادەوەریی خۆرئاوادا. شایانی باسە، هیچ شتێك جگە لە بزووتنەوەی پێکهاتنی ئایدیا (فکرة) یان بەدەستەوەگرتنی حەقیقەت هاوشانی نەشونماکردنی (صیرورة) گەڕان بە دوای ژن نییە. ئەفلاتون ئەو کاتە گەیشتە حەقیقەتی خۆی کە

هاوشێوە و گەوهەرەكانی خۆی بۆ دەركەوت، بەڵام رۆژگار وردە وردە ئەفلاتۆن و ئایدیاكەی لێك جیاكردەوەو نامۆ مایەوە. لێرەدا مەودا: ژن دامەزرا بۆ ئەوەی حەقیقەت وەلاوەنێ و رەهەندی بڵندیخوازی وا بداتە ئایدیا، كە تیخكردنی سەختە، بەڵام لە هەمان كاتدا تەفرەدەرە. ئەو لاهوتەی ژنی لە رێگەی خۆی لادا بۆ ئەوەی پەچەی ئەستوور بچنێ، جگە لە مردن و قیامەت شتێكی دی دەرنابڕێ. بەو جۆرەش ژن بووە مردن و مردنیش بووە مێینە.

لێرەشەوە دوژمنایەتی كڵێسا بۆ ژیان، لە رێگەی دووپاتكردنەوەی سەركوتكردنی ئارەزووەكان و دەستەمۆكردنی مێرشی ئەو هەوەسانەوە لێكدەدرێتەوە كە لە شەیتانەوە دێن. لە واقیعدا دوژمنایەتی كڵێسا بۆ ژیان پاش دارشتنی دوژمنایەتیی بۆ ژن، كە سەرچاوەی ژیانە، دامەزرا.

ژیان بە پێزو هەمەڕەنگ و جیاوازییە. ژن یاخود ژنێك بە خۆی یان "حەقیقەت"ێكی ژن لە گۆڕێ نییە. لەبەر ئەوەی یەك حەقیقەت لە گۆڕێ نییە، بەڵكو چەندین حەقیقەتی ناكۆك، چونكە حەقیقەت كۆخوازە.

ژن وەك بەخشین خۆی دەخاتە روو، پیاو دەیبات و دەبێتە خاوەنی، جارێكی دیكەش بە پێچەوانەوە ژن خۆی دەبەخشێتە ئامانجێكی دیاریكراو. ژن هاندەر و وروژێنەرە بۆ ئەوەی زاڵبون بەسەر پیاو و خاوەندارێتی بۆ پیاو دووپاتكرێتەوە. ئەمە ئاڵوگۆڕكردنە باوەكەی نێوان ژن و پیاوە، هەر جارەی یەكێكیان رووی خۆی دەگۆڕێ و لە هەر رۆژگارێكیشدا بە شێوازی بێ ئەندازە دەمامكەكان ئاڵوگۆڕ دەكەن.

كەواتە ناشێ نووسین لە شێوازێكدا گیربكرێت، بەڵكو پێویستە بوونی لەنێو شێوازی جۆراوجۆردا دووپاتكرێتەوە. جیاوازی و فرەیی ژنیش نووسین -جا نووسینی پیاو بێت یان ژن- فێری ئەوە دەكات لە سەڵتەبوون، كە خۆ خستنەڕووی نێرە بەشێوازی جۆراوجۆر لەنێو چوارچێوەیەكی هاوجووتیدا، خۆی دووربگرێت و خوازیاری فرەیی و گەمەی سەخت بێت لەنێو ناكۆكیەكاندا.

ئاڵوگۆڕكردن لەنێو كۆمەڵگایەكی چینایەتیدا، كە پیاو باڵادەستە تیایدا، چۆن روودەدات؟ بەهای هێمایی جەستەی ژن لەو كۆمەڵگەیەدا چییە كە نەریتەكانی ئاڵوگۆڕكردن تیایدا زاڵە؟

## 5-جەستەو ئاڵوگۆڕكردنی هێمایی:

شێواز، وەك "گشتێك" هەمیشە كاردەكات بۆ راماڵینی پەراوێز لە بواری نووسینداو چەپاندنی ئەو شێوازە هەمەلایەنەی وەك جیاوازی لە جەستەی ژنەوە هەڵدەقوڵێت، رۆشنبیریی مرۆڤانەی چەپێنراو هەردەم مێژووی پیاوی تۆماركردوەو دەكات، یان راستتر مێژووی دورخستنەوەی ژنە، وەك توخمێكی بە پیت، لە ژیان. وێڕای ئەوە، شێوازو نووسینی ژن دەست لە تەقاندنەوەی بنچینەكانی شێوازی پیاوسالاری هەڵناگرێ، بەو مەرجەی ژن خۆ لە هاوشانبوون و خۆپێچواندنی پیاو بەدوور بگرێ. چونكە شێوازی ژن خۆڕاگرەو هەموو ئەو شێواز، نیشانە،، بیرو چەمكانە دەتەقێنێتەوە كە لە لایەنی توندوتۆڵیی عەقڵیەوە بەشێوەیەكی پتەو دامەزراون، هەروەها ئەوانی دیكەش كە پیاو بە درێژایی مێژوو گەشەكردنی دایتاشیون. دەشێ شێوازی ژن بێبەها خۆ بنوێنێ، ئەمە ئەگەر لە روانگەی چوارچێوەیەكی

سەرچاوەیی بەهادارەوە داوەریمانکرد کە پیاو دایڕشتوە. چونکە ئەوەی ئەم شێوازە جیاکارە دەکات، ڕاڕایی و نائارامیەتی لەمەڕ داکۆکیکردن لە تێزێك یان هەڵوێستێکی نەگۆڕ. ژن لە گۆڕینی وێنەو شێوازەکانی خۆی ناکەوێت، بۆیە ئارەزووی ژن بەهەمان زمانی ئارەزووی پیاو قسەناکات و ئارەزوویەکە لە دەست لۆژیکی ئەو عەقڵە خۆی رادەپسکێنێ کە پیاو هەمیشە دەیەوێ هەموو شتێکی بۆ ملکەچبکات. پیاو تێناگات و زۆرجاریش سڵ لەوە ناکاتەوە ئەوە ڕاگەیەنێ کە لە ژن تێناگات، لێرەشدا زەبروزەنگ وەك جێگرەوەیەکی ملکەچنەبوونی ژن بۆ لۆژیکی پیاو خۆی قووتدەکاتەوە.

پیاو قسە لە هاوجووتی و یەککگرتن دەکات و ئەوە لە بیر دەکات کە ژن بوونەوەرێکی "دابەشکراو" و فرەیە، ئەم فرەئامێزیش لە سێکسانیەتیدا خۆی دەنوێنێ کە یەکتا نییە، چونکە جەستەی ژن جوگرافیایەکی هەمەجۆرە بۆ بەدەستخستنی چێژ (متعە). پیاو سەرچاوەی چێژوەرگرتنی ریزپەڕانە لە چووکدا کۆبۆتەوە، لە کاتێکدا ژن زیاتر لە کۆئەندامێکی هەیە کە فریایی دەکەون بۆ دەستخستنی چێژ.

ئاخاوتنی ژنیش ئاخاوتنێکی جیاکەرەوە و یاخیە لە توندوتۆڵیی لۆژیکی یەکتاپەرستی. چونکە خاوەنی زمانێکە بۆ ئاخاوتن لەگەڵ جەستەو خودی خۆیدا، کە بە گۆڕانی ئەو وێنەی دەخوازێ بیکات بە بەری خۆیدا، گۆڕانی بەسەردا دێت. هەروەها خاوەنی چەندین زمانە بۆ ئاخاوتن لەگەڵ ئەوانی دیکە. لەوانەیە شیانی شیکردنەوەی ئاڵۆزی، ڕاڕایی، شڵەژان و ئارەزووی کاتیی ژنیش لێرەوە سەرچاوە هەڵگرێ. زمانی ژن لە هەموو ئاقارەکانەوە هەنگاو هەڵدەنێ، بێ ئەوەی توانای بەدەستەوەگرتنی شێلگیرییەکی دیاریکراو لەنێو ماناکانیدا لەگۆڕێبێت. زمانی ئاخاوتنی ژن زمانێکی ناکۆکە، کەواتە "شێتە" و لە لۆژیکی عەقڵ خۆڕادەپسکێنێ. لەبەرئەوە پێویستە گوێیەکی جیاواز بۆ گوێگرتن لە ئاخاوتنی پێکبهێنرێ، بەو پێیەی واتای جیاواز دەدرکێنێ و پەیوەندیی جیاوازی لەگەڵ وشەو شتەکاندا هەیە، بە هیچ جۆرێك بیر لە پێویستیی جلەوکردن و دیاریکردنیان ناکاتەوە. چونکە کاتێك ئەو ئاخاوتنێکی دیاریکراو ڕادەگەیەنێ، مانای ئەوە نییە بە پێویست هاوجووتە لەگەڵ ئەوەی دەیەوێ بیڵێت.

کەواتە پێویست بەوە ناکات ژن بخرێتە داوی دیاریکردنی وردکارانەوە سەبارەت بەوەی دەیەوێ بیڵێت، هەروەها نابێ هاندرێت بۆ دووبارەکردنەوەیەکی چاك بۆ ئەوەی قسەکردنەکەی ڕوونبێت. چونکە ژن زۆر لە ئامێری گوتاربێژیی تایبەتییەوە (کە زۆربە خوازیارین) دوورە کە پیاو و سیستەمی هێمایی پیاو هەمیشە دایانڕشتوەو دایانمەزراندوە.

"ئایا پێویستە لە سەرمان ئەم فرەییەی خواست و زمانی ژنان وەك پریشك بێ پاشماوەی پڕشوبڵاوی توخمێکی ئەتککراو یان تالانکراو تێبگەین؟ ئەمە پرسیارێکە کە ناکرێ بە ئاسانی وەڵامبدرێتەوە. دوورخستنەوەو ڕەتکردنەوەی خەیاڵکاریی مێینە بەکردەوە ژن دەخاتە شوێنەوارێکەوە کە بەشێوەیەکی پڕشوبڵاو نەبێ لەگەڵ خۆ ئارامناگرێ، ئەمەش لەنێو ئەو پەراوێزانەدا کە بەشێوەیەکی نیوچڵ بۆ ئایدیۆلۆژیایەکی باڵادەست بنیاتنراون"..[14].

ژن بەلای پیاوەوە بەهایەکە بۆ بەکارهێنان و ئاڵوگۆڕکردن لەنێو پیاواندا. کەواتە کاڵایە دەکەوێتە نێو چوارچێوەی ئەو ئاڵوگۆڕەوە کە ئابووریی گشتیی کۆمەڵگا دادەمەزرێنێ، ئەم دەستنیشانکردنەش بڕیار لەسەر بەهای ژن لەنێو بازرگانی سێکسیدا دەدات، لە دواییشدا "ژن جگە لە بوارێکی ئاڵوگۆڕکردن شتێکی دیکە نییە"(16).

لەوانەیە بوونی ژن لەنێو کۆمەڵگەو رۆشنبیرییەکدا، کە سەرکوتیدەکات و بەکاریدەبات و لە پێناو شتی تردا ئاڵوگۆڕی پێدەکات بێ ئەوەی لایەنی کەمی سودی پێ بگەیەنێ، ئەو هۆیە بێت وا لە ژن بکات بوونەوەرێکی دواکەوتوو و نائامادە بێت. ئەمەش ئەو مەسەلەیەیە کە پاڵی پێوەدەنێ بەشێوەیەکی مازۆشیانە بچێتەوە خۆی و لە کاری ناوماڵ و هەڵسان بە رۆڵی خستنەوەی وەچەدا نقوومبێت، کە بێگومان ئەمە بارێکی کۆیلەییە، شایانی باسە، هیچ پانتاییەك جگە لە چاودێریکردن و چەپاندن بۆ ژن لەگۆڕێ نییە.

وەك بینیمان، گوتاری فەلسەفی جگە لە سەپاندنی دەسەڵاتی عەقڵ، بۆ بەهانەهێنانەوە بۆ دەسەڵاتی پیاو، زیاتر هیچی تری نەکردووە، چونکە ئەو گوتارە لە دارشتنی پیاوەو لە پێناو پیاودایە. هۆی ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ویستە بێسنوورەی ئەم گوتارە فەلسەفییە دەریدەبڕێ بۆ ملکەچکردنی ئەوەی جیاوازە لەگەڵ ئابووریی خودگەرادا.. لە دواییشدا سڕینەوەی هەموو جیاوازییەکی نێوان دوو توخمەکە لەنێو سیستەمێکی وێناکردنی نێرسالاریدا. تەنانەت تیۆری شیکردنەوەی دەروونی، کە پێدەچێ ئازادیخوازانەیە، سەبارەت بە ژن شتێکی نەکردووە جگە لە سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی وێناکردنەکانی گوتاری فەلسەفی بە بەهانەی لاواز، وتەی بوونی تەنیا توخمێك مانای چییە؟ سنووری ئەم وتەیە کامەیە؟ ئایا گرێی خەساندن، کە بە پێی شیکردنەوەی دەروونی ژن بە دەستییەوە دەناڵێنێ، یاریدەی ئەوەمان دەدات باری دەروونی، بایۆلۆژی و کۆمەلایەتی ژن شیبکەینەوە؟

کەواتە ژن بەهۆی رێڕەوی ئاڵوگۆڕکردنی گشتی ناو کۆمەڵگاوە دووچاری "بەکاربردنێکی تایبەتی" بووە، مەبەست ئاڵوگۆڕکردنی ئابووری، رۆشنبیری و سێکسییە. چونکە ئەو وەك مامەڵەیەکی "بازرگانی" نەبێ ناچێتە ناو ئەو ئاڵوگۆڕکردنەوە، ئەمە ئەگەر رازی نەبێت دەستبەرداری مێیێتی خۆی بێت. لێرەوە پێویستە لە روانگەیەکی دیکەوە هەڵسین بە رەخنەگرتن لە ئابووریی سیاسی و گوتاری باڵادەست، کە میتافیزیکا جڵەویدەکات، بهێنینە گۆڕ لە ڕوانگەی شێواز یان شێوازە جیاوازەکانەوە لێکیبدەینەوەو لە ئاست کاریگەریی ئابووریی و گوتار لە شیکردنەوەی پەیوەندییە بەرهەمهێنەرەکاندا هەڵوەستە بکەین.

ئەگەر ژن ملکەچی بەکاربردنی جەستەیی و هێمایی نەبوو، چی لە کۆمەڵگەدا روودەدات؟ ئەو گۆڕانە چییە روودەدات، کاتێك ژن لە شتێکەوە بۆ ئاڵوگۆڕ و بەرخۆری دەگۆڕێت بۆ بوونەوەرێك کە "دەئاخفێ" -ئاخاوتن نا- زۆربڵێیی، کە لە واقیعدا ئاخاوتنێکی جێگرەوەیە و بەشێوەیەکی جیا لە شێوازی نێرئاسایی خۆی دادەرێژێ؟

بێگومان ئەمانە پرسیاری ستراتیژین، هەڕەشە لەو کیانی سیستەمە ئابوورییە گشتیە دەکەن کە پیاو چەندین سەدەیە دایمەزراندوەو رێگە بە ژن نادات، جا بزووتنەوەی داواکارییەکانی چەند بنەڕەتی

بێت، هەرەشە لە بنیاتەکەی بکات، ملکەچکردنی جەستەی ژن بۆ ئاڵوگۆڕکردن یەکێکە لە بنچینەکانی ئەو کیانە. ئەوان بارزگانی بە ژن دەکەن، بەڵام بێ ئەوەی ئاڵوگۆڕکردنێکی دیاریکراو بخەنەوە. چونکە ئاڵوگۆڕکردنی ژنان، بەو پێیەی موڵکن، هاوشان و بزوێنەری ئاڵوگۆڕکردنی سامانەکانی دیکە دەبێ لە نێو پیاواندا. لەبەر ئەوەی ئابووری باو ئەوە لە ژن دەخوازێ تەواو بکەوێتە نێو تالانکردنی بەرخۆری و ئاڵوگۆڕکردنەوە، بەو پێیەی ژن کاڵایەکە پڕوپاگەندەی بۆ دەکرێت.

بەهای ژن لە بازاڕی ئاڵوگۆڕکردندا تەنیا لە تاقە بایەخپێدانێکی رەهاوە دێت، ئەویش ئەوەیە کە ئەو بەری کاری پیاوە. لێرەوە هەموو ژنان هاوشێوەن و هەمان واقیعی تارماییناسایان هەیە. چونکە ئەوان، بەو پێیەی کاڵان، سەرکوتدەکرێن و هەڵدەستن بە دوو رۆڵ لە یەك کاتدا: بەهایەك بۆ بەکارهێنان و سوود، بەرجەستەکەرێکی ئەو بەهایانەی دەشێ لە پرۆسەی ئاڵوگۆڕکردندا بەکارببرێن.

چۆن ژن لەنێو ئەم واقیعەدا لە خودی خۆی جیانابێتەوە؟ چۆن خۆ لە نیورۆسس (دەمارگرتن) و هیستریا و شیزۆفرینیا قوتار دەکات؟ جێی سەرنجە، کاڵا: ژن دابەشبووە بۆ دوو جەستە کە یەکناگرنەوە: جەستەیەکی سروشتی و جەستەیەك کە بەهایەکی کۆمەڵایەتی هەیەو شیاوی ئاڵوگۆڕکردنەو دەربڕی بەهای نێرسالارییە. لەوانەیە ئەمەش بێت سەرچاوەی ململانێی بەردەوامی ئەو.

"دایك، کچێنیدارو سۆزانی، ئەمە ئەو رۆڵە کۆمەڵایەتیانەن کە بەسەر ژناندا سەپێنراون، ئەو روخسارە سێکسییە ژنسالارانەش کە لەوەوە هەڵدەقوڵێن: نرخاندنی سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوە یان منداڵ خستنەوە و پەروەردەکردنیان، دڵسۆزی، حەیاو شەرم، نەفامی یان زیاتر گێلی بۆ چێژلێوەرگرتن و قبوولکردنی خۆبەدەستەوەدەرانەی "چالاکیی" پیاو، فریودان بۆ بزواندنی حەزی بەرخۆران، بەڵام خۆخستنە باوەشی ئەوانەوە وەك کۆڵەکەیەکی ماددیی ئەوان بێ هیچ چێژوەرگرتنێك.. چونکە ژن مافی هیچ چێژوەرگرتنێکی نییە"[10].

کەواتە پیاو گەورەی بێ هاوشانی ئامڕازەکانی بەرهەمهێنانی شارەزووە، بۆیە رەخنەگرتن لە کۆمەڵگای نێرسالاری نابێ تەنیا دروشمێکی بەرزکراوە بێت بێ کارکردنی بێوچان بۆ هەڵکۆڵینی شێوازە پێویستەکانی رەخنەگرتن لە پێناو هەراسانکردنی بنیاتە نێرسالارە باوەکەدا، چونکە ئەو دۆخی بەکاربردنە تایبەتییەی ژن تیایدا دەژی، لە رێڕەوی ئاڵوگۆڕکردنی ئابووری لەناو کۆمەڵگەدا، جا ئاڵوگۆڕەکە کاڵایی بێت یان کۆمەڵایەتی یاخود هێمایی پێویستی بە رەخنەیەکی ستراتیژی یان گۆڕانێکی بنەڕەتی خودی چەمکی رەخنە هەیە. پرۆسەکە پێویستی بە سازدانی "تیۆرێکی" نوێ نییە کە ژن بابەتەکەیەتی یان تەنانەت خودەکەیەتی، بەڵکو پێویستی بە هەژاندنی ئەو میکانیزمە تیۆرییە هەیە کە پیاو لە کۆنەوە دایمەزراندوە. ئەمەش کارێکی ستراتیژییە پێویستی بە پشودرێژی هەیەو بێ خستنەگەڕی کۆششی پیاو و ددانپیانان بەو کۆششەدا، لە بەرامبەر ددانپیانانی پیاو بە جیاوازیی ژندا، مەیسەر نابێ "چونکە هەتاکو ئێستا تیۆرێك یان پراکتیکێکی سیاسی وا نییە کاری بۆ چارەسەکردنی ئەم کێشە مێژووییە کردبێ و لەبەرچاوی گرتبێ، ئەگەرچی مارکسیزم گرنگیی ئەمەی راگەیاندوە، بەڵام لە واقیعدا ژنان چینێك

پێکنـامێنن، پـرش و بڵاویشـیان خــەباتی سیاسـیان ئاڵۆز دەکات و هەندێ جـار داواکارییەکانیان ناکۆکـتر دەکات"[17].

**پەراوێزەکان:**


*1-Michelle Coquillat; la poetique du male, ed, Gallimard, Paris, 1982. P 31.*

*2-Ibid, P229.*

*3-خلیل احمد خلیل: دراسـات عربیـة، ژمـارە 8، حوزەیران (یۆنیۆ) 1973.*

*4-Fatna Ait Sabbah; La Femme dans l'incoscient musulman, ed. Le Sycomore, Paris, 1982. P203.*

*5-J.J Rousseau, Cite in La Poetique du male, op. Cit, P117.*

*6-Paul Mathis: le corps et l'ecrit, ed, Aubier, Montaigne, Paris, 1981. P10.*

*7-باری لوی ئاڵتۆسـێر لەسـەر زیاتر لـە یـەك ئاسـت لغزدار بوو، چونکە نووسین لای ئەو رێگـەی لـەوە نـەگرت خواستی مردن خۆی راگەیەنێ، ئایا ئـەو ویستی ژن یان دایك یان وێنەیەکی ژن بکـوژێ؟ تـەنیا خـۆی دەتوانـێ وەڵامبداتـەوە، چونکــە تــەنیا خــۆی لەگـەڵ مرەعانـاتی گەیشتنی ئاڵۆزی خۆی بە ژنی بەسەربردوە.*

*8-Helene Cixous, cite in Paul Mathis, op. Cit, P 90.*

*جۆرج تەرابیشی کاتێك نووسینی ژنــە رۆماننووسـەکان دەخوێنینـەوە ئـەوە بەدیدەکـەین کـە هـەر لـە دێڕەکـانی سەرەتادا ناسنامەی ژنبوونی خۆیان ئاشـکرا دەکـەن، لـە کـاتێکدا ئـەو رۆمانــە عەرەبیانــەی لــە لایــەن پیـاوەوە نووسـراون ئـەوە بـە روونـی راناگەیـەنن کـە: "منـی پیـار نووسەرم"*

*9-Michele Martrelay, lombre et le nom, sur la Feminite. ed, de minuit, Paris 1977.*

*10-Ibid, P80.*

*11-J, Derrida, la question du style; in Neitzsche aujourd'hui, T1, 10/18, Paris.*

*12-Ibid, P 243.*

*13-Nietzche, in Nietzsche aujourd'hui, op. cit, P251.*

*14-Luce Irigoray, ce sexe qui n'en est pas un, ed, de Minuit, Paris 1977, P29.*

*15-Ibid, P 31.*

*16-Ibid, P 181.*

*17-Ibid, P 31.*


**سەرچاوە:**


*ئەم بابەتــە لـە ژمـارە 9/ سـاڵی یەکـەم- حوزەیـران (یۆنیـۆ)/ 1985ی گۆڤـاری "الوحـدة"ی مـــەغریبیدا بڵاوبۆتەوە کە ئەنجومەنی نەتـەوەیی رۆشـنبیری عـەرەب بڵاویدەکاتەوە.*

# ڕەخنەو تۆژینەوە

- ڕەخنەی ئەدەبی لە فەرەنسا دوای ڕۆلان بارت
- تیۆرەی ئاگاداری

ئەبولحەسەن نەجەفی

# ڕەخنەی ئەدەبی لە فەڕەنسا دوای ڕۆلان بارت

● و. لە فەرەنسییەوە: بەختیار سەرجادی

دوای بارت، رەخنەگرانی دیکە هەمان رێگەی رەخنەی فۆرمالیستیان[1] بەشێوەیەکی پتەو گرتە بەر و بەرهەمی ئەدەبییان وەکوو چوارچێوەیەکی سەربەخۆ دادەنا کە لەهەر چەشنە مەبەستێك (بەتایبەت مەبەستی نووسەر) بەتاڵە.

ئەم رەخنەگرە "تازە سەر هەڵداوانە" (وەك تۆدۆروف، ژێنێت، ئامۆن و کریستافا) کە لە ژێر کاریگەری بەرهەمەکانی گریماس[2] و بێنفێنیست[3] دان لە هەڵسەنگاندنەکانیاندا ئەدەب تەنیا وەکوو "زمان" لەبەرچاو دەگرن؛ واتە بە بیروڕای ئەوان ئەدەب وەکو زمان سیستەمێکە لە نیشانەکان. هەروەها، تەنیا لەسەر تایبەتمەندییە بەرچاوەکانی چەند دەقێکی ناسراو پێداگری ناکەن، بەڵکوو سەرجەم هەڵس و کەوتی زمانی ئەدەبی دەخەنە بەر تیشکی نرخاندن. کەواتە، وەها رەخنەیەك کە یەکەمجار سروشتی خۆی گۆڕیوەو خۆی تازە کردۆتەوە، زیاتر دەیەوێ زانستی کەلامی[4] هونەری شیعر (بوتیقا)[5] بدۆزێتەوە؛ وەك تۆدۆروف دەڵێ: "ئێمە بەرهەم ناخوێنینەوە بەڵکوو دەمانەوێ راستیەکانی گوتاری ئەدەبی دەست نیشان بکەین".

رەوتی فۆرمالیزاسیونی بەرهەمی ئەدەبی[6] لە پلەو ئاستێکی سەرتردا زیاتر رواڵەتێکی دەرهەست[7] لەخۆ دەگرێ و وتارو بابەتگەلێکی زۆر لەم بارەیەوە نووسراون کە لە چەند گۆڤارێکی ئەدەبیدا وەك تێل کێل[8]، بوتیقا[9] شانز[10] و لیتراتور[11] بڵاوکراونەتەوە.

ئاشکرایە پێداچوونەوەیەکی تێرو تەسەل لەسەر سەرجەم رێبازە رەخنەییەکانی ئەم دواییانە (وەك نیشانە ناسی، "بوتیقا" ناسی و ژێنێتیك) لە قەوارەی وەها لێکۆڵینەوەیەکدا ئەنجام نادرێ و ئێمە لێرە تەنیا چەند باسێکی گشتی سەبارەت بە بیرو بڕوای بیردارێژە مەزن و هاوچەرخەکانی رەخنەی ئەدەبی دەخەینە بەردەستتان.

## گریماس و نیشانەناسی

گریماس لە کتێبێکیدا لەژێر ناری نیشانەناسیی بونیادی[12] (*1966*) توێژینەوەکانی خۆی لەسەر گیروگرفتەکانی گێڕانەوە خستە بەر چاو و ئەم کارەی گریماس بە چەشنێ دووبارەکردنەوەو دەست پێکردنی هەمان رەخنە بوو کە لەبەرهەمەکانی

پراپ[13]دا ئاماژەی بۆ کرابوو. گریماس، بە پێڕەوی کردن لە بەرهەمەکانی ئەم بیرداڕێژە رووسییە، باس لە بیرۆکەی "کارا"[14]کان لە شیکاریی چیرۆکەکاندا دەکات. "تاکە کارا"کان دوو بە دوو لە بەرامبەر یەکتردا دانراون:

*سوژە لە بەرامبەر ئوبژەدا*
*نێرەر لە لەبەرامبەر وەرگردا*
*هاوڕا لە بەرامبەر دژدا*

کەواتە، بەبۆنەی مۆدێلی "کاراکان"[15]ەوەیە کە گریماس توانیویەتی پێشنیاری بۆچوونێکی تایبەتی بۆ شیکردنەوەی چیرۆک بدات. ئەم مۆدێلە هەروەها سەرجەم کارکردەکانی تیۆرەکەی پراپ سادە دەکاتەوە کە ژمارەیان بیست دانەیە:

" سادەکردنەوەکەی (گریماس) لەسەر ئەم راستییە دامەزراوە کە بەردەوام لە سەرجەم تەوەرەکاندا خواستێك لەلایەن سوبژەوە ئاراستەی ئوبژە دەکرێ و ئەم تەوەرە (ئەستوونییە) وەکوو پەیوەندییەك لەنێوان نێرەرو وەرگردایە، خواستی سوژەش بۆ خۆی بەردەوام لە "هاوڕابوونەوە" بۆ "دژبوون" و بە پێچەوانە دەگۆڕدرێ:"

نێرەر-> ئوبژە-> وەرگر
هاوڕا-> سوژە-> دژ

گریماس لە شیکارییەکانیدا لەسەر ئەو باوەڕەیە کە دوو کۆمەڵە جیاوازی چیرۆك لە ئارادایە: کۆمەڵەی یەکەم یاساکانی مۆدێلەکەی سەرەوە "پەسەند دەکات" و کۆمەڵەی دووەم "رەتی دەکاتەوە". بۆ نموونە، گریماس ئەم تیۆرە لەسەر بەرهەمی بێرنانۆس دادەبەزێنێ چونکە ناوەڕۆکی سەرجەم بەرهەمەکانی بێرنانۆس لەسەر دوانە لێکدژی "ژیان" و "مەرگ" بونیادنراوە.

هەرچەند زۆربەی هەرەزۆری نیشانەناسیەکەی گریماس باسی شیکاریی چیرۆکەکان دەکات، بەڵام تا رادەیەکیش ئاماژەی بۆ شیعرو بەشەکانی دیکەی زمان کردووە.

هەفدە ساڵ دواتر، گریماس لە بەرهەمێکی نوێیدا کە لە چەند وتاری نیشانەناسی پێك هاتووە: هەمان رێگەو رێبازی پێشووی گرتۆتەبەر، بەڵام بە جێگەی بە شوێن یەك دا نووسینی رووداوەکانی نێو چیرۆکەکان باس لە "نموونەیەکی گشتی گێڕانەوە" یان چەند "نموونەیەکی بچووکی گێڕانەوە دەکات. بە وتەی ئادی، گریماس بیرمەندێکە کە تیۆرەکانی، لەبەرئەوەی زۆر ئەستەمن، هێشتا زۆر پەرەی نەسەندووە، چونکە گریماس باسی نیشانەناسییەکی گشتی ناکات و گرنگی بە نیشانەناسییە تایبەتییەکەی خۆی دەدات..

## کۆمەڵەی تێل کێل[16]

گۆڤاری تێل کێل کە یەکەم ژمارەی لە ساڵی ***1960***دا دەرچووە پیشاندەری نوێترین رێبازەکانی رەخنەی ئەدەبییە. سولێر کە یەکێ لە دامەزرێنەرەکانی بوو لە ساڵی ***1968***دا کتێبێکی بەناو تیۆری کۆمەڵ[17] بڵاوکردەوەو هەر ئەمەش بووە هۆی ئەوە کە ئەم گۆڤارە سەرکەوتنێکی بەرچاو وەدەست بێنێ.

زۆربەی هەرەزۆری تیۆرەکانی نێو تێل کێل بیرۆکەی "دەق" یان شیکردوەتەوە. بە راستی ئەمە سولێر بوو کە بیرۆکەی دوو وشەی "خوێنەر" و "بەرهەم"ی خستە پشت گوێ و و بەجێی ئەوان "نوسەر" و "دەق"ی دانا: "دەق هی هەمووانە نەك هی تاکە کەس، دەق ناتوانێ بەرهەمێکی تەواو و رەهابێ".

هەروەها، هەر لەم کاتەدا بوو کەزانستێکی نوێ بەناوی زانستی "نووسین" لە دایك بوو و وەچەی ناوبراو هەموویان لەسەر "دەق" و "نووسین" قسەیان دەکرد. لەلایەکی ترەوە، سولێر، بە رەت کردنەوەی ئەم باوەڕە لە مێژینە کە بەرهەمە

کلاسیکەکان خاوەن بنەمایەکی تەواو و رەهاو داخراون، چەمکی "نێوان دەقی"ی[18] لە باختین وەرگرت کە ژولیا کریستافا لەم بارەیەوە دەڵێ: "هەر دەقێک بەشێوەیەک لەسەر رێگای رووبەڕووبوونەوەی چەند دەقێکی دیکەدایەو هەر دەقێک دووبارە خوێندنەوەو دەربڕین و کورت کردنەوەو بیرکردنەوەی دەقەکانی دیکەیە".

کریستافا بە ئیلهام وەرگرتن لە مارکس و بە یارمەتی ئالتووسێر و ماشێری بیرۆکەی "داهێنان"ی لابردو لە باتی ئەوە "بەرهەم هێنان"ی دانا. بەڵگەی ئەم کارەش ئەوەیە کە بۆ نیشانە ناسییەکەی کریستافا "ئەدەب لە گۆڕێدا نییە" و بەجێی ئەوە بەرهەم هێنانی نووسین گرنگە؛ وێڕای ئەمانەش: نیشانە ناسیەکەی کریستافا شتێکی تازەی بەرهەم نەهێناوە جگە لەوەی پێداگرییەکی دووبارەی هەبووە لەسەر "بڕیاری بوونی نیشانەکان و شەقی نێوان دال و مەدلول". بەڵام مۆدێلێکی تازەی پێشنیار کردووە کە دژ بە تیۆری ژێنۆتێکست و فینۆتیکستە؛ مەبەست لە ژێنۆتێکست ئەو ئاستەیە کە دەق دێتە بەرهەم و مەبەست لە فینۆتێکست ئەو ئاستەیە کە نووسینی دەقەکە تەواو دەبێ.

بیرۆکەی "نێوان دەقی"، کە بەیەکێ لە هەرە گرنگترین چەمکەکانی ئەم تیۆرانە ئەژمێردرێ، بۆتە هۆی ئەوە کە ئێمە داهێنانی ئەدەبی رەت بکەینەوە لەبەر ئەوەی هەر بەرهەمێک وەکوو "کۆمەڵە وشەیەکی زۆر گەورە" لەبەرچاو دەگرین.

بەپێی بیروباوەڕی کریستافا لایەنە جۆراوجۆرەکانی بنەمای دەقێک، هەمان گۆڕانکاری و دووبارە خوێندنەوەی دەقەکانی دیکەیە. هەر بەم بۆنەشەوەیە کە کریستافا بایەخێکی ئەوتۆ دەدات بە ئەستەمیی بنەمای ئەدەبی لە دەقە کۆمەڵایەتی و مێژووییەکاندا. کەواتە، بنەمای ئەدەبی "لە کۆبوونەوەی کۆمەڵایەتیدا وەکوو بەشێکی پێویست لە دەقەکە دادەنرێ". بە واتایەکی تر، "نێوان دەقی" ئەو شێوەیەیە کە دەقێک "مێژوو دەخوێنێتەوەو خۆیشی دەخاتە نێو مێژووەکەوە".

تیۆرەکانی ژولیا کریستافا لە کتێبێکدا بەناوی لێکۆڵینەوەیەک لەسەر شیکاریی نیشانەکان[19] (*1969*) کۆکراونەتەوە و بناخەکانی نیشانە ناسیی هاوچەرخی فەرەنسی دەست نیشان دەکەن. هەروەها، لە وتارێکدا بەناوی "هێزەکانی ترس"[20] (*1980*) تیۆرێکی لەسەر سوژە و ئەدەب داناوە؛ لە وتاری ناوبراودا بەشێوەیەکی راستەوخۆ لەژێر کارتێکردنی زمانی دەروون شیکردنەوەکانی لاکان دایەو خوێندنەوەیەکی یەکجار نیاردە ناسانەی[21] هەیەو لە ئەنجامدا پێی وایە کە نیشانەناسی بەجۆرێ وەکوو "سەفەرکردن بەرەو کۆتایی شەو"ە[22].

رەخنەگرێکی دیکەی کۆمەڵەی تێل کێل ژان ریکاردۆوە کە هاوکات بەیەکێ لە بیرداڕێژانی رۆمانی نوێیش لە قەڵەم دەدرێ. بە گوێرەی وتەکانی ئەم رەخنەگرە، ئەدەب جیهان پیشان نادات، بەڵکوو کردەوییێکی "بەرهەم هێنانەوەیی"[23]یە؛ هەروەها، نووسین داهێنانی تاکە کەسێک نیە بەڵکوو بەیانێکی تایبەتیە لە "نووسینێکی گشتی".

رەت کردنەوەی داهێنەرو خولقێنەر ئەو لایەنە تایبەتیەی ئەندێشەی هاوچەرخ پیشان دەدات کە لە "مەرگی مرۆڤ"[24] و تاکەکەس و سوژەدا ئاماژەی بۆ کراوە. لە ئاوا کاتێکدایە کە ریکاردۆ دەیەوێ ئەم خاڵە بسەلمێنێ کە مرۆڤ "نە لەبەرئەوەی کە جیهان پیشان بدات و نە بە هۆی ئەوەی کە دۆخی دەرونی خۆی دەربڕێ دەست بۆ نووسین دەبات، بەڵکوو دەنووسێ تاکوو لە رێگەی وشەکانەوە لەگەڵ وشەکاندا کایە بکات: وشەکان دەبنە بەدی هێنەری بەرهەمی ئەدەبی".

نیشانەناسیی فەرەنسی زۆر دژوار و شێواوە. ژێ. سێ. کۆکێ[25] و چەند پسپۆڕێکی تری لایەنگری

گریماس لەم بارەیەوە بەیاننامەیەکیان نووسیوەو ناویان ناوە: نیشانەناسی، قوتابخانەی پاریس(1982)[26]. لەناو سەرجەم لێکۆڵینەوە بەرچاوەکانی ئەم بوارەدا بایەخی سەرەکی دەدرێتە ئەو بەرهەمانەی لەسەر رێبازە رەخنەییەکەی گریماس نووسراون؛ هەروەها وتارەکانی لویی ماریو[27] و ئاندرێ میکێ[28] و وەرگێڕانی کتێبەکەی ریفاتێر بەناوی نیشانەناسیی شعر(1983)[29] بۆ سەر زمانی فەرەنسی بە نموونەی بەرهەمی کاریگەر دادەنرێن.

## بوتیقای فەرەنسی

### جێگۆڕکێی زانستی کەلام

لە ساڵی **1960** لەم لاوە بوتیقا لە باسە رەخنەییەکاندا دووبارە لەدایك بووەو جارێکی تر سەری هەڵێناوە. بەڵام پێویستە بەو مانا تایبەتیەی لە سەدەی بیستەمدا وەدەستی هێناوە چاو لەم وشەیە بکرێ، واتە ئەبێ گرنگی بدرێتە مانا جوانی ناسانەکەی نەك مانا ئەرەستوویەکەی. بەراستی زانستی کەلام ئەورۆکە گۆڕانکارییەکی مەزنی بەسەر تیۆری ئەدەب یان "بوتیقا"دا هێناوە. هەرچەند لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمدا زانستی کەلام لەبەر پەرەسەندنی مێژووی ئەدەبی پەیتا پەیتا لەناو چوو، بەڵام لە کۆتایی سەدەی بیستەمدا دیسان هاتۆتە ناو باسە رەخنەییەکانەوە. ژمارەیەکی زۆر بابەت و وتار لەم بارەیەوە بەم دواییانە نووسراون کە بایەخێکی تایبەتییان داوەتە شیکاریی رۆمان.

دیارە لەم لێکۆڵینەوەیەماندا ناتوانین سەرجەم بوتیقای هاوچەرخی فەرەنسی بەهەموو لایەنەکانیەوە بپشکنێین؛ هەر بەم بۆنەشەوە تەنیا ئاماژە بۆ چەند بوتیقازانێکی هەرە گرنگ و بەنێو بانگ دەکەین و هەوڵ دەدەین بیرو راکانیان بە رێك و پێکی بناسێنین و خاڵە هەرە گرنگەکانی تیۆرەکانیان دەست نیشان بکەین.

### تۆدۆرۆف

تۆدۆرۆف قوتابی و وەرگێڕی فۆرمالیستە رووسیەکانە و لەو بەرهەمانەی کە لە ساڵی **1964** تا **1969** نووسیویەتی و پاشان لە قەوارەی کتێبێکدا بەناوی بوتیقای پەخشان (*1971*)[30] کۆی کردوونەتەوەو ویستوویەتی بە یارمەتیی پۆلێن کردنی بۆچوونە لێك جیاوازەکان جارێکی تر بەسەر کارکردەکانی گوتاری ئەدەبیدا بچێتەوە. بە باوەڕی تۆدۆرۆف شیکاریی چیرۆك "هەمان بەراوردکردنی بەشە بەرچاوەکانی گوتارە: وەك ناوی تایبەتی، کردارو ئاوەڵناو" کەواتە، زمانی ئەدەبی لە رێگەی پەیوەندی لەگەڵ راستیدا نەهاتۆتە بەرهەم و تەنیا بە بۆنەی یاسا تایبەتیەکانی خۆیەوە خولقێندراوە. تۆدۆرۆف بەشە بەرچاوەکانی رێزمان بەسەر چیرۆکە ئەدەبیەکاندا دادەبەزێنێ و وەکوو کۆمەڵە وشەیەك دایاندەنێ کە خەریکی گێڕاندنەوەی جیهانن. کەواتە، باسەکە بریتیە لە وەسف کردنێکی ورد و راستەقینە نەك راڤەکردن[31].

سەرەڕای ئەمانەش، پێویستە ئاماژە بۆ ئەو گۆڕانکاریە فیکریەی تۆدۆرۆف بکرێ کە لە بەرهەمێکدا بەناوی رەخنەی رەخنە (*1974*)[32] باسی لە سەر کردووە. لە کتێبی ناوبراودا تۆدۆرۆف وادیارە خەریکە وردە وردە لە فۆرمالیزم دەکشێتەوە و بەرەو ئەم بیرۆکەیە هەنگاو هەڵدەگرێ کە ئەدەب سەر لەبەر "بونیادنان" و "گەڕان بە شوێن راستییەکان"ە.

### ژێرار ژێنێت

یەکەمین نووسراوەکانی ژێنێت، کە لە دووتوێی کتێبەکەیدا بەناوی وێنەکانی *I* و وێنەکانی *II*[33] کۆکراونەتەوە، لەسەر زانستی کەلام بونیادنراون، بەڵام بەراستی ئەمە کتێبی وێنەکانی *III*( *1972*)[34] بوو کە ژێنێتی وەکوو مەزنترین نوێنەری بوتیقای

نوێ بە جیهان ناساند. هەروەها، ئەکرێ بوترێ ژێنێت بەم دواییانە ئیمپراتووریی رەخنەی رێبەری کردووە!

بەرهەمی ئەدەبی، بۆ رەخنەگرێك وەك ژێنێت، پێش هەموو شتێك وەکوو چوارچێوەو سیستەمێك لە نێشانەکان دادەنرێ، بە بیروبڕوای ژێنێت کاری هەرە سەرەکیی رەخنە ئەوەیە کە دووبارە بگەڕێتەوە بۆ "دەق":

رەنگە رەخنە تا ئێستا هیچ کارێکی گەورەی نەکردبێ، لەوانەشە نەیەوێ وەها کارێك بکا؛ سەرەڕای هەموو ئەمانەش، وەها ویستێك ئێمە ناچار دەکا کە جارێکی تر سەرجەم بەرهەمەکە، یان لانی کەم چەند بەشێك لە بەرهەمەکە وەکوو "دەق" بخوێنینەوە؛ واتە وەکوو بەشێك لە ئەندامانی لەش. هەروەك ئەزانین، ئەوکاتەی نووسەر خەریکی نووسینەو خوێنەریش دەخوێنێتەوە لە شوێنێکی دژوارداو لەسەر لاپەڕەی کتێبەکە پێکەوە پێوەندی ساز دەکەن و تێکەڵی یەکدی دەبن.

هەرچەند توێژینەوەکانی ژێنێت لەسەر زانستی کەلام دامەزراوە بەڵام زانستی هونەری شیعر یان بوتیقاشی لێکداوەتەوەو بەم شێوەیە پێناسەیەکمان لە بوتیقای نوێ دەداتێ:

لانی کەم بابەتەکە بریتییە لە پێداچوونەوەی سەرجەم شێوەو چەشنە ئەدەبیەکان، بەو مەرجەی زانستی کەلام و زانستی شیعری سەردەمی کلاسیك لە بەرچاو بگیردرێ؛ واتە، دۆزینەوەو پشکنینی سەرجەم شێوە جۆراوجۆرەکانی گوتار.

لە لێکۆڵینەوەیەکیدا بەناونیشانی گوتارەکانی چیرۆك[35] کە بە بەشێکی بنەڕەتی کتێبی وێنەکانی *III* دادەنرێ، پێشنیاری بۆچوونێکی تایبەتی بۆ شیکردنەوەی رۆمانی گەڕان بەدوای سەردەمی رابردوودا[36] داوە. لێرەدا مەبەست تەنیا خوێندنەوەی رۆمانەکە نییە، بەڵکوو خاڵی گرنگ ئەو "رەوشتە شیکاری"یەیە کە لە بابەتە بچووك و تایبەتیەکانەوە دەست پێدەکات و بە بابەتە گەورەو گشتیەکان کۆتایی دێ. ژێنێت لەم بەرهەمەیدا سێ توخمی جیاوازی دەست نیشان کردووە و بۆ هەر کامێکیان پێناسەیەکی کورتمان دەداتێ: "مێژوو" کە ناوەرۆکی گێڕەوەییە، "چیرۆك" کە مەدلوول یان دەقی گێڕەوەییەو خودی "گێڕانەوە" کە کردەوەی بەرهەم هێنەرە گێڕەوەییەکەیە.

لە لایەکی ترەوە، بە لەبەرچاو گرتنی چیرۆك وەکوو "دەربڕینی کردەوە"، تۆدۆرۆف لەسەر ئەو باوەڕەیە کە سێ بەشی گەورەمان لە هەر گێڕانەوەیەکدا هەیە: کات، شێوەو بیچم. "کات" پیشاندەری نەزمی کاتی و بەشوێن یەکدا نووسینی رووداوەکانی نێو چیرۆکەکەیە، هەروەهاش پێوەندیی نێوان کاتی خەیاڵی و کاتی خوێندنەوە دەخاتە روو. "شێوە" روانگەو بابەتەکانی نێو چیرۆکەکەشی دەکاتەوەو "بیچم" ئاماژە بۆ گیروگرفتەکانی گێڕانەوە دەکات وەك ئەوەی لە چیرۆکێکدا روانگەی یەکەم کەس یان سێهەم کەس بەکاربهێنرێ.

ئەگەرچی ژێنێت لە بەرهەمێکی تریدا بەناوی گوتارە نوێکانی چیرۆك[37] (*1983*) دیسان باسی لە گرفتەکانی "کات"، "شێوە" و "بیچم' کردووە، بەڵام شتێکی تازەی خستۆتە سەر ئەو باسانە کە لە بارەی هەلومەرجە جیاوازەکانی گێڕانەوەوەدایە. هەروەهاش، بە جێگەی "ماوەی خوێندن" بیرۆکەی "سسورعەتی خوێندن"ی چیرۆکی داناوە: هەر لاپەڕەی بەرهەمێك وەکوو ئوجین گراند[38] نەوەد رۆژ دەگرێتەوە، بەڵام بەرهەمێك وەکوو گەڕان بەدوای سەردەمی رابردوودا پێنج رۆژ دەگرێتەوە.

سەرەنجام لە کتێبی پالیمپسێست[39]دایە کە ژێنێت بیروراکانی خۆی لەسەر پێوەندی نێوان دەقەکان دەردەبڕێ. ئەم پێوەندییانە کە پێنج دانەن بریتین لە: نێوان دەقی، دژەدەقی[40]، ئەوپەڕی دەقی،[41] سەردەقی[42] و ژوور دەقی[43] کەواتە،

کتێبی ناوبراو زیاتر تیشکی خستۆتە سەر ئەو بەرهەمانەی کە بە شێوەیەك گۆڕانکاریو لاسایی بەرهەمە پێشووەکانن (وەك پارۆدی و پاستیش)[44].

## بوتیقای ریفاتێر[45]

مشیل ریفاتێر دەسەلاتی بێبەشداریی زمانەوانی رەت دەکاتەوە. لە نیشانەناسیی شیعردا (وەرگێڕانی فەرەنسی، *1983*)، بۆ ئەوەی گوتاری شیعری شی بکاتەوە لە شێواز ناسیی کلاسیك و تەنانەت بونیادیش دوور دەکەوێتەوەو بە جێگەی ئەوانە توێژینەوەکانی خۆی تەنیا لەسەر نیشانەناسی بونیاد دەنێ:

بوتیقای فۆرمالیستی، وەك زانستی کەلام، هێشتا نەیتوانیوە بەلگەی ئەوەمان بداتێ کە بۆچی لەسەر هێندێ شت وەك ژمارەی هونەرەکان پێداگری دەکات و چاوپۆشی لە بڕێ ڕووداوی گرنگی دیکە دەکات. زانستی نیشانەناسی، بە پێچەوانە، ئەو قازانجەی هەیە کە لانی کەم لەسەر دینامیزی بەرهەم هێنانی مانا لە شیعردا قسە و باس دەکات و پێوەندییەکانی نێوان سیستەمەکانی نیشانەکان، یان باشتر بلێین خودی نیشانەکان، بە شێوەیەکی مانادار دەپشکنێ.

ریفاتێر لە شیکارییە بەرچاوەکانیدا دەیەوێ لە دەقە هەرە دژوارو گیروگرفت سازکەرەکانی شیعری فەرەنسی بکۆڵێتەوە (وەك مالارمە، نێلوار، لۆترێمۆ و نووسراوە ئۆتۆماتیکەکانی سوریالیستەکان). بە گوێرەی وتەکانی ریفاتێر، شاراوەیی لەچەند دەقە شیعرییەکی دیاری کراودا لە روانگەی تیۆری مێمیسیس و سێمیۆسیسەوە[46] بۆتە هۆی وەدی هاتنی چەند جیاوازییەکی ئاشکرا لە نێوان راڤەو هەلسەنگاندنەکاندا.

"ئەمە بە راستی شەپۆلێك لە شتە تاریك و نادیارەکان و شەپۆلێك لە گیروگرفتەکانی راڤەکردن لە ئاستی میمێتیکدا وەدی دێنێ کە ئاستی سیمیۆتیکش دەگرێتەوە کە بۆخۆی چوارچێوەیەکی مانادارى تایبەت بە دەقە، بەلام کلیلی تێگەیشتنی کێشەکە دیسان لەناو خودی دەقەکەدایە".

ریفاتێر لە بەشی یەکەمی کتێبی نیشانەناسیی شیعردا لەسەر جیاوازی نێوان زمانی شیعر کە گوتارێکی تایبەت بە واتاکانەو زمانی رۆژانە پێداگری دەکات: هەروەها لەسەر ئەو باوەڕەیە کە شیعر چەمکەکان بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ دەردەبڕێ. بە کورتی، شیعر شتێکمان پێ ئەلێ و شتێکی دیکەی بەلاوە مەبەستە.

## رەخنەی ژنێنتیکی

رەخنەی ژنێنتیکی لە ماوەی دە سالی رابردوودا سەرکەوتنێکی بەرچاوی وەدەست هێناوە. رێبازە جیاجیاکانی رەخنەی نوێ توانیویانە تا رادەیەك شتە ونبووەکان بدۆزنەوە وەك: رەش نووسەکان، دەست نووسەکان و نەوتراوەکان. بەلام، بێگومان لێکۆلینەوە لەسەر چۆنیەتی لە دایك بوونی بەرهەمێك شتێکی تازە نییە و هەر لە سەدەی نۆزدەهەم بەم لاوە رەخنەگران ویستوویانە لە رازی "دامێنان لە کاتی لە دایك بوون" تێبگەن؛ بەلام رەخنەگرە ژنێنتیك زانەکانی ئەم دواییانە بەشێوەیەکی دیکە لەگەل دەق هەلسوکەوت دەکەن. هەلبەت مەبەست لەم قسانە ئەوە نییە کە دووبارە بگەڕێینەوە بۆ بەرهەمەکانی کەسێکی وەك لانسۆن[47]، هەرچەند شکی تێدا نییە لانسۆن لە بواری رەخنەی ژنێتیکیدا چەند لێکۆلینەوەیەکی دیاری ئەنجام داوەو هەتا ئێستا بایەخیان هەیە، چونکی لانسۆن بە وردی رەش نووسەکان و گۆڕانکارییەکان و مانەوە یان نەمانی دەقەکانی لە مێژوودا خستۆتە بەر توێژینەوەکانی خۆی و هەروەها بەرهەمی نووسەرانی لە قۆناغە جیاجیاکانی دامێناندا پشکنیوە.

بەلام، زۆربەی کات خالی هەرە گرنگ دلوەری کردنی بایەخەکانی (ئەو سەردەمە)یە. ژنێنتیك زانە مۆدێرنەکان چاوپۆشی لە رەوشتە کلاسیکەکانی

زانستی ژێنێتیك دەكەن و لەجیاتی ئەوە بەجۆرێ گرنگی دەدەن بە "شیكردنەوەی دەروونی رەش نووسەكان". هەروەها زیاتر دەیانەوێ لەسەر گوتاری نەستی مرۆڤ باس بكەن كە لە رەش نووسەكاندا وەكوو "یەكەمین چركە"ی داهێنان دەردەكەوێ. رەخنەگرانی ژێنێتیك زان سەرو كاریان لەگەڵ گرفتەكانی سانسۆر و لابردنی هەندێ وشە كە لە رەش نووسەكاندا وەبەرچاو دەكەون دایە؛ كەواتە بۆ ئەوان "پێش دەق" دەبێتە نموونەی سەرەكیی پێداچوونەوە. لێرەدا بەو ئەنجامە دەگەیین كە ژێنێتیك بە راستی یارمەتیی پۆتیقا دەدات. لەوەها كاتێكدا ئەبێ ئامارە بۆ بەرهەمەكانی دێبرێ - ژێنێت[48] بكرێ، بەتایبەتی دوو كتێبی وتارگەلی رەخنەی ژێنێتیكی[49] و فلوبێر لە بەرهەمدا.[50] كە بە بەرهەمی سەرنج راكێش و گرنگ لەم بوارە دادەنرێن..

## تیۆری بنەماشكێنی[51]

رێبازی رەخنەی "بنەماشكێنی" یەكێ لە دیاردە هەرە سەیرو سەمەرەكانی تازەگەرییەكانی ئەم دواییانەی رەخنەی هاوچەرخە كە لەسەر بیروڕا فەلسەفییەكانی ژاك دریدا بونیاد نراوە.

ئەم رێبازە لە وڵاتە یەككرتووەكانی ئامریكا و بەتایبەت لە زانكۆی یەل دا پەرەی سەندووە. لایەنگرانی بنەماشكێنی، وەك روخسارخوازەكان و بوتیقازانەكان سەرو كاریان لەگەڵ گرفتە تەكنیكیو كەلامییەكانی دەق دایەو هەر باسی خولقێنەر" و "مێژوو" ناكەن. هەروەها بە پێچەوانەی بنەماخوازەكان، دەیانەوێ سەرجەم ئەو هونەرە كەلامییانە ئاشكرا بكەن كە لە دەقەكەدا دژایەتییەكی بەرچاویان خولقاندووە؛ واتە، هونەرەكانی نێو دەقەكە شتێكی دژ بە خودی دەقەكە دەڵێن. ئەمانە هەموو بەجۆری باس لە كێشەی نێوان ئاوەز و كەلام دەكەن: مرۆڤ هیچ كاتێك بە رووناكی و راستی ناگات، ئەگەر كوێر بێ رەنگە باشتر بتوانێ دەوروبەری خۆی ببینێ.

هۆگرانی رێبازی بنەماشكێنی ئەو "یەكێتی"یە رەت دەكەنەوە كە روخسارخوازەكان لەناو دەقدا بە دوایدا دەگەڕێن، چونكە كاتی وا هەیە سەرجەم پارەكانی نێو بەرهەمەكە هیچ چەشنە پێوەندییەكیان لەگەڵ ئەو "یەكێتیی"یەدا نییە. لە بنەماشكێنیدا بەردەوام "یەكێتی"یە پێشووەكان و تەوەرە بونیادییەكان و تەنانەت دەلالەتیش هەڵدەوەشێنرێتەوە.

پێناسەكردنی خوێندنەوەیەكی بنەماشكێنانە كارێكی زۆر ئەستەمە. ئەوەی راستی بێ ئەوەیە كە رەخنەگری بنەماشكێن بە هیچ كلۆجێك لەسەر مەبەست یان خولقێنەری دەقەكە باس ناكات. بنەماشكێنەكان نایانەوێ لەسەر یەككرتوویی دەقەكە بكۆڵنەوەو بەڵكوو زیاتر وەكوو پاسایەك گرنگی دەدەن بە نەبوونی یەككرتووییەكی گشتی. رەخنەگرێكی بنەماشكێن ئەوەمان پیشان دەدات كە دەقەكە خەریكە لەگەڵ خۆیدا كایە ئەبەكات. لە بنەماشكێنیدا، دووانە لێكدژەكان لە پاڵ یەك دادەنرێن و پرسیار لە شتە بارەكان دەكرێ و دژایەتییەكانی نێو دەقەكە ئاشكرا دەكرێن. بنەماشكێنی یانی گەڕان بە شوێن مەنتیقێكی ئاپۆریایی كە لەوێ لە جیاتی ئەوە كێشەكان شی بكرێنەوە تەنیا ئامارەیان بۆ دەكرێ. بنەماشكێنی كە لەناو بازنەیەكی هێرمۆنیتیكیدا دەژی تەنانەت دژواری و دژایەتییەكانی نێو ئەو بەرهەمە رەخنەییانەش دەست نیشان دەكات كە پێیان وایە گەیشتوونەتە كۆتایی شیكردنەوەكانیان؛ هەروەها رەخنە لەو بەرهەمە رەخنەییانەش دەگرێ كە پێیان وایە لە شوێنە تاریك و داپۆشراوەكانی دەقەكان تێگەییشتوون و هەر بەم بۆنەشەوە كۆتایی بە هەڵسەنگاندنەكانیان دێنن.

## ناوەکان و پەراوێزەکانی وەرگێڕ:

1-La critique fomaliste.

2-Greimas.

3-Benveniste.

4-La rhetorique.

5-La poetique.

6–فۆرمالیزاسیۆن، یان "بەروخسارکردن"ی بەرهەمێك واتە ئەو بۆچوونە رەخنەییە کە تەنیا گرنگی دەداتە روخسار یان شێوەی بەرهەمەکە و چاوپۆشی لە ناوەرۆکەکەی دەکات.

7–دەرهەست یان (abstract) دانراوەی چیرۆکنووس و هاوڕێی خۆشەویستم، مەنسور تەیفوریە، هەروەهاش بۆ زاراوەی (concrete) "بەرهەست"مان پێشنیار کردووە.

8-Tel Quel.

9-Poetique.

10-Change.

11-Literature.

12-La Semantique Structurale (1966).

13–ڤلادیمیر پراپ، رەخنەگری فۆرمالیستی کە لە کتێبی مۆرفۆلۆژیی چیرۆکە فۆلکلۆرییەکان (1929)دا لەسەر ئەو باوەڕەیە کە لە نێوان سەرجەم چیرۆکە کۆنەکانی روسیادا لێك چوونگەلێکی زۆر وەبەرچاو دەکەوێ؛ بۆ نموونە، بنەمای ئەو چیرۆکانە بەیەك شێوە دارێژراوە.

14-“actant”.

15-“actanciel”.

16–تێل کێل، گۆڤارێکی ئەدەبی و پێشڕەو بوو کە لە ساڵی 1960دا لە فەرەنسا دامەزراو چەند نووسەرێك بە ئایدیۆلۆژییەکی تایبەتەوە بەڕێوەیان دەبرد. ئەم گۆڤارە یەکەمین بڵاوکراوەیە کە بەشێوەیەکی بنەڕەتی و رێك و پێك ئەدەبی بە مارکسیزم و دەروون شیکردنەوەوە گرێ دەدا. ئەم گۆڤارە بەسەر چوار قۆناغی جیاوازدا تێپەڕیوە: قۆناغی یەکەم (1960–1963)، کە قۆناغی جوانی ناسییە و زۆرتر بایەخ دراوە بە رووەکان و جوانییەکانی زمان. فیلیپ سولێر و ژان ئودرن هالیە لەم دەورەیەدا چالاکییان دەنواند. لەم قۆناغەدا پێڕەوی لە بنەواشەیەکی رێك و پێك نەدەکرا و تەنیا پێوەندی لەگەڵ نوێنەرانی رۆمانی نوێ وەك ژۆرژ باتای و فرانسیس پۆنژ هەبوو.

قۆناغی دووەم (1963–1966) کە گرنگی هەرەزۆر دراوە بە فۆرمالیزم. دوای کێشەیەکی ناوخۆیی سەرەنجام فیلیپ سولێر، ژان پیرفی و ژان ریکاردۆ بەرەو لای لێکۆڵینەوەی روخسارخوازانەدا کێشران. لەم قۆناغەدا بایەخێکی زۆر دەدرا بە سوسوور، فرۆید و فۆرمالیستەکانی رووس، بە ناساندنی نوسەرانێك وەك ساد، دانتە، ئامۆن، مالارمە، ئارتۆ، باتای، سولێر، ریکاردۆ و مارسسن پلند، رەخنەی ئەدەبی دەستی کرد بە رەخنەگرتن لە کلتووری رۆژئاوایی.

قۆناغی سێیەم (1967– 1971) قۆناغی چوون بەرەو لای تیۆرە. لەم دەورەیەدا هەوڵ درا تاکوو هەر لە سەرەتاوە دەقە ئەدەبییەکان بەتیۆرەکانی مارکس و فرۆیدەوە گرێ بدرێن و نووسراوەکان لەگەڵ مانایەکی تایبەتی فەلسەفیدا تێکەڵ بکرێن. لەم قۆناغەدا بەرهەمەکانی ژاك لاکان، ژاك دریداو ژولیا کریستافا ئاراستە کرا. ئەم گۆڤارە لایەنگرییەکی زۆری لە حیزبی کۆمۆنیست دەکرد. رووداوەکانی مانگی مەی ساڵی 1968 بووە هۆی ئەوە تاکوو نووسراوەکان رەنگ و بۆ[illegible] سیاسی لەخۆ بگرن، بەڵام کێشەی پێوەندی سازکر[illegible] لەگەڵ راپەڕینی کلتووریی چین بووە هۆی وەدی هاتنی ناکۆکی لە نێوان ئەندامە ناوەکی و دەرەکییەکانی گۆڤارەکەدا.

قۆناغی چوارەم لە ساڵی 1971 بەم لاوە دەستی پێ کرد. لێرە بەم لاوە چیرۆك چووە ژێر کارتێکردنی جەیمس جۆیس و بەرهەمەکانی جۆیس کاریگەرییەکی زۆر لەسەر چۆنیەتی گۆڤارەکەدا دادەنێن. بە کورتی، مەبەستی ئەم گۆڤارە زیندووکردنەوەی هێزی راپەڕینی سەرەتایی زمانی ئەدەبییە. (سەرچاوە: فەرهەنگی لارووسی گەورە).

17-Theorie de nsemble (1968).

18-"intertextualite".

19-Recherche pour une semanalyse (1961).

20-"pouvoirs de l'horreur" (1980).

21-phenomenologique.

22-Voyage au bout de lanuit. نــاری رۆمانێکی سێلین- یشە

23-"Productrice".

24-مەرگی مرۆڤ (La mort de l'homme) ئاماژەیە بۆ وتەکەی میشل فۆکۆ لە کۆتایی شەستەکاندا. ئەم دروشمەی فۆکۆ رەنگ دانەوەی هەمان دروشمی نیچەیە کە لە سەدەی نۆزدەهەمدا بانگەوازی بۆ دەکرد.

25-J. C. Coquet.

26-Semiotique, L' ecole de Paris (1982).

27-Louis Morio.

28-Andre Miquet.

29-La Semiotique de la poesie (1983).

30-Poetique de la prose (1971).

31-واتە، بە گوێرەی قسەکانی تۆدۆرۆڤ ئەدەب تەنیا جیهان وەسف دەکات و هیچ جۆرە راڤەکردنێکی لە جیهان نییە.

32-Critique de la Critique (1974).

33-Figures I et II.

34-Figures III.

35-Discours du Recit.

36-A la recherche du temps perdu.

37- Nouveau Discours du Recit، پێویستە ناوی ئەم بەرهەمە دوایەی تۆدۆرۆڤ بە شێوەی "گوتارەکانی چیرۆک"ی نوێ بنووسرێ کە لێرەدا بە ئەنقەست بەو شێوەیە نووسراوە.

38-Eugenie Grandet.

39-Palimpsests (1982).

40-Paratextualite.

41-metatextualite.

42-architexualite.

43-hypertexualite.

44-پارۆدی ئەو بەرهەمە ئەدەبییە کە بە بڵچوونێکی ترەوە لاسایی بەرهەمێکی تر دەکاتەوەو هونەرێکی ئەدەبییە، بەم پاستیش (Pastiche) ئەو بەرهەمەیە کە نووسەرەکەی بە بێ هیچ روانگەیەکی ئەدەبی یان فکری لاسایی بەرهەمێکی تر دەکاتەوەو هونەرێکی ئەدەبی نییە.

45-La Poetique de Riffaterre.

46-میمێسیس، بەمانای لاسایی کردنەوە کە یەکەم جار ئەفلاتوون و دوایی ئەرەستوو ئاماژەیان بۆ کردووە؛ سیمیۆسیس هەمان زانستی نیشانەناسییە. لێرەدا مەبەست ئاماژە کردن بۆ هونەرێکی کۆن و هونەرێکی نوێیە.

47-لانسۆن (Lanson) رەخنەگرێکی ژێنێتیکی سەدەی نۆزدەهەمە.

28-Derbry- Genette.

49-Essais de Critique genetique (1979).

50-Flauber a L'oeurre (1980).

**سەرچاوە:**

Kahnamoulpour, Jaleh. La Critique Litteraire. (Tehran: SAMT, 1995). PP. 205- 230.

# تیۆرەی ئاگاداری


■ ئەبولحەسەن نەجەفی

● و. لە فارسییەوە: عەتا نەهایی


*ئەم نووسینە دەقی لێدوان و وتاربێژی ئەبولحەسەن نەجەفی مامۆستای زانکۆو، رۆشنبیرو رەخنەگری هاوچەرخی ئێران دەربارەی تیۆرەی راگەیاندن "Information Theory" لە رەخنەو نرخاندنی بەرهەمی ئەدەبی و هونەریدا، کە لە کۆڕێکی ئەدەبی هۆڵی کەسرای تاران لە 1370/10/28 پێشکەشی کردووە. شریتی ئەم لێدوان و پرسیارو وەڵامانە لەلایەن ئازەر بەهرامییەوە دەقاودەق پیادە کراوەو لە ژمارەی یەکی گۆڤاری کارنامە ساڵی 1377 بڵاوکراوەتەوە.*

*شایانی باسە وەرگێڕی کوردی بەهۆی گرینگی و لەهەمان کاتدا سادەیی بابەتەکە جگە لە کورت کردنەوەی چەند پەرەگراف و قرتاندنی چەند پرسیارو وەڵامێك کە پەیوەندی راستەوخۆیان بە ئەدەبی فارسی و نموونەی شیعری فارسییەوە بوو، دەقەکەی وەك خۆی وەرگێڕاوەتەوە. بۆیە لە هەندێ شوێندا دووبارەگۆیی و سیستی ناتەواوی لە رستەکاندا بەدی دەکرێ کە ئەمەش تایبەتی هەمو دەقێکی وتاربێژی و پرسیارو وەڵامێکی شفاییە.*

*78/1/22*

لەچەند مانگی رابوردوودا یەك دوو کتێب و چەند وتار دەربارەی تیۆرەی یاکۆبسن بڵاوبۆتەوە. (بۆ نموونە کتێبی رەخنەی ئەدەبی و تیۆرەی یاکۆبسن) و، گەلێ وتووێژی لەسەر کراوە. ئەگەرچی ئێستاو لێرە، وەك بابەتێکی تازە قسەی لەسەر دەکرێ، بەڵام ئەگەر بەهەڵە نەچووبێتم تیۆرەی یاکۆبسن لە ساڵی **1960** واتە سی ساڵێك لەمەوبەر، هاوکات لەگەڵ کۆمەڵێ تیۆرەی تر هاتۆتە ئاراوە. یەکێك لەو تیۆرانە، تیۆرەی ***Information*** بە زمانی ئینگلیزی، یان "ئینفۆرماسیۆن" بە زمانی فەڕانسە، کە من لە زمانی فارسیدا "اطلاع" (ئاگاداری) بە پەسەند دەزانم.

ئەم بابەتە سەرەتا لە زمان ناسیدا ئاراستەکراو، دواتر هاتە مەیدانی ئەدەبیشەوە. ئەوەندەی من بزانم لای ئێمە جگە لە یەك دوو وتاری زمان ناسیدا، تا ئیمڕۆ کەس ئاوڕی لێ نەداوەتەوەو، کەس قسەی لە سوودی ئەم تیۆرە بۆ هەڵسەنگاندن و نرخاندنی

بەرهەمی ئەدەبی و هونەری نەکردووە. یەکێك و بگرە سەرەکیترین هۆی پشت گوێ خستنی ئەم تیۆرە ئەوەیە کە تا رادەیەکی زۆر تێکەڵ بە زانستی ماتماتیك و فرمولەکانە، بۆیە ئەدیب و هونەرمەندان کەمتر خۆ لە قەرەی بابەتی وا دەدەن و تەنانەت تا رادەیەکیش سڵی لێدەکەنەوە. ئەوەی راستی بێ منیش لەم چەند رۆژەدا کە خۆم بۆ ئەم کۆبوونەوەیە ئامادە دەکرد، بیرم بۆ ئەوەچوو کە نابێ خۆ لە قەرەی کێشەگەلی ئاڵۆزی ماتماتیکی تیۆرەکە بدەم و ئەگەر بکرێ بە Common Scense وەها کە تێگەیاندنی پێویستی بە بەکارهێنانی فرمولەو، پسپۆڕیەکی ئەوتۆ نەبێ، لە بابەتەکە بدوێم. بۆیە تێدەکۆشم بەشێوەیەکی سادە باسی بکەم. ئەگەرچی نایشارمەوە لێدوانی قووڵ و زانستی دەربارەی ئەم تیۆرە، گەلێ ئاڵۆزو بەربڵاوە، بەو حاڵەش پێم وابێ لە ئەنجامی ئەم کورتە لێدوانەشدا بۆتان دەردەکەوێ ئەم بابەتە لە مەیدانی رەخنەی ئەدەب و هونەردا چەندە جێگەی سەرنج پێدانە.

ئێمەو بەتایبەت شارستانیەتی ئیمڕۆ، لە مابەینی دوو کردەی زەینی مرۆڤ، زۆرترین سەرنج بەیەکیان دەداو، ئەویتریان پشت گوێ دەخا. ئێستا بە نموونە هێنانەوەیەکەوە دەچمە جەرگەی باسەکەوە. ئەگەر لەچەند میوانێکتان گێڕابێتەوە، بۆ ئەوەی بەقەدەر میوانەکان کورسی لە دەوری مێزەکە بچنن، تاقە رێیەك کە بە بیرتاندا دێ ئەوەیە لای خۆتان بڵێن، میوانەکان ئەوەندە کەسن و دەبێ ئەوەندە کورسیان بۆ دانرێ. ئەمە کردە یان هەوڵێکی "تەجریدی" زەینی ئێوەیە. ئێمە وەها خوومان بەم کردە، یان هەوڵە تەجریدیە گرتووە کە کردەی دووهەممان لەبیرچۆتەوەو، پێمان وانیە زەین بتوانێ بەشێوەیەکی تریش بیر لەم مەسەلە بکاتەوە. ئەگەر لێتان بپرسم ئایا دەکرێ بەشێوەیەکی تریش بیر لە ئامادەکردنی کورسی بۆ میوانەکان بکرێتەوە؟ زۆریەتان دەڵێن: "نا". بەلام شێوەیەکی ئاسانتریش هەیە کە "تەجریدی" نیە. شێوەیەکی کردەوەیی (عملی) کە زاراوە بیانیەکەی "کۆنکرێتە". واتە لای خۆتان بڵێن: ئەمە کورسیەك بۆ عەلی، کورسیەك بۆ حەسەن، کورسیەك بۆ مەنیژەو.. ئێمە لەم شێوەدا بیر لەوە ناکەینەوە کە میوانەکان چەند کەسن و کورسیەکان دەبێ چەند دانەبن. بەڵکو راستەوخۆ لەگەڵ خودی مەسەلەکە لەگەڵ خودی سروشت و شتە بەرهەستەکاندا (عەینی) رووبەڕوو دەبینەوە. ئەمە سەرەتایی ترین کردەو هەوڵی زەینی مرۆڤەو، لە راستیدا ئەمە هەمان کردەو هەوڵە کە ئاژەڵیش ئەم جۆرە کێشەی پێ چارەسەر دەکەن. چونکا ئاژەڵ توانای ئەو کردەو هەوڵە "تەجریدیە"یان نیە.

جا با شکۆی نەشکێنین و پێمان وانەبێ لەبەر ئەوە ئاژەڵ دەرەقەتی ئەنجامدانی دێت، کەواتە نابێ ئێمە گوێی پێبدەین و کەلکی لێ وەربگرین. بۆ نموونە ئەگەر پشیلەیەك بێچوویەك لە پێنج بێچووەکەی لێ بزربێ، دەستبەجێ تێدەگا. دیارە پشیلە توانای بژاردنی نیە، بەڵکو بەشێوەی ئەو هەوڵە کۆنکرێتە سووسەی ونبوونی بێچووەکەی دەکا. وەك دەزانن ژماردن کۆششێکی زەینی مرۆڤە. کۆششێکی تەجریدی کە کۆمەڵگاو شارستانیەتی ئیمڕۆ، زیاتر لە هەمیشە ئێمەی بەرەو ئەو کۆششە راکێشاوەو لە هەوڵی کردەوەیی (عملی) دووری خستووینەتەوە. ئەمەش ئێمەی تووشی زیان کردووە..

کە دەڵێین 5 کورسی بۆ 5 میوان، ئەم پێنجە لە دنیای دەرەوەی ئێمە بوونی نیە. واتە لە دەرەوەی زەینی ئێمە 5 کورسی و 5 میوان 5 تابلۆ.. هەیە.

بەڵام خودی "پێنج" تەنها لە زەینی ئێمەدایەو شتێکی "تەجریدیە". ئەگەر بەچاکی سەرنج بدەین تێدەگەین، ژیانی ئیمڕۆ، ئێمەی لە شتەکان (اشیاء) دوورخستۆتەوەو، بەرەو تەجریدی بردووین. واتە لە نێوان ئێمەو سروشتدا بۆشاییەك پەیدا بووە. بۆشاییەك کە هەوڵی تەجریدیەکانی زەین پڕی کردۆتەوە. تەنانەت ئەم باسەی ئێستای ئێمەش، واتە باسی ئەدەب و هونەر، هەوڵێکی تەجریدیە. ئەفراندنی هونەری تەجرید نیە. ئەفراندن کردەیەکە وێڕای ئەم تەجریدە رووئەداو بەرەو لای شتەکانمان دەگەڕێنێتەوە، بەرەو لای جیهانی بەرهەست.

لە قوتابخانەو زانکۆکانیش، ئەوانەی بەهرەی هونەریان هەیە لە شتەکان و سروشتی شتەکانەوە نزیکن و ئەوانەی حەز لە زانست و ماتماتیك دەکەن، حەزیان لە "تەجریدە".

ئەڵبەت باس و لێکۆڵینەوەی هونەری شتێك جیاوازەو رەخنەی ئەدەبی و هونەری کردەیەکی تەجریدیە. بۆیە هونەرمەندان کەمتر خۆیان لە قەرەی رەخنە دەدەن و زیاتر حەز لە ئەفراندن و داهێنان دەکەن.

زمانیش لە قۆناغی یەکەمدا بابەتێکی "تەجریدیە" ئەوەی کە ناو لە شتەکان دەنێین تەجریدە. کاتێ لەبری خودی شتەکان لەگەڵ ناوەکانیان (وەك وشە) رووبەڕوو دەبینەوە. کاتێ دەڵێین کورسی، یان نان، یان مرۆڤ، یان هەر شتێکی تر، لە شت یان کەسێکی تایبەت نادوێین. بەڵکو مەبەستمان تێکڕای کورسیەکان، نانەکان، یان مرۆڤەکانەو، ئەمەش جگە لە کۆمەڵێ وشەو، پیتی پەیوەندی نێوان لایەنەکانی رستەو زمانە کە بە هیچ شێوەیەك لە دنیای دەرەوەی زماندا بوونیان نیە.

وەك هەندێك وردە واژەی وەك -کە- لە- وە- بۆ- .. کە تەنها ئەرکی پەیوەندی سازکردنی نێوان رستەکانیان لە ئەستۆیە. ئەگەر لە لاپەڕەی نووسینێك وردبینەوە، دەبینین بەشێکی هەرە زۆری وشەکان لە دەرەوە بوونیان نیە. واتە ناوی هیچ شتێکی بەرهەست نین. ئەو بەشەی دیکەش کە ناوی شتەکانن، ناوی گشتین و ئەمەش بە مانای "تەجرید" بوونیانە. (لێرەدا بەناچار کەمێك لە مەسەلەی زمان دوور دەکەوینەوەو ناوڕ لە بابەتێکی گرینگ دەدەینەوە) سەرەکی ترین هۆ بۆ ئەوە کە شیعر وەك بەرزترین تەقەلای زەینی مرۆڤ دەناسرێ، ئەوەیە کە شاعیر بە زاراوەی رۆژاواییان *Challenge* ێکی گەورە سازدەکا. ئەگەر ئەم هەوڵە لەگەڵ بەرهەمی هونەری وێنەگر، پەیکەرساز، یان مۆسیقارێك بەراورد بکەین، دەزانین کەرەسەی ئەو بەرهەمە هونەریانە (بەرد، رەنگ و ..) پێشتر تەجریدی نەبوون و لە دەرەوەی زەینی مرۆڤدا بوون. بەڵام کەرەسەی شاعیر وشەیەو، وشەش تەجریدیە. کەواتە شاعیران هەوڵ دەدەن لەم تەجریدانە شتی بەرهەست و کۆنکرێت سازبکەن و ئەمەش گەورەترین *Challenge* ێکە مرۆڤ تووشی دەبێ. کاتێك ئیمە وشە بەکار دێنین -چ لەئەدەبدا و چ لە زمانی رۆژانەدا- بۆ ئەوەیە ئاگاداریەك رابگەیەنین. بۆ نموونە ئەگەر هەواڵێکتان بە کەسێك راگەیاند، گریمانەتان ئەوەیە ئەو کەسە پێشتر ئەو هەواڵەی نەبیستووەو، بەهۆی ئێوەوە ئاگادار دەکرێ. یان ئەگەر بە کۆڵان یان شەقامێکدا رابووردن و تابلۆیەکتان دی کە ناوی ئەو کۆڵان، یان شەقامەی لێ نووسرابوو ئەوا ئاگاداریەکتان وەرگرتووە. سەیرو

گرینگ ئەوەیە کە ئێوە لە رابوردنی دووەمجار یا سێهەمجار بەو کۆڵان و شەقامەدا ئیتر ئەو تابلۆیە هیچ ئاگاداریەکتان ناداتێ. تەنانەت دوای چەند جار هەر خودی تابلۆکەش نابیندرێ.

من چاک لەبیرمە سالانی زوو، ئەوکاتەی منداڵ بووم لە ئەسفەهان هەموو رۆژێ بە بەر مزگەوتی شادا -کە یەکێك لە جوانترین بینا هونەریی و مێژووییەکانی ئەو شارە بوو- رادەبوردم. بێئەوەی سەرنجی بدەمێ یان کاشیە رەنگاورەنگەکانی ببینم. تا ئەوەی لە ئەسفەهان دوورکەوتمەوە دوای **25-30** ساڵێك کە چوومەوە، بەو ناوەدا تێپەڕیمەوە، سەرم لە جوانی مزگەوتەکەو، لەوەی کە بۆچی بە منداڵی ئەو جوانیانەم نەدیوە، سوڕما. بێگومان ئەمە لە بەرهەمی ئەدەبی و هونەریشدا روودەدا. چاك کۆکتۆ دەڵێ: "وشەکان بەهۆی چەند پات بوونەوە تۆزیان لێ دەنیشێ". هەروەها دەڵێ بە زمانیش لەبەر ئەوەی وشەکانی چەند پات دەبنەوە تۆزی لێ دەنیشێ و بۆیە مرۆڤ ناتوانێ لە وشەکان و لەچەمکەکانی تێبگا. بەلام شیعر سەرلەنوێ ئەم وشەو چەمکانەمان نیشان دەداتەوەو لێمان دەژیەنێتەوە. بەپێی ئەم بۆچوونەی ژان کۆکتۆ ئەگەر شیعر نەبوایە زمانیش دەمرد. جا با لەخۆمان بپرسین شیعر چۆن ئەو ئەرکە گرینگە بە ئەنجام دەگەیەنێ؟

گوتمان ئەگەر وشەیەك، یان چەمکێك لە زماندا پەیتاپەیتا دووپات ببێتەوە رادەی ئەو ئاگاداریە کە رایدەگەیەنێ جار لە دواجار کەمتر دەبێتەوە، تاوەکو ناوی سەر تابلۆی شەقام یان کۆڵانەکە فەرامۆش دەکرێ و نابیندرێ. ئەمە هیچ پەیوەندیەکی بەمانای وشەکانەوە نیەو، وشەکان بە پیت و بزوێن و دەنگەکانیانەوە. لە شوێنی خۆیاندا ماون. بەلام لە دووپات و چەند پات بوونەوەیاندا ئاگاداریان بۆ راگەیاندن پێنەماوە. نموونەیەکی تر.. ئەگەر لە رۆژێکی هەورو هەلای زستاندا کەسێك خۆی بە ژوورەکەتاندا بکاو بڵێ: "لە دەرەوە بەفردەبارێ". ئاگاداریەکی ئەوتۆتان ناداتێ. تەنانەت ئەگەر ئێوە لە ژوورێکی بێ پەنجەرەدا بوویێتن و بارشتی بەفریشتان نەدیبێ. چونکا لە رۆژی وادا ئێوە کەم و زۆر، چاوەڕوانن بەفر بباری. بەلام لە ژوورێکی هەتاو و هەساودا، ئەگەر بەهۆی گۆڕانکاریەکی جەویەوە لەپڕ بەفر دابکاو هەمان کەس هەواڵەکەیتان بداتێ، هەرچەندە ئەم هەواڵە هەمان هەواڵی پێشووە، بەلام ئێوە بەلاتانەوە سەیر دەبێ. بۆ؟ لەبەرئەوەی رادەی ئاگاداریەك کە ئەم هەواڵە بە ئێوەی رادەگەیەنێ، لە رۆژی تاوو ساردا زۆر زیاترە لە رادەی ئاگاداریەك کە لە رۆژی هەورو هەلادا رایدەگەیەنێ. بەپێی ئەم تیۆرە ئاگاداری پەیوەندی بە بیسەرەوە هەیە. رادەی ئاگاداری لە زاتی شتەکاندا نیە، بەلکو پەیوەندی بە رادەی چاوەڕوانی بیسەر لە وشەکان یان لە بابەتەکەوە هەیە. کەواتە ئەگەر کەسێك چاوەڕوانی بیستنی هەواڵێك بێ، رادەی ئاگاداریەك کە ئەو هەواڵە پێی رادەگەیەنێ کەمە.

ئەوەی گوترا، شتێك بوو کە هەموومان دەمانزانی و تەجرەبەی ژیانی رۆژانەشمان دەیسەلماند. بەلام ئەم بابەتە لە مەیدانی زستاندا هێندێك ئالۆزترە. پێش ئەوەی زمان ناسەکان ئاوڕ لەم بابەتە بدەنەوە. ئەندازیارانی تەلەفون و بروسکەو ئەم جۆرە پەیوەندیانە بەو دەرئەنجامە گەیشتوون کە رادەی ئاگاداری ئەندازە بگرن. چونکا کاتێ کار لەسەر بنەمای "نەبوونی حەتمیەت" بێ، ئەوەی نایزانین کە دەریارەی ئەو بابەتە بە ئێمە رادەگەیەندرێ زیاترە. ئەگەر ئێوە پوولێك هەڵدەن لە سەدا پەنجا ئەملا یان

ئەولای پوولەکە دەکەوێتە زەوی. بەڵام ئەگەر لەبری ئەو پوولە تاسی تاوڵە هەڵدەن رادەی ئاگاداریتان بۆ نیشتنی لایەکی زیاترە. چونکا بەسەر شەش رێ تێچوندا (احتمال) بەش دەکرێ، نەوەك دوو. کەواتە بێئەرەی ئاورێ جیدیمان لە وردەکاری باسە فەنیەکە دابێتەوە، بۆمان دەردەکەوێ بە شێوەیەك رادەی ئاگاداری بابەتێك ئەندازە بگرین.

لەم تیۆرەدا یەکەی رادەی ئاگاداری (بیت=*bit*) یان وەها کە ئەمریکاییەکان دەڵێ (بایت)ـە، لە دەزگایەکی دووبەشیدا، –بە مەرجێك هەرکام لەو دوانە لە بارودۆخی یەکسانی رووداندا بن، وەك هەڵدانی ئەو پوولە، یان هەڵدانی تەختەبەردێکی بچووك بۆ تەڕ نا وشك– رادەی ئاگادارییەك کە بە ئێمە رادەگەیەندرێ، یەك بیتە (*bit*). ئەمە کەمترین رادەی ئاگادارییە. بەڵام کاتێ ئەگەری روودان (احتمال وقوع) دەگاتە شەش، واتە کەسەکان یان بەشەکانی ئەو کۆیە (مجموعە) زیاد دەبێ، رادەی ئاگاداریشی هەڵدەکشێ. کەواتە لەهەر هەواڵ یان پەیامێکدا هەرچی ئەگەری روودانی بەشێك کەمتر بێ، رادەی ئاگاداری ئەو بەشە زۆرترو بە پێچەوانەوە، هەرچی ئەگەری روودانی زۆرتر بێ، رادەی ئاگادارییەك کە بە ئێمە رادەگەیەنێ کەمترە. بەو پێیە ئەگەری روودان (احتمال وقوع) بە پێچەوانەی رادەی ئاگادارییەوەیە.

هێندێ کەس دێن بەپێی رادەی ئاگاداری وشەکان، خانەبەندیان دەکەن و لەوەش سەیرتر، رادەی ئاگاداری پیتەکانیش پشت گوێ ناخەن. چۆن چۆنی ئەم کارە دەکرێ؟ با نموونەیەك بهێنمەوە.. ئەگەر ئێستا من بەئێوە بڵێم: "لە رێی هاتنم بۆ ئێرە هینێکم دی". پێویستە بڵێم چی یان کێم دی. ئەگەر بڵێم: "کابرایەکم دی". لەبەرئەوەی زۆر ئاساییە، هیچ ئاگادارییەکم بەئێوە رانەگەیاندووە. بەڵام ئەگەر بڵێم: "پەنگوئەنێکم دی". ئەمە هەواڵێکی سەیرەو رادەی ئاگادارییەکەی زۆرە. من لەم رستەدا لەبری "کابرا" یان "پەنگوئەن" هەر ناوێکی تر بەکار بێنم. بەپێی چۆنیەتی چاوەڕوانی ئێوە، رادەی ئاگادارییەکەی دەگۆڕێ. لە کتێبێکدا هەر وشەیەك زۆرتر دووپات کرابێتەوە. رادەی ئاگادارییەك کە رایدەگەیەنێ کەمترە. لە وڵاتان هاتوون وشەی هێندێك نووسینی وەك چیرۆك، شیعر، نمایشنامە. یان تەنانەت بابەتی رۆژنامەکانیان بژاردووە. ملیۆن، ملیۆن وشە.. دیارە ئەم بژاردنە تەنیا بۆ مەبەستی کامڵ کردنی تیۆرەی ئاگاداری نیە. بەڵکو زۆر سوودی تری هەیە. بۆ نموونە لە قامووس نووسیندا یان بۆ فێرکردنی زمانەکەیان بە کەسانێك کە دەیانهەوێ فێری ببن. ئەم ژمارکارییە لە زۆر زمانی وەك ئینگلیزی، فەرانسەیی، رووسی، ئیتالیایی و.. دا کراوە.

ئێستا گریمان لە نووسینێکدا وشەی "کورسی" سەد جار بەکارهێنرابێ و، وشەی "پەنگوئەن" جارێك، رادەی ئاگادارییەك کە وشەی سەد جار بەکارهاتوو بە ئێمەی رادەگەیەنێ، سەد جار کەمترە لە وشەی یەك جار بەکارهێنراو. کەواتە لە نووسینێکدا هەرچی وشەی زیاتر هەبێ (وشەی جیاواز، نەك دووپاتەوە بوو) رادەی ئاگاداری ئەو نووسینە زیاترە. ئێستا با لە مەیدانی زماندا درێژە بەم باسە بدەین. ئەگەر ژمارەی وشەگەلی زمانێك پەنجا تا سەد هەزار وشە بێ، بێگومان ژمارەی ناو، کار، حرف اضافە و حرف ربط، قەدەر یەك نین. زمانێك کە لە پەنجا هەزار وشە پێك بێ، نزیکەی سی هەزار وشەی ناوە. دوای ناو چاوگ و راناوە کە ئەم دوانەش پێکەوە، رەنگە ژمارەیان بگاتە دە، دوازدە هەزار وشە. رێی تێدەچێ پێنج یان شەش هەزار

وشەش کار بن. ئەگەر تەقریبەن هەزار وشەیەکی تر مابن، دەبێ بەسەر پیتی پێوەندی و، وردەواژەو.. دابەش گرێن. وردەواژەی وەك لە، بۆ، کە.. ژمارەیان نێجگار کەمە. پێشتریش گوتمان هەرچی ژمارەی پێکهاتەی کۆیەك زیاتر بێ، رادەی ئاگاداریان زۆرترە. بۆ نموونە ژمارەی "ناو" کە لە زماندا زۆرەو نزیکەی سی هەزار یەکەیە، هەر کام لەم سی هەزارە بەکاربێ، رادەی ئاگاداریەك کە رایدەگەیەنێ زۆر زیاترە لەو وردەواژەیە. وردەواژە لە نووسین یان گوتنێکدا هێندە دووپات و چەند پات دەبنەوە کە رادەی ئاگاداریان دەگاتە هیچ. بۆیە زۆرجار لە ئاخاوتنی رۆژانەدا پشت گوێ دەخرێن.

بەلام ئەمە بەو مانایە نیە کە وردەواژە لە زماندا کەم بەکاردێن. یان ناو کە ژمارەی پێکهاتەی زۆرە، زیاتر بەکاردێ. بە پێچەوانەوە ئەگەر وشەگەلی نووسینێك بژمێرین بۆمان دەردەکەوێ هەر کۆیەك (مجموعە) ژمارەی پێکهاتەی کەمتر بێ، زیاتر بەکار دەهێنرێ. بۆ تێگەیشتن لە رادەی ئاگاداری، زۆرجار دێن دەقێك دەخەنە بەردەستی کەسێك و، دوای خوێندنەوەی، تێگەیشتن لێی وەردەگرنەوە. ئەوسا رستەگەلێکی هەمان دەق دیسان دەخەنەوە بەردەستی هەمان کەس و داوای لێ دەکەن وشەکانی لەوەدوای هەڵبێنێ.. بۆ نموونە لە رستەی "زۆر کەس توانای خوێندن و نووسینیان نیە" دەپرسن دەبێ وشەی دوای "نیە" چی بێ؟ جاروبار یارمەتیشی دەدەن و دەڵێن یەکەم پیتی ئەو وشەیە "ب"یە. رەنگە وشەی دوا ئەو رستەیە "بەلام" بێ. هەروا پیت بە پیت و وشە بە وشەیان پێ دەڵێن و داوای پیت و وشەی لەوەدوایان لێ دەکەن. بەم شێوەیە رادەی ئاگاداری ئەو نووسینە بەراورد دەکەن.

ئەمەتان لەبیر بێو لە دواییدا بۆ باسی ئەدەبیی ئاوڕی لێدەدەینەوە..

سەرەکی ترین هۆ بۆ ئەوەی کە ئیمڕۆ بەها بە "ئیجاز" و کورت و پوخت بێژی دەدرێ و ئەم شێوە بۆ هەمیشەو لای هەمووکەس پەسندە، ئەوەیە کە، هەرچی پەیامێك بە وشەگەلی کەمتر بگێڕدرێتەوە، رادەی ئاگاداریەك کە رایدەگەیەنێ زیاترەو، زۆرتر سەرنجی خەلك و خوێنەواران بۆ لای خۆی رادەکێشێ. کەواتە نووسەر یان شاعیر، تەنانەت ئەگەر ئاگای لە تیۆرەی ئاگاداریش نەبێ، دەزانێ پێویستە بەرهەمەکەی ئاگاداریەکی زیاتر رابگەیەنێ. بۆ ئەو مەبەستەش وشەگەلێك بەکاردەهێنێ کە کەمتر بەکارهاتبێ و کەمتر بەزەینی خوێنەر ئاشنابێ. بەلام وێڕای ئەمەش ئەگەر شاعیر یان نووسەرێك بیهەوێ رادەی ئاگاداری لە سنووری شیاوی خۆی تێپەڕێنێ ئەوا ئیتر بەرهەمەکەی بێمانا دەبێو کەس تێی ناگات. ئەمە دەربارەی هەڵبژاردنی وشە یان یەکەکانی ناو رستەیە. بەلام زۆرجار رێ دەکەوێ ئێمە دوو وشە لە پاڵ یەکتردا ریز دەکەین کە هەرکامەیان بەجیا رادەی ئاگاداریان کەمە، کەچی کاتێ پێکەوە بەکاردەبرێن، رادەی ئاگاداریان هەڵدەکشێ.

نموونەی ناسراوی ئەم جۆرە تەرکیبانە لە شیعری فارسیدا "قیژەی بنەوش"ـە. "قیژە" وشەیەکی ئاسایی و رادەی ئاگاداریەکەی کەمە. هەروەها "بنەوش" زۆرجار لە ئاخاوتنی رۆژانەدا بەکار دەبرێ. بەلام هەر ئەم دوو وشە ئاساییە کاتێ لە شیعرێکدا وەك تەرکیبێك (پێکهاتە) بەکاردەبرێن، رادەی ئاگاداریەك کە رایدەگەیەنن نێجگار زۆرە. کەواتە هەر شتێکی چاوەڕوان نەکراو و نائاسایی رادەی ئاگاداریەکەی زیاترەو سەرنج راکێشترە. بۆیە

<u>لە بەرهەمی ئەدەبیدا نووسەر یان شاعیر هەوڵی نووسینی نائاسایی و چاوەڕوان نەکراو دەدا.</u>

پێویستە لێرەدا ئەوەش بڵێم. رادەی ئاگاداری جگە لەوەی پەیوەندی بە رادەی چاوەڕوانی بیسەر یان خوێنەرەوە هەیە، پەیوەندی بە باروودۆخی بیسەر یان خوێنەریشەوە هەیە. بۆ نموونە کاتێ یەکێك دەڵێ: "کە دەهاتم بۆ ئێرە پشیلەیەکم دی." ئەمە وەك هەواڵێك رادەی ئاگادارییەکەی بۆ هەموو بیسەران وەك یەکە، بەڵام بۆ کەسێك کە پشیلەیەکی ون کردووە جیاوازە. ئەم باسە رەنگە پەیوەندی بە تیۆریی ئاگاداریەوە نەبێ.

ئەمە بایەخێکی تایبەتە کە کەسێك بە بابەتێکی دەدا. پێویستە ئەم بایەخە تاکە کەسی و تایبەتیانە تێکەڵ بە تیۆری ئاگاداری نەکرێن. کاتێ پشیلە ون بوویەك ئەو هەواڵە دەبیستێ بایەخێکی تایبەتی پێ دەدا. ئەمە بەو مانایە نیە کە رادەی ئاگاداری ئەو هەواڵە زۆرە، بەڵکو بایەخی ئەو ئاگاداریە لای ئەو کەسە زۆرترە. بە واتایەك دەکرێ بگوترێ، هونەرمەندی چاك ئەو کەسەیە کە بایەخە تاکەکەسی و تایبەتیەکانی خۆی بکاتە بایەخی تایبەتی ئێمەش. وەك هەموو ئەو شیعرە دڵداریانە کە شاعیر بۆ دڵدارەکەی دەڵێ واتە بۆ خۆشەویستەکەی خۆی، بەڵام ئێمە هەموومان خۆشەویستی خۆمانی تێدا دەبینینەوە. کەواتە شاعیر توانیویەتی بەها تایبەتی و تاکەکەسیەکانی خۆی بکاتە بەهای گشتی. دەڵێن "گۆتە"ی شاعیر گوتوویەتی: "کە گوێتان لە دەردە دڵەکانم دەگرت وەڕس دەبوون، بەڵام کە ئەو دەردە دڵانەم بۆ دەکردن بە شیعر دەیان جار دەتانخوێندەوەو چێژتان لێ وەردەگرت". ئەمە کورتەیەك بوو دەربارەی تیۆریی ئاگاداری کە دەکرا بێ چوونە ناو مەیدانی ماتماتیکاوە باس بکرێ. ئێستاش ئامادەی بیستنی پرسیارەکانتم.

* * *

**پ:** وەها کە من لە لێدوانەکە گەیشتم، رادەی ئاگاداری پێوەندی بە نرخاندنی بەرهەمی ئەدەبی یان هونەریەوە نیە. واتە پێوانەیەك بۆ هەڵسەنگاندنی نرخی بەرهەم نیەو ناشێ بگوترێ فڵانە بەرهەم بەهۆی رادەی بەرزی ئاگاداریەك کە رایدەگەیەنێ لە فیسارە بەرهەم بەنرخترە.

**نەجەفی:** بێگومان هەر هەواڵ یان پەیامێك رادەی ئاگاداری زۆر بوو، بەو مانایە نیە کە ئەوە بەرهەمی ئەدەبی یان هونەریە. واتە ئەگەر من بڵێم "تووشی ئەسپی ئاوی بووم". کە دیارە رادەی ئاگاداریەك وا رایدەگەیەنێ زۆرە، بەڵام بەرهەمی ئەدەبی نیە. راستە رادەی ئاگاداری بەرهەمی ئەدەبی و هونەری زۆرە. بەڵام دەبوو لە کۆتایی باسەکەمدا بمگوتایە هەموو ئەو تیۆریانەی تا ئێستا بۆ لێکدانەوەو هەڵسەنگاندنی بەرهەمی ئەدەبی و هونەری ئاراستەکراون، چ تیۆریی یاکۆبسن یان تیۆریی ئاگاداری یان هەر تیۆریەکی تر.. نەیانتوانیوە هەموو لایەنەکانی ئەدەب و هونەر بخەنە بەر رووناکایی و پێناسە بۆ ئەدەب و هونەر بکەن. کە چۆن چۆنی بەرهەمێك لە دایك دەبێ و چۆن چۆنی نرخ و بەها پەیدا دەکا. هەرکام لەم تیۆریانە تەنیا تیشك دەخەنە سەر گۆشەیەك و لایەنێك لە لایەنەکانی بەرهەم.

**پ:** حەزدەکەم ئاوڕێك لە سەرەتای لێدوانەکە بدەمەوە. لە شارستانیەتە دێرینەکاندا کاتی دەیانویست بنووسن "یەك" هێڵێکی بچووکیان دەکێشاو، بۆ "دوو" دوو هێڵ و، بۆ "سێ" سێ

هێڵ، تا "تۆ" بۆ "دە"ش، نیشانەیەکیان دادەنا. لەو شارستانیەتانەدا بۆ نووسینی ڕەقەمەکان نیشانەگەلێکی کەمیان هەبووە. لە ڕاستیدا بەشێوەی بەرهەست و "کۆنکرێت" بیریان لە ڕەقەم کردۆتەوەو نەگەیشتوونەتە پەی بردن بە چەمکی "تەجریدی". ئەوەش کە ئێوە گوتتان کاتی ئامادەکردنی کورسی بۆ میوانەکان، کورسیەك دادەنێین و دەڵێین ئەمە بۆ عەلی و.. واتە کورسی کورسی وەك شتێکی بەرهەست و عەلیش وەکو کەسێکی تایبەت دەناسین. جا فەرمووتان ئەمە کارێکی هونەریە. ئایا گەڕانەوە بۆ دواوە، سەرەتایی بوون، هونەرە؟

**نەجەفی:** بەڵێ.

**پ:** واتە دەبێ شتەکان بەرهەست و کۆنکرێت سەیر بکەین؟

**نەجەفی:** شیعر داهێنانی شتێکی بەرهەستە. داهێنانی شتێك کە بوونی هەیە (وجـود). لە شیعردا زمان چەشنێك ناوبژیە (واسطە).

**پ:** لە ڕوانگەی جۆری بزوتنی زەینەوە (حرکت ذهـن)، ئایا ئەمە پەیوەندی بە تیۆری ئاگاداریەوە هەیە.

**نەجەفی:** نا. بە هێنانەوەی نموونەی کورسیەکە، دەمویست بڵێم، لە ڕوانگەی "تەجریدی" و زمانەوە -کە بەگشتی تەجریدە- شاعیر چۆناو چۆن ئەم تەجریدە دەسڕێتەوەو ئەم وشە مردوو تۆز لێنیشتوانە دەژیەنێتەوە.

**پ:** واتە لە زماندا ئێمە یارمەتی لە شتێکی تەجریدی وەردەگرین بۆ ئەوەی شتێکی "کۆنکرێت" بخوڵقێنین.

**نەجەفی:** نیازت وایە بەم شێوەیە پێناسە بۆ شیعر بکەیت؟ دەتەوێ بڵێی، بەرهەمی ئەدەبی ئەوەیە لە شتی تەجریدی شتی کۆنکرێت سازبکا؟ بەڵام چۆن گرینگ ئەوەیە کە ئێمە ناتوانین وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوەو بڵێین شاعیر بە چ شێوەیەك ئەم کارە دەکا..

**پ:** لەم تیۆریەدا ئایا هیچ چەشنە دابەش کردن یان خانەبەندی کردنێکی ئاگاداریەکان هەیە؟ ئایا دەکرێ ئاگاداریەك کە هەواڵێکی وەك "من پشیلەیەکم دی" رایدەگەیەنێ، لەگەڵ ئاگاداریەك کە شیعرێکی حافز رایدەگەیەنێ، پێوانە بکرێ؟

**نەجەفی:** ڕێگەم بدە بە شێوەیەکی تر جیاوازی بەرهەمی هونەری و هەواڵ یان ڕاپۆرت، لێك بدەمەوە. وتەی من کە دەهاتمە ئێرە پشیلەیەکم دی". لە هەمان کاتدا کە هەواڵێك بە ئێمە ڕادەگەیەنێ، کۆتایی بە ڕادەی ئاگاداریەکەش دێ. واتە ئێمە دوا بیستنی ئەو وتە، ئیتر کارمان پێی نامێنێ و پشت گوێی دەخەین و لێی ڕەت دەبین. بەڵام بەرهەمی هونەری ڕامانەدەگرێ. بەرهەمی هونەری. بە پێچەوانەی ڕاپۆرت یان هەواڵ، نوێنەری شتێکی تر لە دەرەوەی خۆی نیە. (وەکو چۆن لە وتەکەی پێشوودا بۆ ئێمە کە خودی پشیلەکەمان نەدیوە، هەواڵەکە لەبری ئەو بینینەیە).. ئەگەر لە ڕۆژنامەیەکدا نووسرابێ، دوێ شەو پیاوێك خەونی دیوە کە فریشتەکان لە ئاسمان هاتوونەتە خوارو دەرکەی مەیخانەیەکیان کوتاوەو بەمەی قوڕیان گرتۆتەوەو مرۆڤێکیان لێ سازکردووە، ئەم

وتە وەك هەواڵێك كە دەیهەوێ ڕووداوێك لە دەرەوەی خۆی بگێڕێتەوە، بایەخی نیە. چونكا ئێمە لە هەواڵەكان چاوەڕوانی ئاگاداری باشتر لە چوارچێوەی گونجاوتردا دەكەین. بەڵام كاتێك حافز هەمان وتەمان بە شیعر پێ دەڵێ (دوش دیدم كە ملائك در میخانە زدند گل آدم بسر شتند و بە پیمانە زدند) ئیتر بیر لەوە ناكەینەوە كە ئەم شیعرە دەیهەوێ هەواڵی ڕووداوێك ڕاگەیەنێ كە لە دەرەوەی خۆی ڕووی داوە.. یان نموونەیەكی تر. شاملو لە شیعرێكیدا دەڵێ؛ من فلان كارو فیسار كارو بهمان كارم دەكرد، خەمی نان ئەگەر بیهێشتبایە. لێرەدا ئەگەرچی "نان" هەمان نانە كە لە دەرەوەی شیعرەكەش هەیە، بەڵام تەنیا بەو مانایە نەهاتووە، بەڵكو گەلێ واتای تریشی هەیە. وەها كە ئەو واتایانەی تری ئێمە ڕادەگرێ و ناهێڵێ وەك هەواڵ یان ڕاپۆرتێك وەری بگرین و لێی ڕەت ببین. نانی ئەم شیعرە شتێكی سەربەخۆیی (قائم بە ذات) شتێكە جیا لەو نانە كە لە دەرەوەی شیعرەكە هەیە.

**گوڵشیری:** لێرەدا مەبەست ئەوەیە كاتێ شاملۆ باسی نان دەكا، خودی نان دەخوڵقێنێ. ئەوسا چەمكی تریشی لەسەر باردەبێ. بەڵام ئەگەر ئەم نانە "تەجریدی" بوایە چەمكی تری لەسەر بار نەدەبوو. ئەگەر كورسیەك سازبكەین، زۆركەس دەتوانێ لەسەری دانیشێ. بەڵام وشەی "كورسی" بۆ ئەوە نابێ كەس لەسەری دانیشێ. كەواتە "نان" لەو شیعرەدا جوڵەیەكە بەرەو كۆنكرێت.

**نەجەفی:** بەڵێ.. بڕواننە ئەم شیعرە (كەوا كۆنی خۆم بەكوێی ئەم شەوە تاریكەوە هەڵواسم..) ئەم وتە سەربەخۆیەو، شتێكە جیا لە هەموو ئەو شتانەی كە لە دەرەوەی شیعرەكە هەن. پێویستە بزانین ڕەفتاری ئیمڕۆی لەگەڵ زمان، ڕەفتارێكی تەجریدیەو ژیانی ئەم سەردەمە لە سروشت و شتەكانمان دادەبڕێ. هونەر گەڕانەوەیە بۆ سروشت و شتەكان. هەروەها شتێكی تریش كە ئێمەی لە هەستی خۆمان و خۆمان دوور خستۆتەوە، ئەوەیە كە ئێمە لە ئامانجەكانماندا نوقم بووین. ئەمە باسێكی گرینگە. كاتێ من دەمویست بێم بۆ ئێرە، ئەوەندە لەو مەبەست و ئامانجە (هاتن بۆ ئێرە) نوقم بووبووم. كە نەمزانیوە ماوەی نیو سەعات یان سەعاتێكی ناو ڕێگەم چۆن تێپەڕیوە. ئەو نیو سەعات یان سەعاتە بەشێك لەتەمەنی من بووە كە نەمزانیوە چی بەسەرهاتووە. یان ئێستا ئەگەر بمهەوێ ئەم چایە بخۆمەوە، ئەو ماوەی كە قەندەكە هەڵدەگرم و بۆ دەممی دەبەم، ماوەیەكە كە تێدەپەڕێ و ون دەبێ. چونكا مەبەستم ئەوەیە زووتر چایەكەم بخۆمەوە. كەواتە ئامانجەكانی مرۆڤ هی داهاتووە. ئەوەش كە لە ئیختیاری مندایە ئێستا -هەنووكە-یە. ئەگەر من هەمیشە لە داهاتوویەكدا بم كە هێشتا نەهاتووە، ساتەكانی ئێستام لە كیس دەچێ. كەواتە ناژیم. یان لە ژیانم بێئاگام. بەڵام هونەر لە ساتەكانی ئێستاماندا ڕاماندەگرێ. واتە وا لە كەرەسەكان دەكا وەك كەرەسە سەیریان نەكەین و لێیان نەگوزەرێین. بۆ نموونە ئەگەر وەك

کەرەسە یان ئامراز بۆ گەیشتن بە شتێکی دەرەکی سەیری زمان بکەین، لە کیسمان دەچێ و لێمان ون دەبێ. بەرهەمی هونەری و ئەدەبی بە پێچەوانەوە دەمانگەڕێنێتەوە سەر خودی زمان و، وامان لێدەکا لەسەری راوەستێین.. جا با لەوە زیاتر لە باسەکەمان دوور نەکەوینەوە.

**پ:** ئێستا بفەرموون چ جیاوازییەك هەیە لەنێوان تەوس (طنز) لەگەڵ ئەو بەرهەمانەدا کە رادەی ئاگاداریان زۆرە؟

**نەجەفی:** لە نێوان تەوس و شیعردا پەیوەندیەکی قایم و نزیکایەتیەکی زۆر هەیە. ئەمە باسێکی جیاوازە کە نامەوێ بڵێم دەرەقەتی دێم. بەڵام بە کورتی، کورت بێژیەك (ایجاز) کە لە تەوس دا هەیە لە شیعریشدا هەیە. جوانترین تەوس و نوکتە ئەوەیە کە بە کەمترین وشە بگێردرێتەوە. هەر ئەوەش رادەی ئاگاداریەکەی بەرز دەکاتەوە. شیعری باشیش هەروایە. تەنانەت پەندی پێشینانیش..

(لێرەدا چاوپۆشی لە وەرگێڕانی یەك دوو پرسیارو وەڵام کراوە)

**نەجەفی:** بەرزبوونەوەی لە ئەندازە بەدەری رادەی ئاگاداری لە بەرهەمی ئەدەبیدا دەبێتە هۆی ریسوایی یان بێمانایی. بۆ یەکەمیان دەکرێ ئاماژە بە مۆدەی جل و بەرگ بکەین. پێش لە شۆڕش بۆ ماوەیەك لەبەرکردنی شەرواڵی کورت بوو بە مۆدە. رادەی ئاگاداری ئەم پۆشاکە هێندە زۆر بوو، کە دەبووە مایەی ریسوایی و ئابڕووچوونی ئەو کەسە وا لەبەری دەکرد. ئەمە لە شیعرو ئەدەبیشدا روودەدا. بۆ نموونە شیعری "قیژەی بنەوش" کە کاتی خۆی بووە مایەی ئابڕووچوونی شاعیرەکە (هۆشەنگی ئیرانی) و شیعرەکەی.

**پ:** لە شانۆگەری "فۆرس"یشدا، نانێك لەسەر تەختەی شانۆیە کە یاریکەرەکە بە مشار دەیبڕێ و دەیخوا. بەڵام ئەم نمایشە تەنیا بووە هۆی سەرسووڕمانی بینەرەکان.

**نەجەفی:** هۆشەنگی ئیرانی بەمەبەستی ئابڕووچوون و ریسوایی ئەو شیعرەو زۆربەی شیعرەکانی تری بڵاوکردەوە. رەنگە لە پرۆسەی پێشکەوتنی ئەدەب و هونەردا ئەم جۆرە هەڵوێستانەش پێویست بووبێتن. وەها کە دادائیەکانیش کاتی خۆی کاری وا سەیرو سەمەرەیان کردووە.

(لەم شوێنەشدا چاوپۆشی لە وەرگێرانی چەند پرسیارو وەڵامێك کراوە)

**پ:** ئایا ئەم تیۆریە بایەخ بە تەکنیك، تێم و چۆنیەتی روانینی نووسەر یان شاعیر بۆ ئەم بابەتانە دەدا؟

**نەجەفی:** مەبەستت ئەوەیە تەکنیك چۆن دەنرخێندرێ؟

**پ:** تەکنیك و چۆنیەتی روانینی نووسەر

**گوڵشیری:** رێگەم بدەن من نموونەیەك بهێنمەوە. کەسێك دەڵێ: "من دوێ شەو نەخەوتووم". ئەگەر کەسێکی تر بڵێ: "من دوێ شەو تا بەیانی سێ سەدو سێ جار داری میچەکەم بژاردووە.." رادەی ئاگاداری لەمەڕ نەخەوتنەوە بەرزکردۆتەوە.

**نەجەفی:** بەڵێ. چونکا ئێمە چاوەڕوانی ئەوەمان نەکردووە، کابرا بەم شێوە باسی نەخەوتنەکەیمان بۆ بکا.

**پ:** بەڵام هەردوو جۆرە گێڕانەوەکە، یەك بیت (*b/t*) ئاگاداریمان پێ رادەگەیەنێ.

**نەجەفی:** نا، وانیە. لەبەرئەوەی کاریگەری هەرکام لەو گێڕانەوانە جیاوازە. ئەگەر بگوترێ "لە دەرەوە بەفر دەبارێ" رادەی ئاگاداریەکەی لە زستان و هاویندا جیاوازە. راستە وتەکە لە هەموو باروبۆخێکدا یەك وتەیە. بەڵام خودی بارودۆخەکە رادەی ئاگاداریەکەی دەگۆڕێ.

**پ:** کاتێ بمانهەوێ ئاگاداریەك لە شوێنێکەوە بگوێزینەوە بۆ شوێنێکی تر. یەکەم مەسەلە بارستایی ئاگاداریەکەی کە لە *A* وە گوێزراوەتەوە بۆ *B* و لەوکاتەدا رادەی ئاگاداری *B*بەستراوە بە *A* وە.

**نەجەفی:** نەخێر. بەستراوە بە منی گوێگرەوە. بەستراوە بە نەبوونی حەتمیەتی مەسەلەکەوە. نەبوونی حەتمیەتی بەفربارین لە هاویندا زیاترە، بۆیە رادەی ئاگاداریەکەیشی زۆرترە.

**پ:** بەپێی قسەکەی ئاغای گوڵشیری، کەسێك کە دەڵێ "من دوێ شەو نەخەوتووم.." یەکەیەك ئاگاداریمان پێ رادەگەیەنێ. ئەویش ئەوەیە کە نەخەوتووە. لێرەدا بۆشاییەك لە راگەیاندنی ئاگاداریەکەدا هەیە. ئەی ئەگەر نەخەوتووە چی کردووە؟ دارەکانی بژاردووە؟ کەواتە وتەی دووەم زیاتر لە یەکەیەك ئاگاداری پێ راگەیاندووین. نەخەوتووەو کارێکی تری کردووە.

**نەجەفی:** دیسانەوە خەریکین مانای شتەکان تێکەڵ بە باسەکە دەکەن. واتای ئەوەی کە من نەخەوتووم لەگەڵ واتای ئەوەی کە دارەکانم بژاردووە جیاوازە. شاعیر یان نووسەر بۆ ئەوەی بەرهەمەکەی کاریگەری لەسەر خوێنەربێ، دەبێ رادەی ئاگاداریەك کە رایدەگەیەنێ بەرزبکاتەوە. واتە یەکێك لە سەرەکیترین ئەرکەکانی نووسەر یان شاعیر ئەوەیە، رادەی ئاگاداری هەموو لایەنەکانی بەرهەمەکانی (ناوەرۆك، فۆرم و..) بەرزبکاتەوە. کەواتە کەڵك وەرگرتنی نووسەر لە تەکنیکی تازەی گێڕانەوە، بۆخوێنەر چاوەڕوانی نەکراوەو، ئەمەش رادەی ئاگاداری بەرهەمەکەی پێ بەرز دەبێتەوە. کاتێك شاعیر یان نووسەر بیهەوێ بەیارمەتی زمان، رێبازێك بدۆزێتەوە کە کاریگەری بەرهەمەکەی لەسەر خوێنەر زیاد بکا، تەکنیکی بەکارهێناوە..

کە قسە لە رادەی ئاگاداری دەکرێ، لەوە دەچێ مەبەست تەنها چەندی ئاگاداری بێ. من پێم وایە ئەمە بەس نیە. بۆ نموونە کاتێ فرووغ دەڵێ: "پەریەکی بچووکی خەمبار" وایدانێن گوتبێتی "پەریەکی بچووکی قژ درێژی خەمبار" دەمەوێ بزانم ئەم بچووکی و قژدرێژیە ئاگاداریەکی زۆرتر رادەگەیەنێ یان خەمباریەکە؟ ئایا خەمباری ئاگاداری زیاتری هەیە، واتە وەك شتێك وایە کە سێبەرێکی گەورەی خستبێتە سەر ژیانی پەریەکە. ئایا دەتوانێ ئاگاداری رابگەیەنێ یان نا؟ وادیارە ئەم جۆری ئاگاداری خەمبارییە لەگەڵ جۆری ئاگاداری دیداری (بصری)، کە لە پەریەکەی دەبینین، جیاوازە.

**نەجەفی:** من لە ئەنجامگیری لێدوانەکەدا گوتم هەرگیز کۆتایی بە رادەی ئاگاداری بەرهەمی ئەدەبی نایەت، وەك شیعری فرووغ. لە کاتێکدا ئەگەر کەسێك بێت و بڵێت: "پشیلەیەکم دی" رادەی ئاگاداریەکەی بۆ هەموومان، تەنانەت بۆ خاوەنی پشیلە ون بووەکەش، تەواو دەبێ. قسەکەی کابرا مەبەستەکەی بەتەواوی پێکاوە.

**پ:** پرسیارەکەی من ئەوەبوو ئایا "خەمبار" ئاگاداریەکی زیاتری هەیە یان "قژ درێژ"؟ بۆ نموونە ئەگەر بڵێم: "پارێکە زۆر خەمبار بووم". ئاگاداریەکی زیاترم راگەیاندووە، یان ئەگەر بە وردی هەموو رووداوە تاڵەکانی پارێکە بگێڕمەوە؟ بەڕای من هەردوو گوتنەکە ئاگاداری رادەگەیەنێ بەلام لە جۆری ئاگاداریەکاندا جیاوازی هەیە. کەواتە چۆنیەتی (کیفیت) ئاگاداریەکانیش جێگەی سەرنج پێدانە.

**گوڵشیری:** ئەمە نموونەیەکی چاکە. کاتێ سەیری شیعرەکەی فرووغ دەکەی دەبینی پەری دڵە بچووکەکەی بە شمشاڵ دەژەنێ. ئەمە پەیوەندیەکی زیاتری بە خەمباریەوە هەیە. من پێم وانیە ئەگەر فرووغ باسی قژی درێژی پەریەکەشی بکردایە، هیچ رووی بدایە. خودی خەمباری بەو پێیە کە دڵە بچووکەکەی بە شمشاڵ دەژەنێ سەرنج راکێشە. ئەمە بۆ باسێکی بونیادی و ئەو جۆرە بابەتانە دەگەڕێتەوە.

**نەجەفی:** بەلام لە هەر حاڵدا ئاگاداری بە چەندایەتی (کمیت) هەڵدەسەنگێندرێ. چۆنیەتی کاریگەری لەسەر رادەی ئاگاداری نیە. واتە کاریگەری لەسەر چەندی ئاگاداری نیە.

**پ:** ببوورە ئاغای نەجەفی. رەنگە بشێ بگوترێ ئاگاداری پەیوەندی بە عەقڵی گوێگرەوە هەیە نەوەك هەستی گوێگر. واتە چەندی ئاگاداریەك کە بە کەسێکی رادەگەیەنێ وابەستەیە بە عەقڵی ئەو کەسەوە، نەوەك هەستی.

**پ:** لە هەمان نموونەی "پەریەکی بچووکی خەمبار" ئەگەر لەبری وشەی "خەمبار" وشەی "شاد" دانێین. لەوە دەچێ جۆری ئاگاداری (شاد) لەگەڵ جۆری ئاگاداری (خەمبار) جیاوازبێ.

**نەجەفی:** ئەمە دژایەتی لەگەڵ قسەکانی مندانیە. چونکا ئێوەن کە ئەم وشانەتان گۆڕیوە. پاشان خودی وشەکانیش بەجیاو تەجرید مەبینن. وشەکان لەگەڵ یەکتردا بەکاردەبرێن و کارڕگەریان لەسەر یەکتر هەیە. بۆنمونە باسی "قیژەی بنەوشم" کرد.

**پ:** پێویستە ئەمە لەگەڵ سەرجەمی شیعرەکەدا لێك بدرێتەوە. واتە ئەم شیعرە کۆیەکی ئاگاداریە. خەمبار دەبێ لە پاڵ هەموو ئاگاداریەکانی کۆکەدا باس بکردرێ.

**نەجەفی:** ئیتر ئەمە پەیوەندی بە تیۆرەی ئاگاداریەوە نیە.

—ئاغای نەجەفی سوپاست لێدەکەین.

# لە ئەدەبی گەلانەوە



- دیسک (کورتە چیرۆک)
- یادگاری (پەخشانە شیعر)

خۆرخێ لویس بۆرخس

ئەدۆنیس



# دیســـك


- خۆرخێ لویس بۆرخس
- و. له فارسییه‌وه‌: ئازاد به‌رزنجی




من داریـــڕه‌وه‌م، گرنـگ نی‌یـه‌ نـاوم چی‌یـه‌. ئـه‌و كوخته‌ی تیایدا له‌ دایكبووم و بـه‌م زووانـه‌ش تیـایدا ده‌مرم كه‌وتۆته‌ قه‌راغ دارستانه‌كه‌وه‌. ئه‌م دارستانه‌ بـه‌ ڕواڵـه‌ت بـه‌ ده‌ریایـــه‌ك كۆتـــایی دێـت كـه‌ ده‌وراندەوری زه‌ویـی گرتـووه‌و به‌ســـه‌ر ئاوه‌كـه‌وه‌ كۆمه‌ڵێك خانووی دارین هه‌یه‌ كه‌ وه‌كو خانووه‌كـه‌ی من ده‌له‌نگێنه‌وه‌. هیچ نازانم؛ هه‌رگیز ئه‌و ده‌ریایـه‌م نـــه‌بینیوه‌. ئه‌وســـه‌ری دارستانه‌كه‌شـم هـــه‌رگیز نه‌دیوه‌. كاتێ منداڵ بووین برا گه‌وره‌كـه‌م وایلێكـردم پێكه‌وه‌ سوێند بخۆیـن تـا بـه‌ هـه‌ردووكمان هـه‌رچی داری دارستانه‌كه‌ هه‌یه‌ بیبڕینه‌وه‌؛ تـا ئـه‌و ڕاده‌یـه‌ی ته‌نانه‌ت یـه‌ك دار چی‌یـه‌ به‌پێوه‌ نـه‌مێنێت. براكـه‌م مردووه‌، ئه‌وه‌ی ئێستا من بـه‌دوایدا وێڵـم و بـه‌دوایدا وێڵ ده‌بم شتێكی تـره‌. لـه‌ ده‌ورووبـه‌ری (پۆنـانت)دا ڕووبارێك هه‌یـه‌ كـه‌ ده‌تـوانم تیـایدا به‌ده‌ســـت ماسـی بگرم، دارستانه‌كه‌ گورگی هه‌یه‌، به‌ڵام مـن لـه‌ گـورگ ناترسـم و ته‌وره‌كه‌شـم قـه‌ت خیانـه‌تی لیّ نـه‌كردووم. نـازانم ته‌مـــه‌نم چـه‌نده‌، ئـه‌وه‌نده‌ ده‌زانم كـه‌ زۆره‌.

چاوه‌كانم كزبوون و توانـای بینینیـان نـه‌ماوه‌. لـه‌ناو دێ، كه‌ ئێستا ڕووی تێناكه‌م، له‌به‌رئه‌وه‌ی لـه‌ ڕێگـادا ون ده‌بم، بـه‌ ڕه‌زیلی ناسـراوم، بـه‌ڵام داریڕه‌وه‌یـه‌كی دارستان ده‌بێ بتوانێ چی پێكه‌وه‌ بنێت؟

به بەردێك دەرگای ماڵەکەم توند دەگرم تا بەفر نەیەتە ژوورەوە. پاشنیوەڕۆیەکیان گوێم لە دەنگی قورسی پێی کەسێك بوو، پاشان لە دەرگـا درا. دەرگاکەم کردەوەو ڕێم بە کەسێکی نەناس دا بێتە ژوورەوە.

پیرەمێردێکی باڵابەرز بوو کە قـاپووتێکی درێژی کۆنی لەخۆیەوە پێچابوو. جێ برینێك خەتێکی لە دەموچاویدا دروستکردبوو. وا دەهاتە بەرچاو کە تەمەنی زۆری لەبری ئەوەی بێهێزی کردبێت؛ گوڕو تینێکی زیاتری پێدا بێت. بەڵام لەگەڵ ئەوەشـدا دەمبینی کە لە ڕۆیشتندا دەبووایە خۆی بدایە بە سەر دار عەساکەیدا. پێکەوە هەندێ قسەمان کرد کە بیرم نایە چی بوون. دواجار وتی:

—حاڵ و ماڵم نییەو لەهەر کوێیەك بێت دەخەوم. تەواوی ئیمپراتۆریـەتی ئانگلۆ ساکسۆنم بەپێ تەی کردووە.

ئەم قسانە لەگەڵ تەمـەنیدا دەگونجا، باوکم هەمیشە باسی ئیمپراتۆریـەتی ئانگلۆساکسـۆنی دەکرد، ئەمڕۆ خەڵك پێی دەڵێن ئینگلستان.

نان و ماسیم هەبوو. بە بێدەنگی شێومان خوارد. باران دایکرد. بە چەند پێستەیەکی حەیوان لەسەر زەوییەکە، لەو شوێنەدا کە براکەم تیایدا مردبوو، جێخەوێکم بۆ چێ کرد. بوو بە شەوو خەوتین.

کاتێ لە ماڵەوە چووینە دەرێ خەریکبوو ڕۆژ دەبۆوە. بارانەکە خۆشیکردبۆوەو بەفرێکی تازەباریو زەوییەکەی سپی کردبوو. دار عەساکەی فڕێداو بە منی وت کە هەڵیبگرمەوە.

وتم:

—بۆ دەبێ بەقسەت بکەم؟

وەڵامی دایەوە:

—چونکە من پاشام.

لە دڵی خۆمدا وتم ئەمە شێتە، دار عەساکەیم هەڵگرتەوەو دامەوە دەستی. بە دەنگێکی جیاواز لە دەنگی پێشوویەوە وتی:

—من پاشای (سێگنس)م. زۆربەی جارەکان لە شەڕە سەختەکاندا من سەرکەوتنم بۆ ئەوان بەدەستهێناوە، بەڵام لە ساتێکدا کە چارەنووس دیاریی کردبوو، دەسەڵاتم لە دەست دا. ناوم (ئیسێرن)ەو ڕەچەڵەکم دەچێتەوە سەر (ئۆدین).

وەڵامم دایەوە:

—من ڕێز لە ئۆدین ناگرم. من باوەڕم بە مەسیح هەیە.

وەك ئەوەی گوێی لە قسەکەم نەبووبێت، لەسەر قسەی خۆی بەردەوام بوو:

—سەرگەردانی سەر ڕێگاکانی غەریبیم، بەڵام هێشتا هەر پاشام لەبەرئەوەی دیسکم پێیە. دەتەوێ بیبینیت؟

ناو لەپە ئێسقانارییەکەی کردەوە. هیچی لەدەستدا نەبوو. ناودەستی بەتاڵ بوو. بەڵام دەستی بەجۆرێك بوو کە هەستمکرد توند شتێکی گرتووە. چاوی لە چاوم بڕی و وتی:

—دەتوانیت دەستی تێوە بدەیت.

بە تۆزێ دوودڵییەوە نووکی پەنجەم دا لەناو لەپی دەستی. هەستم بە شتێکی سار[illegible] و بریسکەیەك دای لە چاوم. خێرا دەستی نووقاند. هیچم نەوت. وەك ئەوەی لەگەڵ منداڵێکدا قسە [illegible]کات بە حەوسەڵەوە لەسەر قسە بەردەوام بوو:

—ئەمە دیسکی ئۆدینە[1]. تەنها یەك دیوی هەیە. شتێکی تر نییە لەسەر زەوی تەنها یەك دیوی هەبێت. تا ئەمەم لە دەستدا بێت، هەر بە پاشایی دەمێنمەوە.

پرسیم:

—ئاڵتوونە؟

—نازانم. دیسکی ئۆدینە. تەنها یەك دیوی هەیە.

حەزمکرد ببمە خاوەنی ئەو دیسکە. گەر هـی مـن بووایـە دەمتوانـی بیفرۆشـم، لەگـەڵ قاڵبـە ئـاڵتووندا دەمگۆڕییەوەو دەبووم بە پاشا. بەو بەرەڵڵایـەم وت کە تا ئێستاش ڕقم لێی دەبێتەوە:

–لە کوختەکەمدا سندووقێکم شاردۆتەوە پڕە لـە سـکە. سـکەی ئـاڵتوونن و وەکـو تەورەکـەم دەبریسکێنەوە. ئەگەر ئەو دیسکی ئۆدینـە بـدەی بـە من ئەو سندووقەت دەدەمێ.

بە کەللەڕەقیەوە وتی:

–ڕازی نیم.

پێم وت:

–باشـە، کەواتـە دەتوانیـت ڕێی خـۆت بگریتـە بەرو بڕۆیت.

پشتی تێ کردم. یەك جار وەشاندنی تەورەکە بـۆ سەر ملی بەس بوو تا تلۆر بێتەوەو بکەوێ. بـەڵام لە کـاتی کەوتنەکـەیدا دەسـتی کـردەوەو ئەو تیشـکەم بینـی لـەو هـەوادا سـووڕایەوە. بـە تووورەکـەم شوێنەکەیم نیشانە کردو مردووەکەم بەرەو ڕووبارێك پەلکێش کرد کـە لـە هـەڵچووندا بوو. فڕێم دایـە نـاو ڕووبارەکەوە.

کاتێ گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، بـەدوای دیسـکەکەدا گەڕام. نەمدۆزییەوە. ئێستاش ئەوەتانێ وا سـاڵانێکە هەر بەدوایدا دەگەڕێم[2].

**پەراوێز و سەرچاوە:**

*1*–ئۆدین: خواوەندێکی جەڕمەنییە: خواوەنـدی شەڕو ئەلفوبێی کۆنـی جەڕمـەنی و شیعرە. ئـەویش سیحر بـازو جادووگـەرەو خـاوەنی ئەڵقـەی سـیحریی (دروپند)ە، کە دەشێ لـەم چیرۆکەشدا مەبەسـت لـە (دیسك) هەمان ئەو ئەڵقەیە بێت.

*2*–لەم کتێبەوە کراوە بە کوردی:

کتابخانـه بـابل و *23* داسـتان دیگـر، خورخـه لوئیس بورخس، ترجمه: کاوه سید حسینی، چاپ اول *1378* (*1999*)، انتشارات نیلوفر.

# یادگاری

■ ئەدۆنیس

● و. لە عەرەبییەوە: بڕوا عەلادین


ئەدۆنیس

**شاری ئەلف**

لە شاری ئەلفدا
ڕاوچییەکان تاڵی خەونەکانیان ئەبەستن بەتاڵی تۆڕەکانیانەوە:
ئەمیان ڕەنگی کاتی لێ نیشتووەو
ئەویشیان ڕەنگی مەرگ.

*

هەندێکیان ئەیانەوێ بە هەشتێ بۆ ئازادی دروست بکەن
بەڵام بەو وشانەی
کە خۆشیان ناتوانن بیاندرکێنن.

*

لەشاری ئەلفدا
تەنها نوشتەیەك –کە لەسەر ڕووی یەکەمی ئەبەدو لەسەر ڕووی دووەمی ئەزەل
بنوسرێ– بەسە بۆ ئەوەی دەریا لەکونی دەرزی خەیاتێکدا شەپۆلبدات و
بەرد باڵی لێبڕوێت.

*

بەردێك لە شاری ئەلفدا لەپڕ خۆی بینی سەری ئادەمییەکە
ئەو سەرەش لەپڕ خۆی لە بێگاری خوێندنەوەی کتێبێکدا بینیەوە
کە ستایشی تاج ئەکا

*

ئەخێر، هەرگیز شاری ئەلف، بۆ نموونە وەکو جارانی شاری ئەسکەندەریە وەسفناکەم
ئەم شارە وا وەسفدەکرا کە هەموو شتێك تیایدا رێپێدراوە، شارێکە مرۆڤ
ڕوی تێدەکات تابێ هیچ کۆت و بەندێك ئازادیی خۆی تیا پیادە بکات.
نا، نالێم شاری ئەلف سۆزانیە گەورەکەیە، یا وەك شاری (سودوم) رەمزی ئەوپەڕی
ئازادیە کە ئەگۆڕێ بۆ ئەوپەڕی کۆیلەێتی، کە جگە لەو بارانەی ئاگر ئەبارێنێ،
هیچ شتێك پاکی ناکاتەوە.. نا، نایکەم..

*

سڕینەوە یەکەم خولیای شاری (ئەلف)ە، بەڵام هەمیشە لەیادی ئەچێت کە سڕینەوەش خۆی لەخۆیدا نوسینە.

*

شاری (ئەلف) بەڕووی هەموو شتێکدا ئەکرێتەوە، تەنها بۆ ئەو ئەندامە جوانە بچکۆلەیە نەبێ کە ناوی دڵە.

*

ئەڵێن: لە شاری (ئەلف)دا وشەگەلێ کە وەکو تەناف درێژن لە قەفەزەکان دێنە دەرێ و ماڵ و شەقامەکان پڕ دەکەن.

هەروەها ئەڵێن: ئەوانەی ئەم وشانە ئەدرکێنن تەنها لەگەڵ ئەو تارماییانە ئەدوێن کە لەنێو خۆیاندا شاری (ئەلف) وەك جێخەوو ژوور دابەش ئەکەن.

هەندێك لەو وشانە، بۆ نمونە: ئەی بەدبەختی تۆ دەبیتە ناوێك بۆ ئەم کاتە، هەندێکی دیکەشیان: ئیدی هیچ ئەستێرەیەك ناتوانێ دزە بکاتە ژووری شاعیرەوە. هەندێك لەو ناوانەش: بێهودە لەم دەرگایە ئەدەیت کە کەسانی دی پێی ئەڵێن پاشەڕۆژ.

ئەگێڕنەوەو ئەڵێن لە شاری (ئەلف)دا شەووڕۆژ شێوەی تایبەت بەخۆیان هەیە، کە لە هیچ شارێکی تردا نیانە.
لەوانە، بۆ نمونە لە شاری (ئەلف)دا ڕۆژ وا دەست پێدەکات وەك ئەوەی کۆتێك بێ بە کۆتێکی دیکەوە بەسترابێ. ڕاستە دوو قاچی هەیە، بەڵام شەیدای سەرکەوتنە بەسەر دیواری نەبینراودا، دەستەکانیشی بێوەستان سەرقاڵی دروونی جلێکن لەو تاڵە دەزوانەی تەنها پسپۆڕەکان ئەیزانن چیە، ئەو تاڵە دەزوانەی لم بە لم دەگەیەنن. هەر لەوەشەوە دووگوێی هەیە تەنها ئەو وشانە دەبیستن کە لێوەکانی جارێك وەك بۆریەکان و جارێك وەك تۆپ فوی تێدەکەن. چاوەکانی نازنن سەیری هیچ شتێك بکەن تەنها ئاوێنەی مەرگ نەبێت (لە گێڕانەوەیەکی دیکەدا دەڵێن تەنها ئاوێنەی مردووەکان نەبێت). بەم شێوەیە ئازادی و حەقیـ ـەت و خۆشەویستی و نور لە پشت پەردەوە دەژین. ناوبەناویش کە دەردەکەون یا خوێنیان تێزاوە یا ش ـەرم و تەریقی دایگرتوون.
لێرەوە ئەم بەیانیە شاری (ئەلف) ئاڵایەك هەڵدەکات کە لەسەر کۆشکەکانی و لە شەقامەکانیدا دەشەکێتەوە.
ئەمە زۆر کەمە لەچاو ئەوەی کە دەربارەی ڕۆژ لە شاری (ئەلف)دا دەگێڕدرێتەوە.
بەڵام شەو ترسێکە وەسفناکرێت، یا بابڵێین باسکردنی مایەی شەرمە.

*

لە شاری (ئەلف)دا مناڵان خواردنێکی سەیرو تایبەتیان هەیە کە لە ئاردی تۆقین دەردەهێنرێت. هەروەها قەرەوێڵەی سەفەرییان هەیە کەوەك ئەشکەوت وایە

*

دەزانی دیوارەکانی خوێن چۆن بەردەبنەوە؟ چۆن دێنە پاڵ یەك و لەیەك دوور دەکەونەوە؟ تۆ لە شاری (ئەلف)دا بیریان لێ ناکەیەوەو بە ئەندێشەتا نایەن، بەڵکو بەریان دەکەویت.

*

خودەیەك پێی نایە سەر نەخشەی (ئەلف) ئەو نەخشەیەی لە وێنەیەك دەچوو بەقەد قەبارەی مێژوو، پڕ بە گەروی هاواری کرد: ئەی وێنە، منم مانا.

*

**شاری بێ**

ژیان لە شاری (بێ)دا وەك جلێك وایە بە تەنافی ئاخاوتندا هەڵخرابێت.

*

لە شاری (بێ)دا کتێبخانەیەك هەیە ئەوەی ئەچێتە ناوی تەنها کۆمەڵێك شوشە مەرەکەبی بەتاڵی تیا دەبینێ، کۆمەڵێك قەڵەم دەبینێ کە نانوسن، کۆمەڵێ کورسی کە بووکە ڕەنگاورەنگ و بریقەدارەکان لەسەری دادەنیشن. کتێبخانەیەك لەسەر شێوەی لاستیکی خەتکوژانەوە دروستکراوە.

*

لە شاری (بێ)دا کوشتنی باوك دیاردەیەکی گشتیە. بەڵام زوربەی کوڕەکان کاتێك دەیانەوێت باوکیان بکوژن خۆیان دەکوژن، چونکە پێوەندیی ئەو کوڕانە، پاشخان و سەرچاوەکانی سرۆش و زمانیان باوکەکانن. بەڕاستی کێشەی ئەم شارە خۆکوشتنی کوڕە نەك کوشتنی باوك.

*

بلێی بەشێتم بزانن گەر بۆ ئەوانەی بسەلمێنم کە ئێستا دەمخوێننەوە، کە وشە لە شاری (بێ)دا دەموچاو و باڵاو چوارپەلی هەیە. بە کورتی لەشێوەی مرۆڤ دەچێ؟

مرۆڤ ئاژەڵێکی قسەکەرە، ئەرستۆ وا دەڵێت.

باڵوێکی شاری (بێ)یش دەڵێ: "ڕاستە مرۆڤ ئاژەڵێکی قسەکەرە، بەڵام تەنها درۆ دەکات: ئەویش یا بۆ جوانکردنی خۆی، یا بۆ ناشرینکردنی بەرامبەرەکەی".

*

بەڕاست دەتەوێ ئەوی دی لە شاری (بێ)دا لەخەو هەستێنی و حەقیقەتی بخەیتەڕوو؟

کەواتە خۆت لە خەو هەستێنەو بەدوای حەقیقەتی خۆتدا بگەڕێ.

*

لە شاری (بێ)دا شاعیر نازانێ دڵخۆش بێ یا خەفەت بخوات:

هەموو ڕۆژێ وشەکانی دەسوتێنرێن،

چەندە ببرژێن پێستەکانیان بە پێستی تر دەگۆڕدرێن

*

بەلای شاری (بێ) وە ئەوەی لە شیعردا گرنگە بینینی دانا ئانیەتی، بەتایبەتی کەڵبەکانی کە دەیبینێ، وەك خۆی دەڵی بە ئاسانی تێیدەگات و ڕاستیدەکاتەوە.

*

دەبێ سوپاسێکی تایبەتی سیاسەتی سروشت بکەین لە شاری (بێ)دا، چونکە باران لەو هەورانەوە دەبارێنێ کە وەك پەردەی کچێنی وان.

*

شارێك –بیابانێك بەردەوام پۆستی نامەی بۆ دێت،
نامەكانیش لە لم زیاتریان تیا نیە.

*

جەستەی ئەم شارە خۆشەی چێژە.
بۆیە ئارەزوو خۆی لە ئارەزوو هەڵدەسوێ و
ئەندامیش فێڵ لە ئەندام دەكات؟

*

سەیرە! هەموو جوانێك لەم شارەدا لەگەڵ لە دایكبوونیدا دەمرێ. كوشتنیش لەناویا سرودێكە پڕ بە گەروی ڕەشەبا.

*

نا، لە شاری (بێ)دا تۆ لە نێوان دیوارێك و دیوارێكی دیكەدا نیت، بەڵكو لە نێوان ساتێك و ساتێكی دیكەدایت.

*

لە شاری (بێ)دا لەژێر هەر شەقامێكەوە شەقامێكی دیكە هەیەو دەستی غوباریان لە سەرە،
شارێكە غوبار مۆرانەی لە مێردمنداڵەكانی داوە.
لە شاری (بێ)دا هەموو كەسێك، دەیەوێت لەبەرد بچێت، تا بتوانێت وەكو ئەو لە حزووری مەرگدا ئامادەبێت.

*

هەموو شەوێ بە دزیەوە كۆمەڵێ تارمایی كە دانیشتن لەماڵەكانی خۆیاندا بێزار دەبن، بۆ ناو شاری (بێ) پێ دزكە دەكەن.

*

ئەی شاری (بێ) پێت دەڵێم:
جەستەی تۆوێك فڕێدەدرێتە خاكێكی ترەوە
ڕۆحیشت چەترێكە تەنها بۆ شەونخونی بەدیار حاڵی جەستەوە شەونخونی دەكات و پێشت دەڵێم: ناوت بەتۆ سڕاوەتەوەو بەناوی یەكێكی ترەوە نووسراوە.
لەو خوێیە مەپرسە كە لە هەناوتا كەڵەكە بوە، هەناوێك كە وەختە ببێتە خوێدانێك بەقەد هەموو زەوی.
بۆیە ئەم شارە تەنها بە مەرجێك شیعری خۆشدەوێ: چەكوشێك هەڵبگرێت و بەشەقامەكاندا بسووڕێتەوە.

*

هەموو شتێك لە زەویەوە هات.
بەڵام بە فێڵێك كە ئەم شارە كردی، یا لەژێر توندوتیژییەكدا كە زەوی دەستبەرداری مافی داهێنانەكانی خۆی بوو و جێی هێشت بۆ ئاسمان.
بەو شێوەیە، هەموو ڕۆژێ ئاسمان ئەم شارە دروست دەكاتەوەو ئەمەش وێنەكەی ئەمڕۆیەتی:
جەستەیەكە وەك قامكێك
لە ئامێرێكدا دەخەوێ كە هەر دەڵێی موستیلەیە.

*

بە و دەشتانەی شاری (بێ)یان دەورە داوە،

بەو پەیکەرانەی سروتی ڕواندن و دروێنەکردن ڕوەکەکانی بەرز دەکاتەوە بۆ ئاسمان،
بە بخوردانی ئەو هەڵمانەی هەناسەکانی ئادەمی لە لا جیوەردی ئەتیردا دروستی دەکات، بەو دەرگاو پەنجەرانەی دەستی خۆر لە ئاسمانی درەخت و گوڵە گەنمەکاندا دەیکاتەوە، بەهەموو ئەمانە، منی دۆشداماو خۆمتان پێدەناسێنم و لە بروسکە دەپاڕێمەوە دەستم بگرێت. لەوانەیە دڵنیات بکاتەوە لەوەی کاتێ دەنگم لێت دەکشێتەوە بەرەو لات دێ، کاتێ لێت جیادەبێتەوە پەیوەندیت پێوە دەکات، بەلام لەلایەکی تری دیکەی مێژوویەکی دیکەوە.

## شاری ( جیم )

مەرگ پێی ناوەتە سەر گەرووی ئەم شارە
ئەوەشی کە مۆڵەتی داوەتێ ژیانە
بەم شێوەیە شاری (جیم) ئاوازی خۆی لەسەر گیتاری مەرگ دەژەنێ

*

"دوا وشەکانت بگێڕەوەو بیانخەرە سەر کولێرەی ئەو چرکەساتانەی بۆت ماونەتەوە":
ئەمە ئەو شتەیە کە بەردەوام دەنگە ئالۆزەکان لە ئاسمانی شاری (جیم)دا دەیلێنەوە.

*

ئەوەی ئەم شارە لە شارەکانی تر جیادەکاتەوە ئەو زنجیرانە نین کە نێشکگری لێوو دەست و پێکانن. ئەم زنجیرانە لە هەموو شارێکدا هەن. زنجیرەکانی شاری (جیم) جۆرێکن لەو شلەیەی لە وشەکان و نیگاو هەندێ جاریش لە ترپەکانی دڵدا گوزەر دەکەن.
دەرەوە بەهەر چوار لایدا دەبێتە زۆنگاوێك کە ئەم زنجیرانە ئاوێزانی دەبن،
زۆرجاریش لە هەوا جیاناکرێنەوە.

*

لە خەیاڵما نەبوو لە شاری (جیم)دا بم، تا ئەوکاتەی ئەندامێك لە ئەندامەکانی لەشم بەتوڕەیی لێم جیابۆوەو هاتەدەرێ.
ئێستاش کە دەنوسم لەبەر ئەوەیە داوای لێبوردنی لێبکەم و بیگەڕێنمەوە بۆ شوێنەکەی خۆی.

*

(ئەوەی لە توانادایە لەوە باشتر نیە کە هەبووە) شاری (جیم) وا دەڵێ. کەواتە لای ئەو جیهان ناگۆڕێت.
وەك دەبینی مەسەلەکە ئەوەیە مرۆڤ لەگەڵ دنیادا بگونجێت، وازی لێ بێنێت بۆ خۆی بڕوات و ئەمیش لەگەڵی بڕوات.

*

ڕۆژانەی شاعیرێکم لەو شارەدا خوێندەوەو ئەم یادگاریانەم لێهەڵبژاردووە:
أ—لە شاری (جیم)دا وشەکان سەرو دەست و قاچیان هەیەو، بۆت نیە پرسیاریان لێبکەیت، بەڵکە دەبێ دوایان بکەویت.
ب—لەم شارەدا دەبێ ئەرکی ئاگر بدرێ بە فیکر.
ج—لە ئاسمانێکی تر ڕامەمێنە، مادام دیلی ئاسمانی ئاخاوتنیت.

د–هاوڕێ شاعیرەکەم بەجۆرێك دەنووسێ وەك ئەوەی خۆی (دروستکەری) زمان بێت. سڵاوی لێبێت. هەروەها دەڵێت: لە شاری (جیم)دا وشەکان زەمینە بۆ شۆڕشە تایبەتیەکەی ژیان خۆشدەکەن:
لە فەرهەنگەکانەوە نا، بەڵکو لەناو جەستەو قوڵاییەکانەوە دێن.
لە سوچ و پەنا و لۆفەکانیا
پاشان دەچنە نێو جیهانەوەو هەمیشە لە زەماوەندد دەبن.
کە تیایدا ئامادە نەبوون جوانترین وێنەی ئامادەگیە.
کە سڕینەوە خۆی ناولێنانێکی تازەیە لە شتەکان.

و–زۆر دواکەوتم لەوەی بۆم دەرکەوێ ئاسمان لە دەرەوەی جەستەی مرۆڤ نیە، بەڵکو لەناویایەتی.

ز–لەهەر کوێ یەقین ببینم پێی دەڵێم:
با سەریشت بەرد بێت
بەڵام لێوەکانت هەوڕن.

ح–واقیع لە شاری (جیم)دا وەك سەراب دەجوڵێت، بۆیە جێگەی خەونی تیا نەماوەتەوە.

ک–چۆن شتەکان فریو بدەم تا ئەو وشانەم بێننەوە یاد کە دەتوانیت بیاندرکێنی؟

ی–نا، نابێ شیعر لەلایەن خەڵکیەوە و لە پێناویاندا دروستکرابێ، بەڵکو دەبێ لەوان دروست کرابێ.

ك–سەرم زیندانێکە دەرگاکانی لەسەر زۆر زیندانی داخستووە، من ئەگەر خۆم ئازاد نەکەم چۆن ئەوانی لێ ئازاد بکەم؟

*

لەهەر ئەزموونێکی نووسینی مەزندا بەتایبەتی لە شاری (جیم)دا گرەو نوسین نیە بەڵکو مێژووە.
بە بۆنەی تاراوگە کردنی شاعیرەوە (هەندێکی تر وتویانە بە بۆنەی مردنی شاعیرەوە)
ئاسمان دەسرێکی سەوزی بەکەمەریەوە بەست و لەگەڵ شاری (جیم)دا کەوتە سەما.

## شاری ( دال )

فۆرمی شت لە شاری (دال)دا شتەکە خۆیەتی، وشە بریتیە لە حەرفەکانی. تۆ ئەی ئەو کەسەی لەناویا دانیشتویت و شەیدای مانایت، جگە لە مەجاز هیچ شارێکی دیکەت لەبەردەمدا نیە.

*

لە شاری (دال)دا زاناکان هەمیشە داسێکیان پێیە زانستەکانیانی بۆ هەلگرتوون. لە کۆڵان و سوچ و پەناو گۆڕەپان و هەندێ جار لەناو قەرەوێڵەکانیشدا شت بەیەکەوە دەبەستن. ئەو سەرانەی خۆیان زاڵبن بەسەریا لە ملیانی جیادەکەنەوە، پاشان دەیننێنەوە بەیەکەوە. زۆرجاریش ڕاستدەکەن:
چونکە ئەم سەرانەش دەبنەوە بە داس.
بەو شێوەیە دەبینین ئەوەی لەم شارەدا پێی دەڵێن فیکر لای هەموو دانیشتوانەکەی قبوڵکراوە، بەتایبەتی کە پەیامەکەی دروستکردنی ئولفەتە لە نێوان ئەمان و شتە باوەکاندا.
بەم شێوەیە هاووڵاتی لە شاری (دال)دا ڕاهاتووە ئیشە بێماناکان بکات و گوتە پیسەکان بڵێتەوە.
لەگەڵ ئەوەشدا شاری (دال) ساتە ئاساتێك بڵاوکراوەی نهێنییان تێدەکەوێت کەوا چاکە منی ڕێبوار جەریەزەیی بکەم و هەندێکیان بۆ خوێنەر هەڵواسم.

أ–بڵاوکراوەیەکی نهێنی: کار ئازادیە. ئەوەی کار نەکات بێ قەوارەیە. کەواتە هیچە ئەو کارەی دەیکەیت و لە وزەت زیاد ناکات. هەموو ئەو ڕۆژانەش پیسە کە دەیانگوزەرێنی بەڵام هیچی زیادە ناخەنە سەر ئازادی و زانینت".

ب–بڵاوکراوەیەکی دی "هەموو هاووڵاتیەك لە شاری (دال)دا، لەجیاتی ئەوەی کرێکارێك بێت دەبێ خۆی بەسەرکاری نیشتمان بزانێ.

وەك ئەوەی نیشتمان عەرشێك بێت و هەر هاووڵاتیەك وەك ئەو کەسە نەبێ کە لەسەر عەرشەکە دانیشتووە دانی خێری پیا نەنرێ، یا تەنها ئەو والیی شارەکە بێت.

ئەم شارە کوێرە لە کوێی بوو سیاسەتێکی بینا دروست بکات؟".

ج–بڵاوکراوەی سێهەم: "سیللای ڕۆمانی ئەیویست ببێتە فەرمانڕەوای گەلێك کە هەموویان کۆیلەن –ڕۆما ئەوکات لەوپەڕی مەزنیی خۆیدا بوو، ئەو فەرمانڕەوایی تەنها لەبەر فەرمانڕەوایی نەدەویست. ئەو کە خۆی ئازاد بوو، دەیویست فەرمانڕەوای ئەوانە بێ کە وەکو خۆی ئازاد بوون".

*

لە شاری (دال)دا کۆمەڵی چرکەساتی مردوو هەن بۆنی ژیانیان لێدێت، چەند چرکەساتێکی زیندووش هەن بۆنی مەرگیان لێدێت. ئەی ئەو شارەی سەردەمێکە بە غوباری خاکە بێ پیتەکان داپۆشراویت– بۆ هەر غوبارت لێ دەنیشێ؟

نا، حیکمەتی تۆ لە سەر پێخەفەکەم دانانیشێنم.

نا، گەمە لەگەڵ ئەم منالی ئێستایە ناکەم کە تۆ گەمەی لەگەڵدا دەکەیت.

*

ئەم هاوارە لە شاری (دال)دا لە کوێوە دێ؟ (ئەمە بۆ شاری (ب)یش ڕاستە) چۆن دەبێ، هەستی پێدەکرێ، دەیبینی.. دەستی لێدەدەیت، بەڵام نایبیستی؟ دیارە دیوارەکانیش هەناسەدانەوەی خۆیان هەیەو ئاسمانیش هەناسە هەڵکێشانی خۆی.

ئاسمان پرسیارەکان دەسڕێتەوە، زەمەن وەك ئەو هەنگاوانەی سەفەر شەکەتی کردبوون لە نزیك دەروازەکانەوە لەنگەر دەگرێ.

ئەی شارەکە قولەپێت بخەرە سەر حەرفەکان، ئەی جەستەکەی، تێکەڵی دەنگ و قسە بە.

لەوە دەچێ بۆ دواجارو تا ئەبەد ئاسمان تۆوەکانی خۆی لەتۆدا ڕواندبێ.

جەستە پەردە پلپلەدارەکەی خۆی دادایەوە، هەموو پەنجەرەکان لە شاری (دال)دا گوێیان هەڵخست. شەویش هەموو ئەو تاڵە دەزوانەی پچڕان کە دەیبەستێتەوە بە هەسارەو بێستانەکانیانەوە. ئەگەر شادیەك هەبێت لە نێوانی ڕانەکانتایە، ئەی مرۆڤ: شاری (دال) وا دەڵێ و هەر شەوی ئەم شارەش یەکەم دەنگ بوو ئەمەی درکاند.

*

ئەوەی باری شانی شاری (دال) ی قورسکردووە (ئەمەی دەیڵێم بەتایبەتی بۆ شاری (بێ)یش دەگونجێ) ئەزەلی مەعریفەیە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا پەڕو نووکەڵیشە. ئەم شارە لەگەڵ یەکەم ئاودا لە دایکبووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەمیشە لە لمی مەرگدا ڕەنگی دەگۆڕێت.

یەکەم تیشکە لە سەدیمی جیهاندا، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لە تاریکیەکاندا ون بووە.

بەڵام چەند دڵخۆشدەبم گەر ووشەکانم بتوانن بەسەر ئەو پلیکانانەدا سەرکەون کە تاڵی و سوێرییەکانی ئەوی بەسەردا سەردەکەون،
بەڵام، بەڵام پێیان ڕۆشن دەبمەوە.
بۆ هەمیشەش لەو خۆڵەمێشە زۆرەدا بانگی دەکەم: ئەی گڕە ستونییەکە!

*

نە لە شاری دال و (نە لە هیچ شارێکی تریشدا) ڕێگا پیشانی تۆ نادرێ. ڕێگات ڕێگای ئەوی دی نیە. ڕێگای تۆ گەڕانە بەدوای ڕێگادا.

*

ناتوانم نەکەومە ناو حەوزی ئەو چرکەساتەوە کە دەیگوزەرێنم. هەموو دەقیقەیەکیش ئاسمانێکی بەستراوە بە ئاسمانێکی ترەوە: ناتوانم بەرز نەبمەوە. تاقە یاخیی دەرەوەی شاری (دال) وا دەڵێ.

*

ڕێگاکانم هەروا بە فشەڵی و جۆراوجۆری دەمێننەوە
چونکە تەنها لە نێوان ڕۆشن و ڕۆشنتردا درێژ دەبنەوە.

*

چەند کامڵە سیستەمی شاری دال، چەند ئاسایشێکی توندو پتەوی هەیە:
بێوەژن و سەگەکان کامڵترین و پتەوترینی ناو ئەم شارەن.
بێوەژنەکان بۆ ڕازاندنەوەی شەقامەکان
سەگاکانیش بۆ پاسەوانی.

**سەرچاوە:**

*بەشێک لە دیوانی (الکتاب)ی ئەدۆنیس، بەشی دووەمیان کە لە (دار الساقي) دەرچووەو لە ژمارە (15ی 1998)ی گۆڤاری (أبواب)دا بلاوکراوەتەوە.*

# گفتوگۆ

- گفتوگۆ لەگەڵ (ژان فرانسوا لیوتار)دا — رامین جەهانبەگلو
- گفتوگۆ لەگەڵ (ئالن فینکل کرۆت)دا — رامین جەهانبەگلو

# گفتوگۆ لەگەڵ (ژان فرانسوا لیوتار)دا

## پۆست مۆدێرنیزم

■ ڕامین جهان بەگلو
● و. لە فارسییەوە: شۆڕش جوانڕۆیی

**پرسیار/** لە یەکەم کتێبتانا "دیاردەناسی" نوسیوتانە: "حەقیقی ترین ئەرکی فەلسەفە، تێگەیشتنە لە مێژوو" داخۆ ئێستاش هەر لەسەر ئەو باوەڕەن؟ خۆ ئەگەر تا ئێستاش پێلەسەر ئەو باوەڕە دائەگرن، ئایا وەك فەیلەسوفێك چۆن ئەڕواننە کۆتایی ئەم سەدەیە؟

**وەڵام:** لە راستیدا من هەمیشە وابیر ئەکەمەوە کە بۆ فەلسەفە تێگەیشتن لە مێژو گرنگترین کارە.

شایەتی ئەمەش ئەوەیە کە تا ئێستاش لەو بارەیەوە زۆر دەنوسم و هەر بۆیە خەڵکی بەم جۆرە بە هزرمەندێکی سیاسی لە قەڵەمم ئەدەن، لە کاتێکدا کە من هەر لە نوسینی یەکەم کتێبمەوە تا ئەمڕۆ زۆر گۆڕانم بەسەردا هاتوە. لەگەڵ ئەوەشدا تەنانەت گریمانەکانم سەبارەت بە (پۆست مۆدێرنیزم) جۆرە شیکردنەوەیەکی ئەو شتەیە کە لە کۆتایی ئەم سەدەیەدا لە خۆرئاوادا ڕوودەدات. کەواتە مێژو


لیوتار

بەجۆرێك تەوەری ئەسڵی کارەکانمە. بەڵام ئەبێت وشەی "مێژو" لە هەمو رویەکەوە لەبەرچاو بگرین،

واتە (مێژو) نەك بە مانای تۆمارکردنی روداوەکان یان مێژوی گشتی و هاوبەشی نەتەوەکان، بەڵکو هەروەها بەمانای ئەوەی کە هەریەکێك لە ئێمە خاوەنی مێژویەکی تایبەتەو لە هەمان کاتدا لێی بێ ئاگاین، چونکە نازانین کە چی دەکەین یان چی ناکەین. کەواتە ئەگەر بە واتایەك وشەی مێژو (*histoire*) بەشێوەیەکی زۆر جدی بەکاربهێنین، واتە بە چەمکی وشە کۆنە یۆنانیەکەی "هیستۆریا" (*historia*) کە بە مانای "لێکۆڵینەوە"یە– لێکۆڵینەوە دەربارەی ئەمری واقیع، نەك زادگاو ئەسڵی واقیع– لەم حاڵەتەدا ئەرکی هەمو فەیلەسوفێکە بەو مانایە (چەمکە) لە مێژو تێبگات.

**پرسیار/** ئایا ئێوەش وەك (فۆکۆ یاما) لەو بڕوایەدان کە قسەکردن لەسەر جۆرێ "کۆتایی مێژو"، شێوەیەکی دروستە بۆ شیکردنەوەی گۆڕانکاریەکانی جیهانی ئەمڕۆمان؟

**وەڵام:** لەو بڕوایەدام کە هیچ جۆرە (کۆتایی مێژویەك) وجودی نییە، قسەکردن لەسەر (کۆتایی مێژو) شتێکی بێمانایە، ئەوەی رویداوە، ونبون و ئاوابونی ئەو مەسەلانەیە کە بەهۆیەوە ژمارەیەکی زۆر لە خۆرئاوایەکان -وە نەك تەنها خۆرئاوایەکان– لە مێژویان دەکۆڵیەوە واتە (لانی کەم لە دو سەدە لەمەوبەرەوە تا ئێستا) تێگەیشتن و وێنەکردنی مێژویان بە شێوەیەکی تراژیدی لە نێوان دوو ئەسڵدا (وێناکردن) دەبینی. (ئەمە تەنانەت سەبارەت بەو وێنەیەی جیهانیش راستە کە قەشە (ئاوگوستینوس) لە کتێبی (شاری ئیلاهی)دا بۆمان دەرئەخات، ئەم دو ئەسڵەش یەکێکیان (دەسەڵات) بو، ئەوی دیکەش دژ بە (دەسەڵات) بو، وە ئەبوایە هێزی ئەو دەسەڵاتە وەدەست بهێنێ بۆ ئەوەی بەهۆیەوە کاروبارە ئینسانیەکانی رێك بخات، ئیدی چیەتی (ماهیت) ئەو رێکخستنە هەرچۆنێك بێت. قەشە (ئاوگوستینوس) هەر مەبەستی ئەمەبو کە قسەی لەسەر رزگاربون لە گوناهەکان (*redemption*) ئەکرد. ئەو ئازادیەی کە رۆشنگەری لێکەوتەوە هەر ئەمەبو، هەروەها ئەندێشەی کۆمەڵگای تایبەتی کرێکاران کە (مارکس) بیری لێئەکردەوە هەر ئەمەبو. لەو بڕوایەدام کە ئەم جۆرە وێنەیە بۆ جیهان، بگرە جۆرە کارکردنە لە جیهاندا، لەمێژە لە ئارادایە، چونکە ئەمە تەنها ئایدیۆلۆژیایەك نییە، بەڵکو جۆرە کردەیەکی (عمل) سیاسی و کۆمەلایەتیشە. کەواتە لە راستیدا ئەم هزرە (فکر) "کۆتایی مێژو" پەیوەندی بە چەمکی تراژیدیەوە هەیە، تراژیدیایەك کە تیایدا وەك شانۆنامەکانی (شکسپیر) لە لایەکەوە پاشایەکی (درۆزن) و (داگیرکەر) ئەبینرێ، لەلایەکی تریشەوە، پاشازادەیەکی راستەقینە کە شایستەی ئەوەیە کۆمەڵگا بەڕێوە بەرێ، بەڵام دەسەلاتی لە دەست دەرچووەو ئەبێ سەرلەنوێ بەدەستی بهێنێتەوە. ئەم وەزعە لە کێشمەکێشی نێوان میلەتانیشدا بەرچاو ئەکەوێ، تەنانەت لەناو خودی میللەتەکانیشدا.

من ساڵانێك لەمەوبەر، لانی کەم لەسەردەمی نوسینی کتێبی (هەل و مەرجەکانی پۆست مۆدێرنیزم)دا، رێگاچارەی مارکسیستی رادیکاڵ، دژە ستالینی، و دژە ترۆتسکیم خستە لاوە (چونکە لەو بڕوایەدام کە ترۆتسکیەکان لەو شتانە تێ نەئەگەیشتن کە لە یەکێتی سۆڤیەتدا رویان ئەدا). ئێمە لەناو گروپی "سوشیالیزم یان بەربەری" نەك هەر تەنها رەخنەمان لە (ستالین) ئەگرت، بەڵکو رەخنەمان لە سەرمایەداریش ئەگرت کە لەو سەردەمەدا دوای رزگاربون لەو قەیرانەی کە (30) ساڵی خایاند، واتە پاش هەردو شەڕە جیهانیەکە، لە لوتکەی گەشەکردن و هەروەها خەریکی چاککردنەوەی خۆی بو. باشە، ئیدی ئەمڕۆ وازم لەو جۆرە بیرکردنەوەیە هێناوە. من بڕوام بەوە کردووە

کە هەڵەیەك لەم وێنەیەدا هەبوو، هەروەها ئەم کارەش دروست نەبوو، چونکە من ڕۆشنبیرێکی مولەزیم (متعهد) بووم. لەبەرئەوە بە بڕوای من هیچ نیشانەیەك لە بکەرێکی (فاعل) دیکەی مێژوویی بەرچاو ناکەوێت کە، چاوەڕێی ئەوەی لێ بکرێت دەسەڵات بەدەستەوە بگرێت، و ئەو ئاماژانەش کە هەوڵماندەدا لەسەر ئاستی ململانێی چینایەتی ئاشکرای بکەین، هیچ مانایەکیان نەبوو تەنانەت خەباتەکانی دژ بە کۆلۆنیالیزمیش لەم ڕووەوە هیچیان دەرنەدەخست و نەیاندەتوانی ئیمپریالیزم بڕوخێنن. سەرەڕای ئەمانەش لە (*1968*)دا لە ڕیزی پێشەوە بوم، چونکە لە (نانتر) مامۆستای زانکۆ بوم و شێلگیرانە سەرقاڵی کارکردن بوم لە ناو جوڵانەوەی خوێندکاراندا، بەڵام ئەمزانی کە ئەم جوڵانەوەیە شۆڕش نیە، بەڵکو شتێکی دیکەیە. هەروەها من لەو بڕوایەدا نیم کە مێژو کۆتایی هاتوەو لە ڕاستیشدا نازانم مانای ئەم قسەیە چییە. تەنها ئەوە ئەزانم کە بە تەواوی ڕێڕەوی مێژو گۆڕاوە، و ئێمە ئێستا لە سیستمێکدا ژیان بەسەر ئەبەین کە هیچ ڕەقیبێکی لە بەرامبەردا نەوەستاوە. ئێستا لە دوای هەڵوەشانەوەی ئیمپراتۆری شورەوی و (لینینیزم) هیچ جێنشینێکی ڕاستەقینە لە ئارادا نییە. ئەو کێشمەکێشەی ئێستاش ڕوئەدا لە پەراوێزی خودی سیستمەکەوە هەڵدەقوڵێ، (پەراوێزێك) بەدەست سیستمەکەوە ئەناڵێنێ. کەواتە ئێمە لە قۆناغێکی مێژوویداین کە تیایدا چیدی تراژیدیا بوونی نیە، مەبەستم لە تراژیدیای (بون ناسی)یە. ئەڕو کێشەگەلێك لە ئارادان کە دەکرێ ترسناك بن، بەڵام لەو ئاستەدا نین کە بتوانن ڕێڕەوی گشتی کۆمەڵگا بگۆڕن. کەواتە ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە ئیدی (مێژوویەك) بونی نییە، بەڵکو ئەوە ئەگەیەنێت کە سیاسەت لە وڵاتە پاش پیشەسازیەکاندا (مابعد صنعتی)، عیبارەتە لە ئیدارە کردنی باش یان خراپی ڕەوەندە کۆمەڵایەتیەکان، جوڵانەوەکانی خەڵکی، ئاڵوگۆڕی پارەو.. هتد.

**پرسیار/** لە یەکێك لەو وتارانەی ئەم کتێبەی دوایتان کە بڵاوکرایەوە واتە "ئاکارەکانی پۆست مۆدێرن" نوسیوتانە: "لە کێبەرکێی نێوان سیستەمەکاندا، تایبەتمەندی دەستنیشانکەری کرانەوەو "گەمە"یە (تایبەتمەندیەك) کە ئەم سیستمانە لە کارکردنیاندا دەیپارێزن".مەبەستان لە وشەی گەمەکردن چییە؟

چونکە لە یادمە لە کتێبەکانی سەرەتاتاندا لەسەر ئاستی زمان قسەتان لەسەر "گەمەکردن" ئەکرد، ئایا مەبەستان هەر ئەو (گەمەکردنەیە)؟

**وەڵام:** نەخێر! مەبەستم ئەوەیە کە ئەم سیستمە لە *30* ساڵ لەمەو پێشەوە تا ئێستا بەهێز بووە، سەرمایەداری تەنکترو ناسکتر بووە، ئاڵۆز بوە، سەرمایەداری تەواوی قەڵەمڕەوەکانی فەرهەنگی بەرەو لای خۆی کێش کردوە، کەواتە بەو هێزە لە رادە بەدەرەیەوە تەواوی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکانی گەیاندۆتە ئاستی بازرگانی. ئەم وتارە دەقی وتاربێژیەکە (سخنرانی) کە لە ئەمەریکا پێشکەشی ئۆستە مارکسیەکانم کرد، کە هیچ ئەزمونێکیان لەسەر تێکۆشان و ململانێی سیاسی نەبو. ئەمویست تێیان بگەیەنم کە سیستمی سەرمایەداری وێڕای تایبەتمەندی لە ڕادەبەدەری توتالیتری– لەو ڕووەوە کە هەمو جۆرە نوێنەرایەتیو چالاکیەك هەڵئەوەشێنێتەوە– بەهۆی نەرمی و دەق نەگرتویەوە (نادۆگمایەوە) تەواو بەهێزە، چونکە تەنانەت لەوپەڕی ئاستەنگدا دەرفەتێك بۆ (گەمەکردن) ئەهێڵێتەوە، بە جۆرێك کە داهێنانی تازەو شتە نوێکان بتوانن دەربکەون و ڕۆحیەتی هەڵسان بەکارو ڕوداو بونی هەبێت و کەسانێکی وەك

من و تۆش بتوانین رەخنەی لێ بگرین. ئەم رەخنەگرتنە تۆمار ئەکرێت و سیستمیش کەڵکی لێ وەرئەگرێ. ئەمە گرنگترین بیرکردنەوەیە. ئەمە تەواو وەك ئەوەیە کە لە تاقیگای زانستدا بین. سەرەتا ئەبێ بیربکەینەوەو، پاشان سەیر بکەین و، دواجاریش هەوڵ بدەین کە ئەو شتانەی بینیومانە بیسەلمێنین. بەڵام لە راستیدا سیستمی سەرمایەداریش وەهم و خەیاڵی خۆی هەیە. کەواتە ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە بە تەنها مێژوویەك لە ئارادا نییە، بەڵکو روبەڕوی چەند مێژوویەکین، کەواتە ناتوانین قسە لەسەر کۆتایی مێژو بکەین، مەسەلەکە ئەوەیە کە بزانین ئایا ئەتوانین ئەم سیستمە کۆنترۆڵ بکەین یان نەء؟

**پرسیار/** بەڵام ئایا ئەرکی فەیلەسوفێکی (پۆست مۆدێرن) ئەوەیە کە مەودای نێوان هەریەك لە گەمە سیاسیەکان بپارێزێ، هەر بەو شێوەیەی کە ئێوە ئەم حاڵەتەتان سەبارەت بە گەمە زمانەوانیەکان وەسف کردوە لەو کتێبەتاندا بەناوی "بەراستی" (بدرستی)؟

**وەڵام:** ئەسڵەن لە گەمەکانی زمان ناچێت، چونکە پەیوەستن بە دو ئاستی جیاوازەوە. (زمان) لەناو چوارچێوەی (بون ناسیدا) جێگایەکی تایبەت بەخۆی هەیەو، هەر بۆیە منیش هەوڵ ئەدەم بە ئیلهام وەرگرتن لە دیدگای (ویتگنشتاین) لە کتێبی (رێك نەکەوتن)دا وەسفی ئەم حاڵەتە بکەم. ئەو (گەمە) کردنەی کە من لێرەدا قسەی لەسەر ئەکەم، جۆرە میکانیزمێکی ناسکە کە دەکرێ بە سیستمێکی لە قەڵەم بدەین، کە لە ناخی سیستمێکی (تەرمۆدینامیکدایە) کە لە شەڕدایە لەگەڵ (ئەنترۆپیدا) و گەشە بەدژە (ئەنترۆپیەکانی) ئەدا. ئەمە سیستمێکە کە وزە هەڵئەلوشێ، بەڵام لە هەمان کاتدا ئەشتوانێ جێگۆڕکێ بەو وزانە بکات. ئەم سیستمە بەردەوام لە حاڵەتی گەشەکردندایە. کەواتە دەبێ فەیلەسوفێکی (پۆست مۆدێرن) چی بکات؟ ئەرکی ئەو بیرکردنەوەیە دەربارەی ئەم وەزعەو هەوڵدانە بۆ تێگەیشتن لە کارکردی ئەم جۆرە سیستمە. بەڵام ئەرکێکی تری ئەوەیە کە، ئەو تەسەورو (تەعەهودە) ساویلکانە بە شتێکی بێ نرخ لە قەڵەم بدات کە سەبارەت بە دابەشکردنە کۆنەکانی وەك (راست–چەپ) لە ئارادان، گوایە نازانێ کە ناکۆکی نێوان (چەپ– و راست) لەسەر شێوەی بەڕێوەبردن و مەسەلەی موچە سەرمایەگوزاری و مەسەلەی کۆچکردنە. ئەمە بە تەواوی ئەسڵی ناکۆکیەکەیە. لەم جۆرە مەسەلانەدا گۆڕانی (*1*|*10*)ی بودجەکان دەرئەنجامێکی گەورەی لێ ئەکەوێتەوە، بەڵام بە پێچەوانەی سەردەمی لاوێتیم واتە بەر لە جەنگی دوهەمی جیهانی، ئێستا هیچ کەسێك ئامادە نییە خۆی لە پێناوی دروشمەکانی (راست– چەپدا) بکاتە قوربانی. لەو بڕوایەدام کە ئێمە نەك "لە کۆتایی مێژو" بەڵکو لە کۆتایی رزگارکردنە جیهانیەکان کۆتایی پاڵەوانبازیە تاکە کەسیەکانین (پاڵەوانبازی) بە مانای بەرگریکردن لە ئامانجێکی دیاریکراو و مردن لە پێناوی ئەو ئامانجەدا. بەڵێنی ئەوەت ئەدەمێ کە ئەمڕۆ تەنانەت راستێکی توندڕەویش ئامادە نییە لە پێناوی بیروباوەڕەکەیدا خۆی بە کوشت بدات، و بەهەرحاڵ بێگومان "لوپن" (*Lepen*) ئەمە ناکات.

**پرسیار/** بەڵام چۆن فەیلەسوفێك ئەتوانێ، خۆی لە زەرەرو زیانی ئەو سیستمە بپارێزێ کە ئێوە وەسفی ئەکەن؟

**وەڵام:** هیچ چارەیەك نییە. من دو پێشنیارم هەیە، یەکەم کاتێك کە ئەنوسین، کاتێ فەلسەفیانە بیر ئەکەینەوە، مەسەلەکە ئەوەیە کە بزانین بۆچی بابەتی فەلسەفی ئەنوسین. ئەگەر مەبەستمان

راکێشانی وەرگرانی (مخاطب) تازەو زیادبونی خوێنەران و سەرئەنجامیش فرۆشتنی زیاتری کتێبەکانمان و سەرکەوتنمان لە بازاڕی کتێبدایە، لەو بڕوایەدام گوناهمان کردوە. من بە ئانقەست وشەی (گوناە) بەکار ئەهێنم چونکە لە راستی‌دا کاتێك کە فەیلەسوفێك بیر ئەکاتەوە، کاتێك کە قسە ئەکات، هەوڵئەدات وەلامی مەسەلەیەك بداتەوە کە سەختترە، ئەمەش وەك پێویست کێشەی خەڵکی نی‌یە. کاتێکیش کە فەیلەسوفێك دەربارەی مەسەلەیەك ئەنوسێت، تەنها لەبەر ئەوەیە کە دەیەوێت خۆی بزانێت ئەو مەسەلەیە چی‌یە. کەواتە وەرگر نەناسراوە. بەلام بەهەرحاڵ بەرهەمەکانت ئەرشیف ئەکرێن، چونکە سیستم هەمو شتێك ئەرشیف ئەکات. کەواتە تەنانەت ئەگەر ئێوە دەستنوسێکی بچوکی خۆتان لە (*200*) نوسخەداو لە شارێکی دوری وەك (سویس)دا بلاو بکەنەوە، ئەویش ئەرشیف ئەکرێ، و ئەویش ئەچێتە ناو کۆمپیوتەرەکانی کتێبخانەی کۆنگرەشەوە لە (واشنتەن). ئەمە کارێکی زۆر ئاسانەو لەوانەیە رۆژێك لە رۆژان کەڵکی لێوەربگیرێت. سەرنج بدە، لەم حاڵەتەدا هیچ پەناگەیەك نیە، بەلام خۆ رەنگە بەرهەمەکەتان رۆژێك بێت کەڵکی لێ وەربگیرێ. ئەمە رێك وەك ئەوە وایە کە (ئەنشتاین) کتێبی (نسبیەتی) بلاوکردەوەو دوای (*10*) ساڵ ئینجا خەڵکی بایەخی ئەو کتێبەیان بۆ دەرکەوت و کەڵکیان لێ وەرگرت. کەواتە لەم روەوە هێڵی فەلسەفە زۆر ئاشکراو رونە: پاراستنی ئەو شتەی کە پرسیار ئەکات و لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا ناتوانێ پێناسەی بکات. ئەمە بەو مانایە دێت کە دەبێ فەیلەسوف ئەرکی خۆی وەك هاولاتیەکی هۆشیار ئەنجام بدات، واتە بەشداری بکات لەوەدا کە چ شتێك دادپەروەرانەیەو چ شتێك دادپەروەرانە نیە. بەلام بۆ ئەوەی کارێکی لەو جۆرەش ئەنجام بدەین، پێویست ناکات هەر فەیلەسوف بین.

**پرسیار/** بەلام دەکرێ چۆن لەم کۆمەڵگایەی ئێستاماندا لە پێناوی دادپەروەریدا بجەنگین، لە کاتێکدا کە ئەبینین رێساو پێوەرێکی دیاریکراو لە پێشەوە بۆ یاساو دادپەروەری دانراوە؟

**وەلام:** بەر لە هەمو شتێك نمونەیەکی زۆر لە ئارادایە، کە لەوێدا پێودانگەکان ئاشکرا نین، تەنانەت لە سیستمێکی کۆماریشدا کە دەبێ تیایدا سەبارەت بە مەسەلە جۆراوجۆرەکان بڕیار دەربکەین. من مەست دەکەم مەبەست لە بەرپرس بون لە بەرامبەر چەمکی دادپەروەریدا کە کەسێك تەقەلا ئەدات بۆ خۆی شکڵ بەندی بکات، ئەوەیە کە بڵێت "سەرنج بدەن، هیچ رێسایەکی لەمەوپێش دانراومان نیە" ئەرکی من ئەوەیە کە یاسا بدۆزمەوە، ئەرکی منە کە ئەوە دیاری بکەم کێ لەسەر (حەقە) و کێ لەسەر (حەق) نی‌یە. ئەرکی من ئەوەیە کە لایەنگری لەفلانە کەس یان فیسارە کەس بکەم. یان بپرسم کە ئایا حەتمەن پێویستە کە لایەنگری لەلایەك بکەم؟ ئەبێت خۆمان کێشمەکێشی نێوان دو لایەن بخولقێنین، هەندێ جار حاڵەتەکان ئاسانتر دەرئەکەون، بەلام کاتێك لە کۆمەڵگایەکی یەکجار ئاڵۆزدا ژیان بەسەر بەرین، حاڵەتەکان وردە وردە ئاڵۆزتر دەرئەکەون.

**پرسیار/** ئایا دواجار مەسەلەکەی ئێمە هەمان مەسەلەی تراژیدیای "ئەنتیگۆنای" سۆفۆکلیس‌ە؟

**وەلام:** بە هیچ جۆرێك. دیارە لە دیدگای مەسەلەی دادپەروەریەوە نمونەیەکی زۆر باشە. دژایەتی و ناتەبایی نێوان یاساکانی کۆمەڵگاو یاسا دەرونیەکانمان بەردەوام لە ئارادان. تەنانەت لەوانەیە لە هەندێ حاڵەتدا یاسا پەسەندکراوەکانی پەرلەمانێك لە دیدگای کەسێکەوە، نادادپەروەرانە

بێتە بەرچاو ئەگەرچی ئەندامەکانیشی بەشێوەیەکی دیموکراتیانە هەڵبژێرابن.

**پرسیار/** چەند ساتێك لەمەوبەر قسەتان لەسەر چەمکی ئەرشیف و هەروەها ئەو راستیە کرد کە سیستم هەمو شتێك ئەرشیف ئەکات و ئەیپارێزێ. بەلام من لە یەکێك لە بەرهەمەکانتدا ئەو ئەندێشەیەم بینی کە "پۆست مۆدێرنیزم فەرامۆش کردنی مۆدێرنیتەیە".

ئەمە بەو مانایەیە کە لە جیهانی ئێمەدا بەشێك ئەرخان کراوە بۆ (فەرامۆشی)، ئایا ئەمە راستە؟

**وەلام:** بەتەواوی راستە. (فەرامۆشی) بەشێکی زۆری لە جیهانی ئێمە داگیرکردوە. ئەمە فەرامۆشیەکە کە هەمیشە بەیاد دەمێنرێتەوە. ئەمە خۆی (پارادۆکسێکە) و رەنگە تەنها نیوەشی بێت. چونکە ئەو شتەی کە (سیستم) بەشێوەیەکی حەتمی فەرامۆشی کردوە، چیدی نایەتەوە یادی. (فەرامۆشی) کردەوەیەکە کە ئیدی نایەتەوە یاد چونکە ئەرشیف نەکراوە، کردەوەیەکە لە ئێستادا حزوری هەیە، بەلام لە رابوردودا ئەرشیف نەکراوە. خاوەن دیدی رەخنەگرانە بوون بەتەواوی ئەمەیە، کارێك کە لە ئێستادا ئەنجام ئەدرێ، بەلام لێناگەڕێ (واتە سیستەم لێ ناگەرێ) بە ئاسانی ئەرشیفی بکەن.

**پرسیار/** ئایا ئەم تێروانینە فەلسەفیە رێنمایمان ناکات بەرەو (نسبیگەرایی گشتی)؟ ئایا ئێوە رازین بەوەی کە جیاوازی لەنێوان (نسبیگەرایی) و (پۆست مۆدێرنیزمدا) دابنرێ؟

**وەلام:** زۆرجار (پۆست مۆدێرنیزم) بەرووبەرێك ئەزانن بۆ سەرهەڵدانی (نسبیگەرایی) یان تەنانەت فرەیی و زۆربوونی گشتی. بە بروای من ئەمە (پۆست مۆدێرنیزم) نییە. من بە دیدێکی زۆر رەخنەگرانەوە ئەڕوانمە (پۆست مۆدێرنیزم)، هەر لەبەر ئەوەیە کە لە بەرهەمەکانی (کانت) و لە رەخنەی سێهەمدا: واتە (رەخنە لە هێزی داوەری) بەدوای رەگ و ریشە فکریەکانی خۆمدا ئەگەڕێم، چونکە بە پێچەوانەوە کاتێك ئەبینم هیچ پێودانگێك بۆ داوەری کردن نییە (وەك ئەوەی کە کانت ئەیڵێ) دەبێ ئەوکاتە جدیتربین لە دەربڕینی ئەوەی کە دەڵێ "ئەمە جوانە" یان "ئەمە راستە". وا هەست ئەکەم لە (کانتەوە) نزیکم، هەرچەندە (کانت) کەسێکی (نسبیگەرا) نەبو. (نسبیگەرایی) ئەندێشەیەکی زۆر ساویلکانەیە. ئەبێ بە دەربڕینێکی (کانتی) قسە لەسەر هەل و مەرجە مەعریفیەکان بکەین دەربارەی ئەوەی کە بڵێین "ئەمە جوانە" یان "ئەمە راستە".

بەم جۆرە ئەندێشەیە لەگەڵ دیاریکردنی "هەل و مەرجە مەعریفیەکان"دا کۆکم. هەر بۆیە من (نسبیگەرا) نیم. بەلام لەو بڕوایەدام کە جیهانی ئەمڕۆ، جیهانی (لێبوردن خوازی و ئاسانکاری) بێت. واتە جیهانێکی پڕ لە ئاشوب کە تیایدا چیدی "یاسا" بونی نیە، ئیدی چەمکەکانی وەك (پێشکەوتن)و (ئازاد کردن) مانایەکیان نیە، چونکە چیدی (یاسا) بونی نیە. جیهان تەواو ناآرامەو خۆرئاواشی تێوە گلاوە.

**پرسیار/** ئایا ئەمە ناآرامی ئەو شەقامانەیە کە بە هیچ شوێنێك -بەمانا هایدگەریەکەی- ناگەن؟

**وەلام:** خۆتان ئەزانن کە من (هایدگەری) نیم، بەلام لەگەڵ ئەو ئەندێشەیەی (هایدگەردا) کۆکم کە ئەڵێ "بون لە جیهاندا" بونێکی ناآرامە". ئاشکرایە کاتێك رەخنە لە بەها سونەتیەکان ئەگرن، توشی ناآرامی ئەبن، چونکە بەرەو روی بیرۆکەی بەرپرسیارێتی ئەبیتەوە. ئەو بیرەی کە ئەڵێ "من کێم" "لەکوێدا لەنگەرم گرتووە"؟ "ئەبێ چی بکەین؟" تەواو وەك دیدگاکانی (فرۆید) وایە کە لە کتێبی "ژیارو ناخۆشیەکانی"دا قسەی لێ کردووە ئەمە هەر ئەو ئەندێشەیەیە، واتە چەند ژیار بەرەوپێش ئەڕوا گەشە ئەکات هێندەش بەهاکانی

لەناو دەبات، بە نابوت کردنی سومبولەکانیشی ئەم حاڵەتی نائارامییە توندتر ئەبێت.

**پرسیار/** دەکرێ بۆ چرکە ساتێك بگەڕێینەوە سەر چەمکی (پۆست مۆدێرن)؟ چونکە وا تەسەور ئەکەم هەندێك شتی شاراوەو نادیار لە پەراوێزی ئەم چەمکەدا بن. ئەم چەمکە چ چەپ و چ راست بەشێوەیەکی گومڕاکەرانە سەبارەت بە سینەما، ئەدەبیات، کۆمەڵناسی، و فەلسەفە بەکاری ئەهێنن. ئایا لە (*15*) ساڵ لەمەوبەرەوە کە کتێبی (هەل و مەرجەکانی پۆست مۆدێرنیتان) بڵاوکردەوە، تا ئێستا هیچ گۆڕانێکتان بەسەر بیروڕاکانتانا هێناوە سەبارەت بەم بابەتە، یان ئێستاش (پۆست مۆدێرنیزم) هەر بەو جۆرە پێناسە ئەکەن؟

**وەڵام:** لەو بڕوایەدام کە تۆزێك مانای وشەکەم فراوانتر کردووە. چونکە (*15*) ساڵ لەمەوبەر زانکۆی (کەبك) داوای لێکردم کە گوزارشێك سەبارەت بە باروبۆخی (مەعریفەت) لە کۆمەڵگا پیشەسازیە پێشکەوتوەکاندا ئامادە بکەم. لەبەرئەوە من کارێکم سەبارەت بە زانکۆو تیۆری زانستی ئەنجامدا. بەڵام لەو سەردەمەوە تا ئێستا وشەی (پۆست مۆدێرنیزم) زۆر بڵاوبۆتەوەو هیچ پەیوەندیەکی بە ئەندێشەی (مۆدێرنیتەوە) نەماوە کە بە قسەی ئێوە جۆرە بەرگریکردنێکە لە بەرامبەر (فەرامۆشی)دا. ئێستا عادەتم کردوە کە بڵێم "وریابن ئێستا پۆست مۆدێرنیزم مانایەکی تر لە خۆ دەگرێت".

ئەتوانم سێ نوسەری سەدەی شانزە دەست نیشان بکەم کە (پۆست مۆدێرن) بون. یەکێك لەوانە (مۆنتنی)یە لە بەرامبەر رەوایەتە گەورەکانی مەسیحیەتدا. وتارەکانی (مۆنتنی) جۆرە فەرامۆشیەکی بێکۆتاییە. یەکێکی تریان (میکافیلی)یە کە نیسبەت بە سیاسەت بە (پۆست مۆدێرنیزم) دائەنرێ، چونکە سیاسەتەکەی ئەو نەوەك سیاسەتی (رۆم) وابو، نەوەك دەوڵەتە کۆماریەکان، بەڵکو فەرامۆش کردنی سیاسەت بو وەك "رزگارکردنی تاوانەکان" (*Redemption*) ئەوی دیکەیان (سیرڤانتسە)، لەبەر ئەوەی کارەکەی ئەو فەرامۆش کردنی ئەو شتە بو کە بڕیار بو ببێت بە رۆمانی (بورژوا)، واتە نوسین دەربارەی کەسێك کە ئەیتوانی ببێت بە (قارەمان). کەواتە لە راستیدا ئەم سێ کەسە لەو نوسەرانەن کە لە ئاسۆی مۆدێرنیتەی دوهەمدان. واتە ئەوەی کە ئیتالیەکان پێی ئەڵێن (ریسور جیمنتو) (*Resorgimento*). ئەوان یەکتریان نەئەناسی، بەڵام هەریەکەو لە بواری خۆیدا دەستی کرد بە رەخنەگرتن لە (فەرامۆشی و بیرچونەوە).

**پرسیار/** لە راستیدا ئەم سێ نوسەرە پێش سەردەمەکەی خۆیان کەوتبون و بیریان لە ئاینده ئەکردەوە.

**وەڵام:** بەڵێ چونکە لەم حاڵەتانەدا، جۆرە قابلیەتێك سەبارەت بە (بێ بڕوایی) لە ئارادایە، واتە بێباوەڕی لە بەرامبەر ئەو شتەدا کە وەك شتێکی (ئایدیال) بەسەرماندا ئەسەپێت، ئایدیالێك کە بۆ هەرسێکیان وەك یەك وابو. بێگومان ئەم جۆرە رەخنەیە لای (جویس) و (بیکیتیش) ئەبینین. بێ بڕوایی لە بەرامبەر (ئایدیالێك)دلو گەلالە کردنی ئەو پرسیارە بنەڕەتیەی کە ئەڵێ "نیگارکێشان چیە؟" لای "سزان" و (ڤان کوخیش) ئەبینین. لە دیدی ئەوانەوە نیگارکێشان جۆرە ستایش کردن و یادهێنانەوەیەك نیە، لە دیدی (جویس) و (بیکیتیش)دا هەر بەو جۆرەیە لە ئاستی زماندا. نەخێر لەم حاڵەتەدا جۆرە زەمەن بەندیەکی دیکە لە ئارادایە. ئەم (زەمەن بەندیە) جیاوازی هەیە لەگەڵ سەردەمی (مۆدێرنیتەدا) کە بریتیە لە رازانەوەی یەك لە دوای یەکی قۆناغەکانی گەشەکردنی یەك شت. بەڵام لە پۆست مۆدێرنیزمدا هیچ گەشەکردنێك بەرچاو ناکەوێت، ناتوانین بڵێین (بیکیت باشترە لە مۆنتنی)، ئەم قسانە هیچ مانایەك نادەن

بەدەستەوە. کەواتە چارەنوسی (پۆست مۆدێرنیزم) روبەڕوی گۆڕانکاری بۆتەوە، ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە لە راستیدا چیدی ناتوانم خۆم تەرخان بکەم بە وەزعیەتی گوتاری زانستیەوە (هەر بەو جۆرەی 15 ساڵ لەمەوبەر ئەنجامم ئەدا)، بەڵکو خۆم سەرقاڵ ئەکەم بە هونەرو سیاسەت. بێگومان ئەمە ئاڵۆزترە لەبەرئەوەی کە کاری ئێمە چیدی دیاری کردنی نیشانەی نەخۆشیەکان نی‌یە لەم کات و ساتەی ئێستادا، بەڵکو بیرکردنەوەیەکی گشتی ترە دەربارەی ئەو شتەی کە مانای ئەندێشەو نوسین لەخۆ ئەگرێت.

**پرسیار/** ئایا لەو بڕوایەدان کە مەترسی ئەوە هەبێت کە (پۆست مۆدێرنیزم) جێگەی فەلسەفەی مێژو بگرێتەوە، لەکاتێکدا کە خەریکی رەخنەگرتنە لە فەلسەفەکانی مێژو؟

**وەڵام:** ئەگەر ئەوە ناوبنێین (پۆست مۆدێرنیزم)، رەنگە بەو جۆرەی لێ بێت. بەڵام من هیچ کاتێك قسەم لەسەر (پۆست مۆدێرنیزم) نەکردوە، ئەمەریکیەکان پاشگری (ئیزمیان) بۆ (پۆست مۆدێرن) زیادکردو دەستیان کرد بە قسەکردن لەسەر (پۆست مۆدێرنیزم). من لە (پۆست مۆدێرن)دا (*Post moderene*) هەم بەشێوەی ناو هەم بەشێوەی ئاوەڵناو قسەم لەسەر (پۆست مۆدێرنیتە) (*Post modernite*) کردووە. بەڵام هیچ کاتێك (پۆست مۆدێرنیزمم) (*Post modernisme*) بەکار نەبردوە. چونکە (پۆست مۆدێرنیزم) گۆڕاوە بە جۆرێ لە فەلسەفەی مێژو، و پێی وایە فەلسەفەکانی دیکەی مێژو وجودیان نی‌یە. ئەم قسانە بێمانان. لەم حاڵەتەدا ئێمە روبەڕوی هەڵەیەکی (لۆژیکی) ئەبینەوە، واتە ناکۆکیەك لەنێوان زاراوەکاندا. دروست هەر بەو شێوەیەی (ئەرستۆ) ئەیوت، کە ناتوانین "ئەسڵی ناکۆکیەکان" پیشان بدەین چونکە مەسەلەی پیشاندان خۆی پێویستی بە "ئەسڵی ناکۆکی‌یە"کەیە.

**پرسیار/** لە کۆتایی ئەم وتووێژەدا، حەز ئەکەم بیروڕاتان بزانم دەربارەی وەزعی فەلسەفە لە جیهانی ئەمڕۆی خۆرئاوادا، چونکە لە وتارێکدا لە ژێر ناوی (*anima minima*) لە دواهەمین کتێبتاندا (ئاکارەکانی پۆست مۆدێرن) روبەڕوی ئەم رستەیە بومەوە کە "نیشانەگەلێك لە ئارادان، ئەوە دەرئەخەن کە ژەهری جوان ناسی، فەلسەفەشی ژەهراوی کردوە تا ئەو ڕادەیەی کە ئومێدەوارە لەناو جوان ناسی‌دا، دەرمانێك بۆ ناکامیەکانی بدۆزێتەوە" مەبەستان لەم قسەیە چی‌یە؟

**وەڵام:** من چیدی هێندە بەها بۆ فەلسەفەی هاوچەرخ دانانێم، تەنها چەند فەیلەسوفێکی هاوچەرخی ئەوروپاو ولاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا نەبێت، گەرچی ئەوان هیچ بەهایەك بۆ من دانانێن. ئەگەر مەبەستان لە فەلسەفەی ئەم سەردەمە ئەو فەزایە بێت کە (دەقە) فەلسەفیەکانی ئێستای وێنەی دەکەن، ئەوە مایەی سەرسوڕمانە لام لە کاتێکدا دیقەت ئەدەم کە، فەیلەسوفەکانی ئێستا زیاتر خۆیان سەرقاڵ کردووە بە مەسەلەی (جوان ناسیەوە).

سەدەیەك لەمەوبەر بنەمای زانکۆیی و (ئەکادیمی) رەسمی فەلسەفەو فێرکاری فەلسەفی، تیۆری زانست و (مەعریفەت ناسی) بو. وەزعی فەلسەفە لە ئەڵمان و ئینگلستان و تەنانەت فەڕەنساش هەر بەم جۆرە بو.

بەڵام ئەمڕۆ بارستایی ئەو کارانەی کە ... دبارەت بە (جوان ناسی) ئەخرێنەڕو، یەگ[illegible]ر نۆدن، فەلسەفەی زانست لە فەرانسەدا هەیە بەڵام تەنها بەشێك لە بیرکردنەوەی فەلسەفی داگیردەکات. فەلسەفەی زانست لە فەرەنسا زیاتر بە فەلسەفەی شیکاری (تحلیلی) (ئەنگلۆساکسۆن) یان (پۆزیتیوسمی) لۆژیکیەوە گرێ دراوە، کە جێگەی پەیدابونی ئەندێشەیەکی رەسەن نیە. مەبەستم ئەوە نی‌یە کە رەخنە لە فەلسەفەی (شیکاری) بگرم، (کە هەندێ جار زۆر شەکەت ئاوەرە، بەڵام زۆر بە

کەڵکیشە). جگە لە مانەش نەریتی (ڤیتگنشتاین) لە ناڕادایە کە تا ئێستاش شتێکی تەواو جیاوازە. با بۆ نمونە (ڤیتگنشتاین) لەبەرچاو بگرین، ئەو لەژێر کاریگەری (پۆزیتیڤیسمی لۆژیکی)دا (تراکتاتوسی) نوسی، بەڵام پاشان گۆڕانی بەسەر بیروڕاکانیا هێنا، دەستی کرد بە نوسین دەربارەی (لێکۆڵینەوە فەلسەفیەکان)، ئەمەش ئەوی بەرەو لای ڕاڤەکردنی زمانی (عادی) و شێوەی جێگیربونی ئەو زمانەو هەروەها بەرەو مەسەلە (جوان ناسی) و (ئاکاریەکان) ڕاکێشا.

بەرای من، ئەم جوڵانەوە تەکاندەرەی (ڤینگشتاین) تاڕادەیەکی زۆر دەرخەری ئەو حاڵەتەیە، کە ئەمڕۆ بەشێوەیەکی گشتی زاڵە (حاکمە) بەسەر فەلسەفەدا. وە لە ڕاستیدا پرسیارەکەم ئەوەیە کە، بۆچی هێندە بایەخ بە مەسەلەکانی (جوان ناسی) ئەدەن. من لەوە ئەترسم فەلسەفە وەك هەمیشە کەمێك درەنگ بگات، واتە فەلسەفە زەمانێك خۆی تەرخان بکات بەجوان ناسیەوە کە، وەزعیەتی گشتی هونەرەکان ببێتە هۆی ئەوەی کە تەنانەت چیدی پرەنسیپەکانی (جوان ناسی) نەخرێنە ڕو. ئەم وەزعەش ئەوکاتە ئەیتوانی دەربکەوێت کە، (جوان ناسی) بەدیبهاتایە. واتە لە نیوەی سەدەی هەژدەدا. ئەمە ئەو ئەندێشەیەیە، کە ئەگەرچی تاڕادەیەکیش درەنگ گەیشت، بەڵام (کانت) و (هیگل) گەیاندیانە لوتکەی خۆی. بەڵام هەست ئەکەم چیدی جێگایەك بۆ (جوانناسی) نەماوەتەوە بە مانا (هیگڵی) و (کانتیەکەی). دەبوایە (جوانناسی) کانت لەگەڵ ناسکی و سەلیقەدا بسازایە، لە کاتێکدا کە بە پێچەوانەوە هونەری هاوچەرخ پێویستی بەم جۆرە شتانە نییە. بە بڕوای (هیگڵ) (جوانناسی) تەنها قۆناغێکی (کاتی ڕۆحە) لەناو خودی خۆیدا. بە بڕوای (هیگڵ) ئەمە قۆناغێکی کاتییە، چونکە حەقیقەت و بەدیهاتنی واقیعی ڕۆح هاوتای فەلسەفەیەو بێ شك ئەمە شتێکە کە ئەمڕۆ ئیدی کەس بڕوای پێ ناکات. کەواتە ئەم جوانناسیەی ئەمڕۆ چییە؟

پێتان ئەڵێم فەیلەسوفەکان بەرهەمە هونەریەکان ناناسن، ئەمە سونەتێکی کۆنە، نە (کانت) و نە (هیگڵ) جگە لە بەرهەمە گەورە کلاسیکیەکانی (میسن) و (ئیتران) کە لە زەمانی ئەواندا لە مۆزەخانەکانی ئەوروپادا دانرابون، هیچ بەرهەمێکی تریان نەئەناسی. ئەوان کەسە هاوچەرخەکانی خۆیان نەئەناسی، ئەمڕۆش هەروایە، فەیلەسوفەکان هونەرمەندانی هاوچەرخ ناناسن، نیگەرانی منیش هەر لەوەوە سەرچاوەی گرتوە. ئێستا خەریکی نوسینی بەرگی دوهەمی کتێبی (ڕێك نەکەوتنم)، لەو کتێبەدا سەرقاڵی چەند مەسەلەیەکم کە لەو سەردەمەدا نەخراونەتە ڕو، واتە مەسەلەی جەستە (جسم)، جیاوازی جنسی، هەروەها مەسەلەی (جوانناسی) لە بەرهەمە هونەریەکاندا، بەڵام دەشزانم کە ئەمە (جوانناسی) نییەو ئەبێ ناوێکی دیکەی بۆ بدۆزینەوە.

**پرسیار/** داخۆ ئەم گەڕانەوە تازەیە بۆ مەسەلەکە، واتە مەسەلەی ڕەغبەت (مەیل)، جێگەی بایەخ پێدانە لاتان؟

**وەڵام:** تەنانەت ئەو بابەتەش کە لەوەوبەر کارم لەسەر کردوە؛ پێویست بەوە ئەکات کە سەرلەنوێ شرۆڤەی بکەمەوە. بەدەربڕینێکی دیکە، مەبەست لە ڕەغبەت چییە؟ مەبەست لە ڕەغبەتی ناهۆشیاری چییە؟ ئەوەی ئاشکرایە من بەردەوام حەزم لە مەسەلەی (دەرونشیکاری) و مەسەلەی ڕەغبەتە، وە تەسەوریش ئەکەم مەسەلەی (جەستە) یەکێکە لە مەسەلە گەورەکانی جیهانی مۆدێرن.

***دیسامبەر- 1993***

**سەرچاوە:**

*نقد عقل مدرن- مصاحبه رامین جهانبگلو با 20 تن ازفیلسوفان - نشر پخش فرزان- چاپ دوم- تهران 1377.*

# گفتوگۆ لەگەڵ (ئالن فینکل کرۆت)دا

## فەلسەفەی کەلتوور

■ ڕامین جەهانبەگلو

■ و. لە فارسییەوە: فەرشید شەریفی



ئالان فینکل کرۆت

**پرسیار:** ئێوە بواری ئەدەبیتان خوێندوە، بەڵام سەرقاڵی کاری فەلسەفین، پێم خۆشە بزانم بە چ جۆرێك کەوتیتە ناو دنیای فەلسەفەوە؟

**وەڵام:** هەروەك وتتان من پەروەردەی فەلسەفیم نییە، بەڵام ئەو کاتەی کە خوێندکار بوم کەمێکیش فەلسەفەم خوێند. ئیدی بۆ خۆشم نازانم کە چۆن هێدی هێدی کەوتمە ناو دنیای فەلسەفەوە، ئەو وتارانەی کە بۆ یەکەمین جار نوسیمن بابەتگەلێکی ئەدەبی بون، بەڵام ئەو شێوە ڕاڤەکردنەی ئەدەبیات بەتایبەت کە لە دواهەمین ساڵەکانی دەیەی (*1970*)دا باوبو، منی ڕازی نەئەکرد. لەو سەردەمەدا شێوازێکی ڕەخنەیی لە ئارادا نەبو ئەوەم بۆ دەست نیشان بکات کە ئەدەبیات ئامرازێکە بۆ ڕون کردنەوەی تێگەیشتنمان لە جیهان. پرسیارەکە

ئەوەیە کە ئەبێت لە چ دیدگایەکەوە سەیری ئەدەبیات بکەین: لە دیدگای (ئەمپرسیونیسمەوە ) یان لە دیدگای بونیادگەریەوە؟ من خولیای ئەوە بوم کە لە جیهان تێ بگەم و، کتێب خوێندنەوەش ئەو توانایەی پێ بەخشیم کە ببمە خاوەن دیدگایەکی تایبەت، لەبەرئەوەشە رۆژ بە رۆژ زیاتر خۆم لەبەردەم جۆرە فەلسەفەیەکدا دەبینم کە لە ژێر کاریگەری ئەم خولیایەدایە بۆ تێگەیشتن لە جیهان. رەنگە هەر لەبەر ئەوە بوبێت کە وردە وردە لە ئەدەبیاتەوە چومە ناو ژیانی فەلسەفەوە. هۆکارێکی دیکەی حەزکردنم لە فەلسەفە ئەوەبو کە، بەرێکەوت لە دوکانی کتێب فرۆشێك چاوم بە بەرهەمەکانی "لیڤیناس" کەوت و شیفتەی بوم، وە ئیدی تێگەیشتم کە لە بواری فەلسەفەدا بەتایبەت لە سونەتی (دیاردەناسی)دا وەلامێك هەیە بۆ نیگەرانی و پرسیارەکانم. ئەمڕۆش هەوڵئەدەم بە مەبەستی تێگەیشتن لە جیهان پشت بە ئەدەبیات و فەلسەفە ببەستم.

**پرسیار/** هەندێ لە فەیلەسوفەکان خۆیان دەرگیری مەسەلە هەنوکەییەکانی ژیان ئەکەن و تێکەلاو ئەبن لە تەکیا. هەندێکی تریان پێدەچێت حەزیان لە هەندێ مەسائیل بێت کە بە تەواوی دورە لە کێشەکانی ژیانی رۆژانەوە. ئێوە لە ریزی ئەو فەیلەسوفانەدان کە لە نزیکەوە ئەو کارەساتانە ئەبینن کە لە کۆمەلگای فەرەنسی و هەروەها لە جیهاندا رونەدەن. ئایا لەو بڕوایەدان لە نێوان کاری فەلسەفی و مێژوودا کەلێنێك (درزێك) هەبێت؟

**وەلام:** بەڵێ لەو بڕوایەدام هەیە، بەلام خۆشبەختانە ئەمە گرفتی من نییە. من پەروەردەی فەلسەفیم نییە لەبەرئەوە من گرفتاری ئەو لادانە (حیرفەیی)یە نەبوم، کە بریتیە لەوەی دەبێت فەلسەفە تەنها لە چوارچێوەی مێژوی فەلسەفەدا وەربگرین. من بەشێوەیەکی زۆر ساویلکانە (کەم ئاوەزانە) مامەڵە لەگەڵ دەقەکاندا ئەکەم. ئەم رەوشە هەندێ کەم و کوڕی تێدایە چونکە رەنگە لەم نێوانەدا هەندێ شت لە بیربکەین و هەر لەبەرئەوەی کە (علم غیب)م نییە تا هەتایە وەك خوێندکارێك ئەمێنمەوە. بەلام ئەم رەوشە تا رادەیەکیش سود بەخشە، چونکە بەراستی تایبەتمەندیە عەینی و بەرجەستەکانی فەلسەفەم خۆش ئەوێ. من فەلسەفەش وەك ئەدەبیات ئەخوێنمەوە، کاتێك کە (هایدگەر) ئەخوێنمەوە کەمتر بیر لە پەیوەندی نێوان هایدگەرو فەیلەسوفەکانی تر ئەکەمەوە، کەمتر لەخۆم ئەپرسم کە ئایا ئەو سونەتی میتافیزیکی رەت ئەکاتەوە یان نەء، بەلکو لەخۆم ئەپرسم کە ئایا (تەکنەلۆژیا) هەر ئەو شتەیە کە (هایدگەر) وەسفی کردوە؟

**پرسیار/** بەلام ئایا بە بڕوای ئێوە، فەیلەسوف ئەتوانێ رۆڵێکی هەبێت لەم کۆمەلگایەی ئێستادا؟

**وەلام:** رەنگە بە شێوەیەکی راستەوخۆ نەتوانێت، تەنها لەوکاتەدا نەبێت کە فەیلەسوف خۆی مولتەزیم (متعهد) دەکات. بەلام ئەمەش ئارەزوی سروشتی و زەروری ئەو نییە. من لەو بڕوایەدام کە فەیلەسوفە گەورەکان ئەو کەسانەن کە تەنها بەدوای حەقیقەتدا ئەگەڕێن، —تەنانەت ئەگەر حەقیقەتی سەردەمی خۆشیان نەبێت— کەواتە لەم دیدگایەوە فەیلەسوف ئەتوانێ وەك روناك کەرەوەیەکی جیهان رۆڵێکی گرنگ بگێڕێ.

**پرسیار/** ئەم قسەیەی ئێوە ئەمخاتەوە بیری (رورتی، *Rorty*) کە سەبارەت بە رۆڵی ئێستای

فەیلەسوفەکان قسەی کردوە. بە بڕوای (رورتی) دەبێ فەیلەسوفەکان دەست هەلگرن لە کایەکردنی رۆڵی پێغەمبەران و رزگارکەران، تەنها ئەوە نەبێت کە بەشێوەی راڤەکارو راوێژکار دەربکەون.

بیروڕاتان چی‌یە لەم روەوە؟

**وەڵام:** نەخێر. نابێت فەیلەسوفەکان رۆڵی رزگارکەر بگێڕن، بەڵام نازانم بۆچی ئەبێ رۆڵی راوێژکار بگێڕن. وە بەر لە هەمو شتێك ئەبێ ئەوە بزانین کە ئەوان راوێژکاری کێن؟ بە بڕوای من رۆڵی فەیلەسوفەکان لێکۆڵینەوەو رۆشنگەرییە. بێگومان لە (مولتەزیم) بونی لە رادەبەدەری فەیلەسوفەکانیش ئاکامێکی باشمان چنگ ناکەوێت، لە راستیدا سەدەی بیستەم، سەدەی شێتی فەلسەفی و بەتایبەت سەدەی (شێتی مارکسیستی‌یە) چونکە مارکسیزم دەرئەنجامی (دونیابینی) فەلسەفەیە، ئەمە مەسەلەیەکی گرنگە. (مارکس) ئەڵێ "فەیلەسوفەکان جیهانیان راڤەکردووە، ئێستا ئیدی دەبێ بیگۆڕین" ئەم رستەیە مانایەکی جیاواز لەخۆ دەگرێت. بۆ نمونە ئەم مانایە کە چەمکەکان هاتونەتە ناو شەقامەکانەوە و ئیستدلالەکانیشیان گۆڕاون بە شتێکی واقعی. واتە فەلسەفە وازی لە کتێبی فەیلەسوفەکان هێناوەو راستەوخۆ چۆتە ناو مێژوەوە. لەوکاتەوە پەیوەندیەکی زۆر خراپ لە نێوان (مەحسوس) و (مەعقول)دا بەرقەرار بوە. زۆرجار ئەڵێن کە ئایدۆلۆژیا دینی زەمینیە. من ئەوە بە باشتر ئەزانم بڵێم ئایدۆلۆژیا فەلسەفەیەکە لە جێگەی خۆی چۆتە دەرەوە، دڵنیابوونە لە هاتنی یەکجارەکی فەلسەفە بۆ ناو جیهانی واقعیەتەکان. فەلسەفە بۆ ئەوەی بە راستی بەدیبێت، کۆتایی پێ دێ. بە راستی ئەم توندڕەوییە ئایدیالیستی‌یە، یەکجار مایەی تێڕامانە، واتە ئەبێت لە بارەی ئەو رووداوەوە زۆر بیر بکەینەوە کە هەندێ کەس تەسەوریان ئەکرد بەیانگەری پەیوەندی نێوان (چەمك)و واقیعە. ئەم تێڕامانە دەبێ فەلسەفی بێت و ئاشکراشە کە نابێت بگەڕێینەوە سەر ئەو شێتیەی کە هەمانبو لە رابوردودا. کەواتە ئیدی لەو تەسەورە رزگارمان بوە کە کاتی دەستکاریکردنی چەمکی "روداو" و چاککردنی هاتووە بەڵام نەك بۆ ئەوەی وەك "رورتی" کە فەیلەسوفەکان بەرەو شێوەیەك لە ساویلکەیەتی پاڵ پێوەدەنێ، ببین بە راوێژکار. لەم حاڵەتە تێبگەین لەبەرئەوەی کە (بە پێچەوانەوە) سەرلەنوێ ببین بە رۆشنگەر. واتە بگۆڕێن بە کەسانێك کە جیهان هۆشیار بکەینەوە. بێگومان هەنوکەش پێویستمان بە فەلسەفەیە تا بتوانین بیر لەو جیهانە بکەینەوە کە تیایا ئەژین. رەنگە ئێمە تەنها پێویستمان بە فەلسەفە نەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویستمان پێیەتی، چونکە کاتی ئەوە هاتوە کە ئەو هاوسەنگیەی بەقازانجی زانستە ئینسانیەکان شێوێندراوە، سەرلەنوێ بەرقەراری بکەینەوە بە قازانجی فەلسەفە.

**پرسیار/** بە لەناوچونی هیوا مەزنە شۆڕشگێڕەکان و کۆتایی هاتنی سیستەمە فکرە گەورەکانی خۆرئاوا کە ئیدعای کامڵ بونیان ئەکردو لەو بڕوایەدا بون کە توانای رون کردنەوەو راڤەکردنی هەمو شتێکیان هەیە، وە هەروەها لە بەرئەوەی کە مەرگی ئایدۆلۆژیەکان بۆتە هۆی دڵساردی و (ئینفعالی) فەزای گشتی، زەرورەتی دروست بونی بیرێکی تازەی فەلسەفی بەتەواوی رو لە زیاد بونە. داخۆ بیروڕاتان چی‌یە لەم بارەیەوە؟

**وەڵام:** لەبەرئەوەی کە ئایدۆلۆژیەکان چیدی نەبنە کۆسپ لەبەردەم فەلسەفەدا، رەنگە فەلسەفە بتوانێت ئەو توانایەی خۆی سەرلەنوێ بەدەست

بهێنێتەوە کە فەرامۆش کرابون. لەو بڕوایەدام کە مەسەلەی تێگەیشتن لە جیهانی ئەمڕۆمان شتێکی زۆر پێویستەو ئەبێ فەلسەفەش لەم ڕووەوە ڕۆڵی خۆی ببینێت و جێگەی خۆی هەبێت.

**پرسیار/** بەڵام ئایا زەرورەتی فەلسەفە لە جیهانی ئەمڕۆماندا، دەبێ چ شێوەیەك (فۆرم) لە خۆبگرێ؟ ئایا دەبێ شێوەیەکی ئاکاری (اخلاق) هەبێ، یان جوان ناسی، یان سیاسی؟

**وەڵام:** تەسەور ئەکەم بۆ هەمو بوارەکان پێویستە. چونکە لەو بڕوایەدام ئەنوکە هیچ وەڵامێکی ئەسڵی و گرنگمان چنگ نەکەوتوە. ئەنوکە ئایدۆلۆژیا حاڵەتی یەقینی خۆی لەدەست داوەو ئەو شتە قبول ئەکەین کە "پەگی" بە "حاکمیت حادثە" ناوزەدی ئەکرد، ئێستا کە ئیدی بەشێوەیەك دەسەلاتمان بەسەر ئایندەدا ناشکێ و نازانین چۆن بەسەر باڵادەستی تەکنەلۆژیا بەسەر جیهاندا زاڵ بین، ڕوبەڕوی هەندێ مەسەلە ئەبینەوە کە سەر بە بواری هونەرو سیاسەت و هەروەها ئاکارن.

**پرسیار/** کەواتە ئێوە لەو هزرمەندانە نین کە دەڵێن فەلسەفە کۆتایی هاتوە یان مردووە.

لەگەڵ ئەوەشدا لە نوسینەکانتانا لە جیاتی بایەخدان بە فەیلەسوفە کلاسیکەکان، بایەخێکی زۆر بە ئەدەبیات ئەدەن. لە بەرهەمەکانتا دەبینین کە زیاتر حەزتان لە کارەکانی (کوندێرا) نەك (ئەسپینوزا) یان (ئەرستۆ). باشە ئێوە لەو بڕوایەدان کە دەبێ فەیلەسوف بە قازانجی (لەبەرخاتری) نوسەر خۆی کەنارگیر بکات؟

**وەڵام:** ڕەنگە ئەوە بەهۆی جۆری خوێندنەکەم بێت. من کەم و کورتیەکانی خۆم لە بواری فەلسەفەدا بەهۆی ئەدەبیاتەوە پڕ ئەکەمەوە، بەڵام ئەمەش هەموو مەسەلەکە نییە. چونکە لەو بڕوایەدام فەلسەفەش ئەبێت شان بەشانی ئەدەبیات کار بکات، بەتایبەت ئەگەر بیەوێت بیر لەو ئەهامەتییە بکاتەوە کە بەهۆی (مارکس) و مەسەلەی بەدیهاتنی جیهان لە ڕێگەی ئەندێشەوە توشی بو. لەبەرئەوەی کە چالاکیەکانی فەلسەفە تیۆرییە، هەر بۆیە گرایشێکی توندی هەیەو ئەیەوێت (ئایدیاکان) بکات بە جێگرەوەی کەسەکان، و مانایەك بدات بە شتومەکەکان و دەسەلات و مولکیەتی خۆی لەسەر بنەمای ئەو شتانە دابمەزرێنێ کە لە توانایدایە بەهۆی دەسەلاتی تەکنەلۆژیاوە زاڵ بێت بەسەر هەمو جیهاندا. ئەدەبیات بە ئاقارێکی پێچەوانە کار ئەکات، واتە بەو شێوەیەی کە ئەدەبیات چ شیعر بێت یان چیرۆك مانا لە شتومەکەکان وەرئەگرێتەوەو فەردیەتی خۆیان پێ ئەبەخشێتەوە. لەکاتێکدا فەلسەفە لە ڕێگەی ڕاڤەکاری و، ماناسازیو، ناوەڕۆك سازیەوە بەشێوەیەکی نەناسراو کارئەکات، بە پێچەوانەوە ئەدەبیات و بەتایبەت ڕۆمان، بەناو و پێناسەی تایبەتەوە کارئەکات. ئەدەبیات زانستی مەحاڵی مەسەلەیەکی جوزئیە. لە هەمان کاتدا ئەدەبیات زەرورەتێك بە پێویست ئەزانێ بۆ خۆی کە دوای ئەو هەمو تێکشکان و هەڵوەشانەوانە ئەگەڕێتەوە ناو بازنەی مەسەلە هەندەکیەکانی خۆی و سەرلەنوێ قاڵب ئەبەخشێتەوە بە واقعیەت. ئەمە هەمان گەڕانەوەیە بۆ شت و مەکەکان (أشياء) کە زانستی دیاردەناسیش ئاشکرای دەکات. بەڵام ئەدەبیات ئەو ئەولەویەتەی بە نیسبەت فەلسەفەوە هەبوە کە هەموکات ئامادەی هەبوە لەناوماندا جێی نەهێشتوین. کەواتە لەجیاتی گەڕانەوەیەکی

فەلسەفی بۆ خودی شتەکان، رەنگە چاکتر بێت کە فەلسەفە دەرگا بەڕوی ئەدەبیاتدا بکاتەوە.

**پرسیار/** وەلامی ئەم پرسیارەتان ئەمانخاتەوە بیری (پەگی)، ئێوە کتێبێکتان سەبارەت بە (پەگی) نوسیوە بەناوی (هاوچەرخەوە)، کە رەنگدانەوەیەکی زۆری هەبوە لە کۆڕە فەلسەفیەکانی (فەرەنسا) و دەرەوەی فەرەنساش. داخۆ ئەمڕۆ بایەخی ئەندێشەکانی نوسەرێکی وەك (پەگی) بۆ ئێمە چیە؟

**وەلام/** لەو بڕوایەدام کە گرفتی (پەگی) ئەوەیە کە ناتوانرێ جێگەی ئەو بە عینوانی نوسەرێك دیاری بکرێ. ئەویش لەبەر چەند هۆیەك، یەکەم شت لەبەرئەوەی کە زمانێکی سەرسوڕهێنەرو تایبەت بەخۆی هەیە، سەبکە ئەدەبیەکەی جیاوازیەکی زۆری هەیە لەگەڵ سەبکی رەسەنی فەرەنسادا. لە سەبکی رەسەنی فەرەنسادا خۆپارێزی ئەکرێ لە دوپات کردنەوە، نەئەبوایە هەرگیز وشەیەك دوپات بکرێتەوە، (پەگی) دروست بە پێچەوانەوە کاری ئەکرد، و مۆسیقای زمانی واژەگەلی خستە ناو دەقی کلاسیزمی فەرەنساوە. لەم هەلومەرجەدا کاری خوێندنەوەو وەرگێڕان زۆر دژوار ئەبێت. دەزانم کە ئەو لە ساڵی (*1914*) و لە شەڕی یەکەمی جیهاندا مرد. بەلام بەرهەمەکانی چ لە فەرەنساو چ لە دەرەوە، زۆر کەم خوێندراوەتەوە. مەسەلەی دوهەم ئەوەیە (پەگی) کەسێك بو کە پەروەردەی فەلسەفی هەبو، بەلام خۆی بە فەلسەفەوە خەریك نەکرد. شانۆنامەی نوسی، هۆنراوەی هۆنیەوە، هەندێ بەرهەمی نوسی کە یەك بەیەکی ئەو بەرهەمانە پەیوەندیان هەبو بە هەلومەرجێکی تایبەتەوە، تەنانەت بچوکترین و فەلسەفیترین بەرهەمی هەر بەو شێوەیە بو. (پەگی) رۆژنامەنوسێکی فەیلەسوفە هەر بۆیە کە بە سەختی ئەتوانین بەرهەمەکانی جیابکەینەوە لەو دەورانەی مەسەلەی (دریفۆس) دەست پێدەکات و بە جەنگی **1914** دەگات. (ئەدیبەکان) تەنها خۆیان خەریك ئەکەن بەجیاکردنەوەو راڤەکردنی بەرهەمە جوانەکانی، و فەیلەسوفەکانیش هیچ بایەخێك بە بەرهەمەکانی نادەن، چونکە هیچ شتێکی فەلسەفی نەنوسیوە. بەم جۆرە بەرهەمەکانی (پەگی) غەدر لێکراون. کێشەیەکی دیکە کە روبەڕوی شرۆڤەکردنی بەرهەمەکانی (پەگی) ئەبێتەوە ئەوەیە کە بنەمایەکی ئایدۆلۆژیان هەیە نەك ئەکادیمی. (پەگی) پاش ئەوەی کە بەهۆی مەسەلەی (دریفۆسەوە) تێکەلاوی سیاسەت بو، وازی لە سۆشیالیستی دەورانی لاوێتی هێناو بو بە نیشتمان پەروەرێکی بەکەف و کوڵ و (کاسۆلیکێکی) بە بڕوا. بەر لە مردنی هەندێ قسەی کرد دژ بە ژۆرس (*Jaures*). لێرەوەو لەبەر ئەوەش کە مارشاڵ (پتن) هەوڵیدا کەلك لە بەرهەمەکانی (پەگی) بۆ پشتیوانیکردن لەخۆی وەریگرێت،، هێزە چەپەکان ئەویان (پەگی) رەت کردەوە. کەواتە ئەو مەسەلەیە فەرامۆش کراوە کە (پەگی) یەکێك بوە لە مەرجەعە بەهێزەکانی (بزاوتی بەرگری). وەك ئەوەی مێژو تەنها هەر ئەوەی تۆمار کردوە کە (پتن) بەشێوەیەکی خراپ کەلکی لێوەرگرتووە. ئەم مەسەلانە بونە هۆی ئەوەی کە (پەگی) وەك نوسەرێکی (بەرزەخی) بناسرێت، من ویستومە ئەو لەو بەرزەخە بهێنمە دەرێ. لەبەرئەوەی لەلایەکەوە ئەمویست ئابڕوی بۆ بگێڕمەوەو، لەلایەکی تریشەوە لەو بڕوایەدام کە ئەو یەکێکە لە گەورەترین فەیلەسوفەکانی (فەرەنسا) و بێگومانیش گەورەترین

فەیلەسوفی سەرەتای سەدەو بەبێ هیچ دودڵییەك بسەداوای لێبوردنەوە لە رورتی - یەکێکە لە پێغەمبەرانی مۆدێرنیەت. کەواتە (پەگی) راستەوخۆ پەیوەندی هەیە بە هەمو لایەکمانەوە، چونکە بیری لە جیهانی (مۆدێرن) کردۆتەوە. ئەو لەو یەکەمین کەسانە بو کە قایل بو ئەو ئەرکە مەزنە لە ئەستۆ بگرێ ئەویش: (بیرکردنەوە لە جیهانی مۆدێرن بو) بەم شێوەیە ئەو (پەگی) ئەمڕۆ نرخێکی زۆری هەیە، چونکە ئەو روداوانەی ئەو چاودێری ئەکرد هانیاندا بیربکاتەوەر تێڕابمێنێ سەبارەت بەو مەسەلەیەی کە خۆی بە "بەهای نیشتمانێکی خۆشەویستر لەگیان) ناوی ئەبرد. لەم روەوە لە هەلومەرجێکدا کە لە ژێر ناوی پێشکەوتندا هیچ بەهایەك بۆ نیشتمان دانانرێ، هەروەها لەکاتێکدا کە ئیمپریالیزمی وێرانکەر لە ژێر پەردەی دژایەتی کردنی ناسیونالیزمدا هەموو بەرگریەکی دژ بەخۆی پوچەڵ کردۆتەوە، رەنگە لە هەمو کاتێکی تر زیاتر پێویستمان بە بیروڕاکانی (پەگی) هەبێت. (پەگی) کتێبێکی گرنگی تری نوسیوە بەناوی (عەقڵ) کە لە ساڵی (*1905*)دا بڵاوکرایەوە، واتە لەو کاتەدا کە سۆشیالیست بو، بەڵام لە هەمان کاتدا خەریکی مشتومڕو دایەلۆگ بو لەگەڵ سۆشیالیستی رەسمیداو ئایندەی (تۆتالیتری) پێش بینی ئەکرد. ئەو لەو کتێبەدا نوسیویەتی: "ئێمە ئیدعای دروست بونی ئینسانێکی تازە ناکەین، ئێمە ئەمانەوێت ئینسانەکان لە داوی کۆیلایەتی ئابوری رزگار بکەین، بەڵام هیچ دژایەتیەکی ئینسانەکانی پێش خۆمان ناکەین و، لوتبەرزی میتافیزیکیشمان نیە کە بانگەشەی دروست کردنی ئینسان بکات". وە هەر ئەم لوتبەرزیە میتافیزیکیەی کە (پەگی) قسەی لەسەر ئەکات، سۆشیالیزمی بەرەو گەندەڵی برد. ئەبێ ئەمڕۆ، ئێمە بەتەواوی هەر ئەم ئیرادەی دروست کردنی ئینسانە سەر لەنوێ بکەین بە بابەتی ئەندێشەکانمان، و وە ئەو دەمامکانەش وەلاوە نێین کە تەکنەلۆژیا لەخۆی ناوە. بەبێ هیچ دودڵیەك (پەگی) ئەتوانێ لەم روەوە یارمەتیمان بدات. چونکە ئەو زوتر ئاگاداری کردوینەتەوە لەو زەمینەیەدا.

**پرسیار/** ئەوەی کە لە کتێبەکەتاندا قابیلی سەرنج دانە، بە تەواوی ئەوەیە کە هەوڵ ئەدەن وەڵامی هەندێ لەو پرسیارانە بدەنەوە کە لە نوسینەکانی (پەگی)دا بۆ کۆمەڵگای ئەمڕۆ خراونەتە ڕو، هەر لەو رێگەیەشەوە ئەتانەوێت بیکەن بە ئینسانێکی (هاوچەرخ). بۆ نمونە لە دوامەمین بەشی کتێبەکەتاندا لەسەر (پەگی) بەناوی "بزەی جیهانی تەکنیك" کەوتنە رەخنەگرتن لە (پۆست مۆدێرنیزم). ئەگەر رازی بن ئەمەوێ بگەڕێمەوە سەر ئەو رەخنەیەتان بەتایبەت لەو روەوە کە ئێوە جیاوازی دائەنێن لەنێوان (جیهان گەرد) و (کۆچ نشین)دا. بە بڕوای ئێوە ئینسانی (پۆست مۆدێرن) کەسێکی (جیهان گەردە) نەك کۆچ نشین، مەبەستان لەمە چیە؟

**وەڵام:** لەو بڕوایەدام کە بێ هیچ گومانێك مافی ئەوەمان هەیە (مۆدێرنە) رویەڕوی پرسیار بکەینەوە. وابزانم ئوبالدیا (*Obaldia*) قسەیەکی لەم روەوە کردوەو ئەڵێ: "جیهان رابگرن، ئەمەوێ پیادەبم" ئەمە قسەیەکی یەکجار جوانە. ئاشکرایە کە (مۆدێرنە) هەوڵ ئەدات بەرەو پێشەوە بڕوات، ئێمەش بەتەواوی مافی خۆمانە کە بزانین بەرەو کوێ هەنگاو هەڵئەگرێ، هەروەها ناتوانین (مۆدێرنە) بە لێپرسراوی تەواوی ئەو تاوانانە بزانین کە لەناو

جەرگەی خۆیدا رویداوە. هەندێ کەس ئەیانەوێ کە (مۆدێرنە) بێتاوان لە قەڵەم بدەن لە بەرامبەر ئەو تاوانانەدا، ئەوان ئەڵێن ئەم تاوانانە زیندوکردنەوەی پاشماوەی ژیانی جیهانی کۆنە، واتە ئەگەر (مۆدێرنە) توشی ئەو تاوانانە بوبێت، هۆکەی ئەگەڕێتەوە بۆ ترسی (مۆدێرنیەت). لە دیدگای زۆر کەسەوە (تۆتالیتاریزم) کاردانەوەیەکی دژ بە مۆدێرنە. لەو بڕوایەدام کە پەتایەکی مودێرنیزمی لە ئارادا بو کە مرۆڤایەتی دابەش دەکرد بەسەر دو بەشی (زیندو) و (مردو)دا، واتە ئەو بەشەی کە (مۆدێرن) بو شایستەی ژیان بوو، وە ئەو بەشەش کە مۆدێرن نەبو هەر لەو کاتەدا مردبو. دروشمی جەنگی ئەندێشەی مۆدێرن بەم جۆرە بو: "مەرگ بۆ مردوەکان" ئەمەش واتە (بمرێ رابردو)، واتە رەفتارکردن وەك کۆمەڵێ مردوو لەگەڵ ئەو کەسانەی کە پاشتر (تیرۆر) نابوتی کردن. کەواتە لە خودی ئەندێشەی (مۆدێرن)دا شێوازێك لە توندوتیژی بەدی ئەکرێ کە ئێمە لە سەدەی بیستەمدا بە کردەوە بینیمان. کەواتە بەتەواوی مافی ئەوەمان هەیە (مۆدێرنە) روبەڕوی پرسیار بکەینەوەو، لەهەمان کاتیشدا ئەو بە لێپرسراوی تەواوی ئەو تاوانانە نەزانین کە لە ناخیا رویان داوە. کەواتە من لە پێشەوە رەخنە لە ئاراستەکانی (پۆست مۆدێرن) ناگرم، بەڵکو لەو بڕوایەدام کە (پۆست مۆدێرنیزم) وەفادار نیە بەرامبەر بەڵێنەکانی خۆی. لەو بڕوایەدام کە (پۆست مۆدێرنیزم) بەو شێوەیەی کە بۆمان خراوەتەڕو -بەشێوەیەك بالاترین لوتکەی مۆدێرنەیە. لەگەڵ ئەوەشدا (پەگی) زۆر زوتر لە (هایدگەر) پەی بەم مەسەلەیە بردوە. (پەگی) ئەڵێت باوەڕێك لە ئارادایە کە دەڵێ لەم جیهانەدا (خوا مردوە) و ئیدی بەهیچ جۆرێك (میتافیزیك) بونی نیە. ئەوەش لە کاتێکدا کە میتافیزیکێکی (مۆدێرن) لە ئارادایە چونکە ئەم سەدەیە (بێخوا) نیەو بەڵکو "خودی خواشە". واتە ئینسان خۆی جێگەی خوا ئەگرێتەوەو وەك خوا هەڵس و کەوت ئەکات و خۆی دەکات بە خوا. "هایدگەر" سەرقاڵی ئەو بیرکردنەوەیەو قسە لەسەر ئەو (میتافیزیکە) ئەکات کە بە هۆی بکەری شوناسەوە (تێگەیشتن) دروست بوە، واتە ئەو تاکە کەسەی کە بونیادەکەی لەخۆیەتی و ئەیەوێت خۆی ئاغاو گەورەی هەمو شتێك بێت. (پۆست مۆدێرنیزم)یش ئەو ئاغا گەورەیەیە کە گەیشتۆتە دوا پلەی خۆی. ئاغای تەکنەلۆژی و ئاغای مێژو. مێژو ئەگۆڕێ بە جۆرە فرۆشگایەك کە هەمو کەسێك تیایدا سەرقاڵی ئەنجامدانی کاری خۆیەتی. لە راستیدا (جیهان گەرد) (گەریدەی جیهانی) بالاترین نمونەی ئینسانی (پۆست مۆدێرنە)، واتە بالاترین رادەی پێشکەوتنی ئینسانی (مۆدێرن). ئێمە ئەو (گەریدە جیهانیانەین) کە بانگهێشت کراوین بۆ ئەوەی بەناو جیهان و مێژوی رابوردودا گەشت بکەین وە لەهەر جێگایەك کە شوناسێکمان پێ ئەبەخشن، ئەو شوناسە بکەین بە هی خۆمان، ئەمە ئەو شکڵە تازەیەیە کە بوون بەخۆیەوە گرتووەو ئەفسونە گەورەکەی پۆست مۆدێرنیزمیش ئەوەیە کە حاڵەت و مەقامی کۆچنشین و کۆچەری ئەبەخشێ بەم (جیهان گەردە). واتە مەقامی کەسێك کە وازی لە نیشتمانی خۆی هێناوەو گرێ نەدراوە بە شوێنێکی تایبەتەوە.

منیش ئەمەوێ ئەم ئەفسونە بەرمەلا (ئاشکرا) بکەم. لە هەمان کاتیشدا هەوڵم داوە نمونەیەك لە ئەزمونی جولەکەکان بهێنمەوەو روبەڕوی پرسیاری

بکەمەوە. ئەم ئەزمونە کە (پەگی) خۆی لە ڕێگەی بەرنارلازارەوە (*Lazare*) شی دەکاتەوە بە تەواوی لە خزمەتی جیهانگەردێکدایە کە خۆی بە بەردەوامی لە کۆچ نشینی و کۆچەرێتی جولەکەکاندا دەبینێ. هەر بۆیە ڕێزێکی زۆرم بۆ ئەم ئەزمونە مێژووییە هەیە. لەبەرئەوە ویستومە خوێنەران لە مەترسیەکانی ئەم جۆرە تێکچون و شێواوی و ئاشوبە، ئاگادار بکەمەوە.

**پرسیار/**ئێوە لە دواهەمین کتێبەکەتاندا سەبارەت بە (پەگی) جیاوازی دائەنێن لە نێوان ئەو شتەی کە ناوتان ناوە (خزمەت بە خود) و (خزمەت بەوانی دیکە) بە دەربڕینێکی تر بەپێی ئەو شتەی کە ئێوە ئەیلێن، ئێمە لە کۆمەڵگایەکدا ئەژین کە تیایدا تاکە کەسەکان خۆیان بە بەرپرس نازانن، چونکە ئیدی توانای ئەوەیان نی یە "وەڵامی ئەوانی دیکە" بدەنەوە– بەو جۆرەی کە (لیڤیناس) قسەی لەسەر ئەکات.

**وەڵام:** تەواو ڕاستە. ئەو شتانەی کە قسەم لەسەر کرد تۆ کامڵترت کردن. ئەگەر (کۆچ نشینی) مانایەکی هەبێت بە تەواوی ئەو شتەیە کە تۆ وتت، واتە سەلماندنی لە پێشەوە بوونی ئەوی دی لە بەرامبەر "بوون"دا، ڕوخسار بەسەر شوێندا (مکان)، وە ئەوەی کە پەرتوکی پیرۆز (کتاب مقدس) قسەی لەسەر ئەکات، هەر بۆیە بە بڕوای (لیوناس) ئەزمونە مێژوییەکەی جولەکەکان ئەم مەسەلانەی لەخۆگرتوە. بەڵام ئیمڕۆ ئێمە لە پێك هاتەیەکی تەواو جیاوازدا دەژین کە خزمەت بەوانی دیکە ناکات، بەڵکو تەنها خزمەت بە (خود) ئەکات. لە کاتێکدا ئەگەر کەسێك بە مەبەستی ڕاکردن (ڕزگاربون) لەم وەزعە فێڵێکی ئاکاری ئەنجام بدات، ئەوە کارێکی خراپی کردوە. من هەوڵ ئەدەم ئەو خراپەکاریانەی کە ئەمڕۆ لە جیهانەکەماندا بەرقەرارن ئاشکرا بکەم.

**پرسیار/** کەواتە ئێمە شایەتی لە دەستدانی ڕۆحی نیشتمان پەروەرین، ئەم لەدەستدانی ڕۆحی نیشتمان پەروەریەش ڕاستەوخۆ گرێدراوە بە گەشەکردنی ڕێژەگەری فەرهەنگیەوە.

**وەڵام/** بەڵێ، ڕێژەگەری ئاماژەیەکە بۆ ئەم پاراستنە گشتیە لە مەسرەفکەرو ئەم بەخشینەی سەرجەم واقعیەت بە مرۆڤەکان. ئیدی ڕێژەگەری کلتوری ئەو ڕۆڵە کایە ناکات کە لەسەرەتادا هەیبو. مانای ڕێژەگەری کلتوری چی بوو؟ ڕێژەگەری کلتوری مانای ڕووبەڕوبونەوەیە لەگەڵ خۆ بەگەورە زانین و ڕۆڵی دەسەڵاتی خۆرئاوادا. کەواتە لایەنێکی ڕەخنەیی ئاراستەی ئەو (زەینگەرایەی) کرا کە پێشتر قسەمان لەسەرکرد. خۆرئاوا بەهۆی باڵادەست بونیەوە لە دونیای پیشەسازیدا خۆی بە گەورەی جیهان ئەزانی، کتوپڕ (مرۆڤ ناسەکان) "ئەنترۆپۆلوگەکان" لە ڕێگەوە دێن و ئەڵێن: "نەخێر وانی یە، تەنها مەدەنیەتێك هەبێت و چەند قەومگەلێکی بەربەری، بەڵکو چەند کلتورێك هەیە. کەواتە خاکی بن و وجودی ئەوانی دیکەش قبوڵ بکەن، چونکە ناتوانین هەمیشە ئەوانی دیکە بتوێنینەوە، لەبەرئەوەی ئەوانی دیکەش لە بەرامبەر تۆدا بەرگری لە خۆیان ئەکەن. کەواتە ئەتوانین بڵێین کە (ڕێژگەری کلتوری) ئاڕەزاییەك بو لە بەرامبەر گرایشی (تمایل) خۆرئاوادا بۆ ڕێگەگرتن لە توانەوەی ئەوانی دیکە لەناو خۆیدا.

ئەمڕۆ بەتەواوی بارودۆخەکە جیاوازە، ئەمەش بەو مانایەی کە دەستکەوتەکانی (ڕێژەگەری کلتوری) بە جۆرێ بەکار ئەبرێ تا لە بواری کلتوردا هەمو

شتەكان لەیەك ئاستدا دابنێن، و بۆ ئەوەی مەشروعیەت ببەخشن بە "كلتوری باو" و "پیشەسازی كلتور"، واتە كلتورێكمان پێشكەش ئەكەن كە لە ژێر دەسەڵاتی پیشەسازیدایەو بەشێوەیەكی فراوانیش بەرهەمی دێنن. لە (رێژەگەری كلتوری)دا توخمگەلێكی رەخنەیی لە ئارادا بو دەربارەی تەكنەلۆژیا. بەڵام ئەمڕۆ تەكنەلۆژیا چەمك و ناوەڕۆكی (رێژەگەری كلتوری) بە قازانجی خۆی قۆستۆتەوە تا هەمو شتێك بخاتە یەك قاڵبەوەو، خودی كلتوریش هاوشێوەی جۆرە (سوپەرماركێتێك) نمایش بكات. بەم هۆیەوە تەنانەت لەخۆرئاواشدا، كلتور پێگەیەكی یەكجار لەرزۆك و داتەپیوی هەیە.

**پرسیار/** هەشت ساڵ لەمەوبەر لە كتێبی (شكستی ئەندێشەدا) كەوتنە دژایەتی كردنی ئەو فكرەیەی كە ئەیویست میللەتانی ئەوروپا بگۆڕێ بە كۆمەڵگایەكی چەند كلتوری وە توانەوەی كلتور لە هەمەكیەكی كلتوریدا، ئایا دەكرێ ئەمڕۆ بە وێنەیەكی هەمەكی كلتوری بۆ جیهان، بە شێوەیەك كە تەواوی كلتورەكانی دیكە بەو وێنە هەمەكیە هەڵبسەنگێنین؟

**وەڵام:** رەنگە ئەمڕۆ بتوانرێ، چونكە لەو كاتەوە تا ئەمڕۆ نوسینەكانی (هانا ئارێنت)م زۆر خوێندۆتەوە. تەسەور ئەكەم پێویستە زیاتر بیر بكەینەوە دەربارەی ئەو شتەی كە دەكرێ ناوی بنێین "جیهانی هاوبەش". چی ئەقەومێ ئەگەر ئینسانەكان سەرەڕای جیاوازیەكانیان بتوانن پەیوەندی لەگەڵ یەكدیدا بەقەرار بكەن؟ ئەمڕۆ دو وەڵامان بۆ ئەم پرسیارە هەیە. وەڵامی یەكەم ئەوەیە كە "گشتی بوون" (عام شدن) بە ئەركی پێویستی خۆی ئەزانێ و لەسەر بنەمای ئەوەش، دروست كردنی فەرهەنگی جیهانی ئەخاتە ئەستۆی خەڵكیەوەو، دیارە لەم كارەشیدا سەركەوتو بوە. ماوەیەكی تر فیناڵی تۆپی پێی جیهانی دەست پێئەكات، و ملیاردەها كەس سەیری ئەم یاریە دەكەن ئەبینین كە (تۆپی پێ) وابەستە نییە بە شوێن و زەمانێكی تایبەتەوە، بەڵام ئەمە خۆی لەخۆیدا نمونەیەكی باشە بۆ (جیهانی بون). ئایا مرۆڤایەتی مرۆڤ دۆستان خوازیاری شتی لەوە زیاتر نییە، وە ئایا نابێت سەبارەت بە (كلتور) زیاتر بیربكەینەوە، ئایا كلتور ئامرازێك نیە بۆ ئەوەی مرۆڤ لەڕێیەوە بتوانێت دەستی بە زەینیەتێكی فراوانتردا بگات، ئێستاكە جیهانێكی گشتی خەریكە لە بەرامبەرماندا فۆرمۆلە ئەبێت، ئایا نابێت (جیهانێكی هاوبەشی) راستەقینە لە بەرامبەر ئەو جیهانە گشتیەدا دابنێین. ئەگەر ئەمە راست بێت، كەواتە كلتور تەنها ئامرازێكە كە بۆ دروست كردنی ئەو جیهانە هاوبەشەی لەبەردەستماندایە، ئەمڕۆ ئەو بیروڕایانەی كە لە كتێبی شكستی ئەندێشەدا خستبوومە ڕوو بەم شێوەیە چاك دەكەمەوە، چاك كردنەوەو پیاچونەوەی ئەمڕۆی ئەو بیروڕایانە بۆ من زۆر پڕ بایەخە.

**پرسیار/** داخۆ راستە كە تا ئێستاش رەخنەگرێكی سەرسەختی (چەند كلتورگەریت)؟

**وەڵام:** بەڵێ رەخنەگری سەرسەخت. چونكە ئاكامەكانی (چەند فەرهەنگ گەرایی) لە ئەمەریكادا ئەبینین. ئەمەش لە كاتێكدایە كە ئەركی فەرهەنگ پەرەپێدانی بیركردنەوەی ئێمەیە. كاری (چەند فەرهەنگەرایی) سنورداركردنی زەینیەتیەكان و گەمارۆدانێتی لەناو خۆیدا. لەو بڕوایەدام كە فەرهەنگ دروست نابێت تەنها لەو حاڵەتەدا نەبێت كە

به شێوەیەکی تایبەتی تەشویق بکرێت. من وا هەست ئەکەم کە (تەشویق کردن) لە جیهانی ئێمەدا نامێنێت. بە بڕوای من (چەند فەرهەنگ گەرایی) بەو شێوەیەی کە لە زانکۆکانی (ئەمەریکا) و لە ڕێگەی مانای (*Politically correct*) (بەشێوەی سیاسی دروست) لە ئارادایە -ڕوخساری ئەو شتەیە کە (نیچە) بە "نەفرەتی" ناوزەد ئەکرد. لە کتێبێکدا کە لەم دوایانەدا چاپکراوە بەناوی (چەند فەرهەنگەرایی (چارلز تیلەر) فەیلەسوفی کەنەدی هەوڵئەدا بەشێوەیەکی بێ لایەنانە دیاردەی (*Politically correct*) ڕون بکاتەوە. ئەو ئەڵێت "سیستمی کۆن کۆمەڵگایەك بو لەسەر بنەمای ئابڕومەندی دامەزرابو، واتە جیاوازی و دورکەوتنەوە. کۆمەڵگای ئێمە لەسەر بناغەی ڕێز لێنان دامەزراوە، واتە بەرابەری تاکە کەسەکان، هەروەها ئەڵێت "جێگیرکردنی ڕێزلێنان لە جێگەی ئابڕومەندی ئاکامگەلێکی فەرهەنگی ئەخاتەوە کە تەنها بۆ چاودێریکردنی خودی ئەو ڕێزلێنانە شەرعیەتی پێ ئەبەخشرێ. دەرئەنجامی ئەمەش ئەوەیە کە کردنەوەی دەرگاکانی بەرهەمە کلتوریەکان بەسەر کلتورەکانی دیدا، ڕێگەی پێدەدرێت، بەدەر لەوەی کە ڕەش پێستەکان و لاتین ئەمەریکایەکان -بەحەق- لەبەرامبەر دەستبەسەراگرتنی کلتور لەلایەن سپی پێستەکانەوە هەست بە مەزلومیەت دەکەن، هەموو ئەم کلتورانە وەلاوە دەنرێن سەرئەنجام کتوپڕ چیدی کلتور فەزای تەشویق کردن یان فەزای کەشفکردنی نابێت و دەگۆڕێت بۆ فەزای ناسین. ئیتر هیچ کەسێك عەودالی ئەوە نابێت کە شتێك دەربارەی جیهان بزانێت، بەڵکو تەنها ئەمانەوێ بماننناسن. ئەم گۆڕانە قابیلی لێپرسینەوە نییە، چونکە مشتومڕکردن لەسەر ئەم بابەتانە کارێکی تەواو سروشتییە، دیارە نەك بەم زاراوانە چونکە ئەحمەقانەن. لە کاتێکدا کە کتێبی (کۆمیدی ئیلاهی) (دانتە) ئەخوێنمەوە لە خۆم بایی نابم و بڵێم " کەسێکی سپی پێستی خۆرئاوایی (کۆمیدی ئیلاهی) نوسیوە، چ نوسەرێکی مەزنە؟" من هێندەی کە حەزم لەو تیپی (تۆپی پێ)یە کە خۆم بە لایەنگریان ئەزانم، هێندە خۆم بە لایەنگری (دانتە) نازانم، تەنانەت ئەگەر ئەو پەیوەندی هاوتابونەم (*Identification*) لەگەڵ نوسەرێکی فەرەنسیدا هەبێت، ئەوە پەیوەندیەکی کاتییەو تەعبیر لە هیچ خواستێکی من ناکات. لەو بڕوایەدام (لافونتم) لەبەر ئەوە خۆش ئەوێ کە چیرۆکەکانی وێنای ئەو حاڵەتانە ئەکەن کە تەعبیر لە ژیانی من ئەکات، (مۆنتنیش) هەر بەو جۆرە. (مۆنتنی) فەرەنسییە، خۆزگەم بە فەرەنسا! ئەوەی بەلامەوە گرنگە ئەوەیە کە (مونتی) کەسێکە بە قوڵی بیر لە حاڵەتی مرۆڤایەتی ئەکاتەوە. لە سەردەمێکدا کە هەرکەسێك تەنها پسپۆڕە لە بەشێکی مەسەلە مرۆییەکاندا . دەبێ کەسانێك هەبن کە بیر لەسەرجەم فەزای مرۆڤایەتی دەکەنەوە، لای منیش ئەو کەسانە بەتەنها (نوسەرانن). باشە، با بەدوای ئەو نوسەرانەی دیکەشدا بگەڕێین کە ئەم توانایەیان هەیە. من بە ئەرکی خۆمی ئەزانم کە بە دوای ئەو جۆرە نووسەرانەدا بگەڕێم، بەلام بەداخەوە ئەم جۆرە پێوەرانە بەکار نامێنرێن، ئێستا پێوەرەکانی ناسین سودی لێوەردەگیرێ. بەجارێك بەهای بەرهەمە کۆنەکان کورت ئەکرێتەوە بۆ شوناسەیان (*Identite*) ئەڵێن مادام سپی پێستەکان ئەم شتانەیان نوسیوە، کەواتە تەنها هی خۆیانەو، هیچ بەهایەکی بۆ جیهانی (چەند فەرهەنگی) نییە. لە

هەمان کاتدا بەهای ئەو بەرهەمە تازەیەی کە ئەیانەوێت لە ژێر ناوی (چەند فەرهەنگەرایدا) بە ئێمەی بناسێنن، خۆی لە خۆیدا جۆرە بەها بەخشینێکە لەسەر بنەمای شوناس، ئەو شوناسەی کە ئەمڕۆ باڵادەست بووە.

دەڵێن گوایە سپی پێستەکان کەسانێکی باشتر نین، تەنها لەبەرئەوەی سپی پێستن، لە هەمان کاتدا ئەڵێن (فرانتس فانون) شاکارە، چونکە نوسەرێکی ئەفەریقی‌یە. قسەی من ئەوەیە کە دەبێ ئەم باسە زیاتر رون بکەینەوە: ئەمانەوێ لەسەر چ شتێ قسە بکەین؟ فەرهەنگ لە کوێدایە؟ جیهانی هاویەش لەکوێدایە؟

**پرسیار/** کەواتە (چەند فەرهەنگەرایی) بە پێچەوانەی ئەو ئاقارەوە هەنگاو هەڵئەگرێ، کە (گۆتە) بە (ئەدەبیاتی جیهانی) (*Weltlieratur*) ناوی ئەبرد؟

**وەلام:** بەڵێ لە بەرامبەر (*Weltlieratur*) داو هەرجۆرە پەیوەندیەکی نێوان ئینسانەکانیشدا. ئەمەش لەبەرئەوەی ئەو مەترسیە لە ئارادایە کە ئەچینە ناو جیهانێکی پڕ نەفرەتەوە، جیهانێك کە بە مەبەستی پەیوەندیکردن تەنها کەڵك لە وردە فەرهەنگەکان وەرئەگرێ.

**پرسیار/** ئایا ئەتوانین ئەم هەلومەرج و وەزعانە بە بەڵگە بزانین بۆ شکستی گشتی بون (عمومیت). من لەخۆم ئەپرسم کە ئایا ئەو شتەی (کوندورسە) بە "بڵاوبونەوەی رۆشنگەری" ناوی ئەبرد، دەکرێ لەم کۆتایی سەدەی بیستەمەدا بە بەرنامەیەکی فەلسەفی و سیاسی پڕ بایەخ دابنرێ؟ ئایا ئەو جەنگەی لە یوگسلافیای پێشودا رویدا سەلماندنی شکستی بەها گشتی‌یەکان نیە لە ئەوروپادا؟

**وەلام:** بەڵێ تەواو راست ئەکەن. بەلام مەسەلەیەکی دیکەش هەیە، بێگومان بەها گشتی‌یەکان توشی شکست بون، بەلام تێگەیشتنیشمان سەبارەت بە پەیوەندی ژمارەیەك لە بنەماو مێژو زانیاریەکانیش، توشی شکست بوە. لەو بڕوایەدام کە ئەتوانین ئەم شکستە بخەینە پاڵ بێ ئاوەزی (عام گەرایەوە)، چونکە توانایەکی باشیان نی‌یە بۆ لێکدانەوەی مەسەلەکان و ناتوانن پێشبینی ئەگەرەکان بکەن. میللەت دیاردەیەکە نارەسەنی تێدایە و تا ئەو جێگایەی کە دیاردەیەکی مۆدێرنە پشتگیری لە ئیرادەی تاکەکەسەکان ئەکات و سەربەخۆییان بە رەسمی ئەناسێ. بەلام لەهەمان کاتیشدا میللەت نی‌یە لە جیهاندا کە خاوەن مێژو رابوردو نەبێت. وە ئێمە ئیدی ناتوانین بە ئاسانی ئەم نارەسەنیە بەناوی (عام گەرایەوە) قبوڵ بکەین. ئێمە بە جۆرێك ململانێ ئەکەین بۆ جیاکردنەوەی هێڵەکانمان لە یەکدی. واتە چاوپۆشی کردن لە رابوردو، لە پەیوەندیەکان، و قبوڵ کردنی ئازادی (فریشتە ئاسای) ئینسانەکان.

بەم جۆرە بەناوی (عام گەرایەوە) رەهەندی ناوچەیێتی میللەتان فەرامۆش ئەکەین و، ئەڵێین مەرگ بۆ نەتەوەپەرستی بژی جیهانیەت. مەسەلەکەی (یوگسلافیاش) هاوشێوەی ئەم حاڵەتە بو. (یوگسلافیا) ئاوێتەیەك بو لە هەندێ لایەنی میللی باڵاتر، بەسەر لایەنەکەی تردا. ئەم سەختگیریە میتافیزکی‌یە، بە نەفرەت کردن یان لا[illegible] کەم لێبوردن لە بەرامبەر نەفرەتی لێکەوتەوە. [illegible]واتە دەبێت هەم داکۆکی لە بەها جیهانی و گشتی‌یەکان بکەین کە لە بەردەم هەڕەشەی چەند فەرهەنگەرایدان، هەم رەخنە بگرین لەم شێوە سەختگیریە میتافیزیکیەو، هەروەها لایەنە رواڵەتیەکانی (عام گەرایی).

**پرسیار/** ئەو شتەی کە ئێستا قسەتان لەسەر کرد ئەمخاتەوە یادی ئەو رایەی (پەگی) کە لە کتێبی

"چۆن ئەتوانین ببین بە کەرەوات؟" قسەتان لەسەر کردوە: "هەرچەند ئەو رابردوەی لە پشتمانەوەیە، زیاتر بێت، پێویستە زیاتر چاودێری پاك راگرتنی بکەین"، ئایا ئێستا ئەوروپا لە حاڵەتی گۆڕانی مێژوی خۆیدا نییە بۆ بیرەوەریەکی پوچ و بێهودە؟ ئەم پرسیارەم بە مەبەستی ئەنجام گیری گفتوگۆکەمان خستەڕو.

**وەڵام:** لە راستیدا ئەنجامگیریەکی باشتان لە قسەکانتان دەستکەوت. (پەگی) بەم دەربڕینەی سەرلەنوێ چەمکێکی تازەی خستە ناو سیاسەتەوە کە رەنگە (مۆدێرن) نەبێ، بەڵام لە هەمان کاتیشدا شتێکی زۆر پێویستە، ئەو چەمکەش (ئابڕومەندی) بو. (ئابڕومەندی) چییە؟ ئابڕومەندی بەو مانایە دێت کە ناوبانگێکت هەبێت و کارێك نەکەیت زیانی بۆ ئەو ناوبانگە هەبێت. وە بە بڕوای من ئەمە یەکێکە لە رەهەندەکانی کارکردن کە ئیمڕۆ فەرامۆش کراوە، چونکە وا تەسەور ئەکرێت کە ئازادی خۆ رزگارکردنە لە کۆت و بەندەکانی رابوردو. ئازادی واتە تاکێکی (کەسێکی) تەواو تەنها سەربەخۆو وابەستە بەخودی خۆیەوە، و جۆرێك خۆڕزگارکردن لە رابوردوو. بەڵام بە بڕوای من ئەم جۆرە دیدگایە لەسەر ئازادی یەکجار ترسناکەو ئاکامگەلێکی خراپی لێ ئەکەوێتەوە، کۆمەڵێك لە خەڵکی کە بەم جۆرە بیر ئەکەنەوە لە بەرامبەر یەکدیدا، ئەتوانن تەنها سیاسەتێك بهێننە ئاراوە کە لەسەر بناغەی نائابڕومەندیە. جێگای سەرسوڕمان نییە کە ئەورووپای ئەمڕۆ (ئابڕوی) خۆی لەدەست داوە، چونکە لەو بڕوایەدا بووە کە دەبێت خۆی لە کۆت و بەندی ئەندێشەی (ئابڕومەندی) رزگار بکات.

**سەرچاوە:**

*نقد عقل مدرن، ترجمه حسین سامعی، مجموعه سپهر اندیشه، مصاحبه رامین جهانبگلو با 20 تن از صاحب نظران و وفان معاصر. جاپ دوم 1377.*

(ژونیەی 1994)

# فیلمی (زێد – Z)

## توێکاریکردنی تاوانێکی ڕامیاریه

● ئا. و: هەڵگورد عارف مەحمود

فیلمی (زێد –Z) لە ساڵی *1968* لەلایەن کۆمپانیای (ڕاگان ئۆنسیس – *Raggane Oncic*)ی فەرەنسی بەرهەم هێنراوە:

لە نووسین و دەرهێنانی/ کوستا کافراس- *Costa Gavras*

سیناریوی/ جۆرج سیمبرن- *Jeorge Semprun*

لە چیرۆکێک وەرگیراوە بەهەمان ناو/ کە لەلایەن چیرۆك نووس:

فاسیلی فاسیلیکوس: *Vassili Vassilikos* ■ نووسراوە

وێنەگرتنی: ڕاول کوتارد – *Rooul Coutard*

مۆسیقای: میکس تیودوراکس- *Mikis Theodorakis*

لە نواندنی:

جان لوی ترینتینان- *Jan- Louis Trintignant*

جاکویس پیرین- *Jacques Perrin*

ئیف مونتان- *Yves Montand*

ئیرین باباس- *Irene Papas*

شارلز دینیر- *Charles Denner*

ساڵی *1968* فیلمی (زێد) بەرهەم هێنراو و پروپاگندەیەکی گەورەی لەناو ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا بە دواوە بو.. چ ڕۆژنامەو گۆڤارەکانی عێراق و چ ڕۆژنامەو گۆڤارە عەرەبیەکان بە تایبەتی ئەوانەی لە وڵاتی میسر و لوبنان دەرئەکران و ئەگەیشتە شاری سلێمانی و هەندێك لە گۆڤارە هونەریە بێگانەکان کە بەزمانی ئینگلیزی دەرئەچوون لە کتێبخانەکانی سلێمانی دەست ئەکەوتن ژمارە بەدوای ژمارە بەرێکی.. لەوانە گۆڤاری (*Picture Show*)و (*Movie Life*)و (*Photoplay Annual*) هتد..

لەساڵی **1969** داو لە فستفاڵی بەرلین دا تێکڕای نوسەرانی بابەتە هونەریەکان و رەخنەگران لە هەموو زمان و ڕەگەزەکان بەوپەڕی سەرسوڕمان و رێزەوە لەم کارە مەزنە دوان و پێشوازیان لێکردو بە باشترین فیلمی فەرەنسیان دانا لە مێژووی سینەمای فەرەنسیدا کە بەدەر نیە لە کۆمەڵێکی بەرچاو لە فیلمو کاری سینەمای سەرکەوتو.. لەساڵی **1970** دا هەمان فیلم لەفستفاڵی (کان)ی سینەمایی خەڵاتی لیژنەی داوەرانی وەرگرت و یەکێك لە ئەکتەرەکانی کە ئەکتەری سەرەکی فیلمەکەیە (جان لوی ترایتینان)ە خەڵاتی باشترین ئەکتەری پیاوی لە هەمان فستفاڵدا وەرگرت.

بێگومان من وەکو ئارەزومەندێکی سینەماو کارەکانی، ڕۆژ بە ڕۆژ زیاتر تامەزرۆی بینینی ئەم فیلمە بوم کە لەوەی ئەکرد نەك تەنها لە عێراقدا پیشان نادرێت بەڵکو لە وڵاتانی دەورپشت و لەوڵاتە عەرەبیەکانیش پیشان نادرێت (چونکە ئەو کاتە رژێمی سەربازی لە یۆنان حوکمڕان بوون و عێراق و دەوڵەتانی تر بۆ ئەوەی پەیوەندی دیبلۆماسی تێك نەچێت ئەم فیلمەیان قەدەغە کردبو).

لە هاوینی ساڵی **1973** بەسەردانێکی گەشتیاری چومە دەرەوەی وڵات لەشاری پاریس لەچەند هاوڕێیەکم بیست کە فیلمی (زێد) ئێستا لە دوو هۆڵی سینەمانیەوە بۆ ماوەی چوار ساڵە بێ وەستان پیشان ئەدرێت بۆیە لە دوای تەنها یەك ڕۆژ لەگەیشتنم بۆ ئەو شارە چوم بۆ هۆڵی سینەمای (بیجال) کە یەکێك بو لە هۆڵە سینەماییە مەزنەکانی شەقامی (شانزلیزیە) و لە کۆتاییدا فیلمەکەم بینی..

پێش ئەوەی لە فیلمەکە بکۆڵمەوەو بەدرێژی باسی بکەم و لەبەرئەوەی ڕووداوەکانی ئەم کارە پێشکەشی ئەکات هەمووی رودلوی ڕاستن و لەساڵی **1963** لە یۆنان روی داوە بۆیە بە پێویستی ئەزانم لە چەند خاڵێکی چڕدا ڕووداوەکان ڕیز بکەم و بیگێڕمەوەو دوایی بێمەوە سەرباسی فیلمەکە...

ساڵی **1963** – **22**ی مایس/ جریجوس لامبراکیس کە مامۆستای کۆلێجی پزیشکیە لە زاکۆی ئەسینا و پەرلەمانتارە لە پەرلەمانی یۆناندا وەك نوێنەری پارتی چەپی دیموکراسی لەو ڕۆژەدا سەرۆکایەتی کۆبونەوەیەکی فراوان بۆ پشتیوانانی ئاشتی ئەکات لە شاری سالونیك بۆ نارەزایی دەربڕین لەسەر دانانی بنکەیەکی موشەکی دوور هاوێژ لە جۆری (پولاریس) لە وڵاتی یۆنان.

لەدوای کۆتایی کۆبونەوەکەو لە کاتێکدا لامبراکیس لە هۆڵەکە دێتە دەرەوە ئۆتومبیلێکی بار هەڵگری بچوك خۆی لێ ئەداو بەخەستی بریندداری ئەکات و لە هۆش خۆی ئەچێت و بەپەلە ئەگەیەنرێتە نەخۆشخانەو لە دوای سەد کات ژمێر ئەو پەرلەمانتارە گیانی لەدەست ئەدات و ئەمرێت..

لە هەمان شەودا واتە شەوی **22**ی مایس بەرێکەوت پۆلیسێك شوفێری ئەو ئۆتۆمبیلە دەستگیر ئەکات کە ناوی (سبیروس جوتزا مانیس)ە دوای چەند ڕۆژێك هاوڕێی ئەو شوفێرەش کە ناوی (عمانویل عمانویلیدیس)ە دەستگیر ئەکرێت.

ئەم ڕووداوە هەر وا بەئاسایی و ئاسانی تێپەڕ نابێت.. ڕۆژی دوایی هەڵلایەکی گەورە ئەخاتەوە لەناو هەموو یۆناندا.. ژمارەیەکی زۆر لە ڕۆژنامەو کەناڵە میدیاییەکان باوەڕ بە گۆشە نیگای رەسمی لەت ناکەن کە ئەڵێت (ڕووداوێکی دڵتەزێنی هاتوو چۆ بوە هۆی مردنی پەرلەمانتارێك)...

دوای پشکنینی بریندارەکە دەرئەکەوێت کە ئیسکی کاسەی سەری بەلێدانی بەشتێکی قورس شکاوەو توشی بەربوونی خوێن بووە.. نەك بەهۆی بەرکەوتنی ئۆتۆمبیلەوە وای لێهاتوە.. لێرەدا سەرۆکی نەیارەکان (المعارضة) بە ئاشکرا لێپرسراوێتی ئەدەبی ئەخاتە ئەستۆی حکومەتەکەی



ئەكتەر (سارتراكيس)

(كارامانليس).. بۆيە ئەو حكومەتە ناچار ئەبێت لە 25ی مايسدا دادوەرێكی لاو بەناوی (سارتراكيس) دەست نيشان بكات بۆ لێكۆڵينەوە لەم رووداوە..

10ی حوزەيران/.. (كولياس)ی داواكاری گشتی دادگای باڵای ئەسينا بە شاراوەيی روو ئەكاتە شاری سالونيكی شوێنی روداوەكە.. ناوەندە رۆژنامەگەرەكانی يۆنان كاتێك بەم سەردانە ئەزانن بەمانشێتی گەورە بڵاوی ئەكەنەوەو ئەڵێن:

(ئەم سەردانەی داواكاری گشتی دەست تێوەردانێكی زەقی دەسەڵاتدارانە بۆ شاردنەوەی راستيەكان لەم كێشەيەدا)!

11ی حوزەيران/ حكومەتەكەی (كارامنليس) ئەكەوێت..

22ی حوزەيران/ (جورجيو) كە سەرۆكی دادگای باڵای ئەسينايە لە كۆنگرەيەكی رۆژنامەگەريدا دان بەوەدا ئەنێت كە هەندێك لە لێپرسراوانی باڵای پۆليسی يۆنان لەم روداوەدا بەشدارن..

24ی حوزەيران/ (ميتشو)ی سەرپەرشتياری گشتی پۆليسی شاری سالونيك و (كولونيل كاموتسيس) خرانە ژێر دەسەڵاتی دادگاوە.

16ی تەمموز/ گەورە ئەفسەری پۆليسی سالونيك (كابينوليس) و (يوزماس) كە سەرۆكی رێكخراوێكی راست رەوی توندڕەوە دەست بەسەر كران.

3ی ئەيلول/ (جنرال فاردولاكيس)ی بەڕێوەبەری گشتی پۆليسی سالونيك بە تۆمەتی گەندەڵی لە كارەكەی دور خرايەوە..

14ی ئەيلول/ بەڕەسمی تۆمەتی بەشداری كردن لە تاوانی تيرۆركردنی پەرلەمانتار (لامبراكيس) خرايە پاڵ هەر يەك لە (سەرپەرشتياری گشتی پۆليس، ميتسو) و (كولونيل كاتوتيس) و (بەڕێوەبەری پۆليس دیامانتوليوس).. و لە 27ی ئەيلولدا گيران و خرانە بەنديخانە.. تا لە رۆژی 24ی تشرينی‌يەكەم لەدوای لێكۆڵينەوەی چڕوپڕ ئازاد كران.. و لە 22ی تشرينی دووەمی ساڵی 1964 لە كار دوور ئەخرێنەوەو پاش دوو هەفتە خانەنشين ئەكرێن.

ساڵی 1964- 16ی شوبات/ سياسەتمەداری ديمكراسی خواز (جۆرج باباندريو) پۆستی سەرەك وەزيران ئەگرێتە دەست و دەست بەجێ فەرمانی لابردنی (كولياس)ی داواكاری گشتی لە كار، دەرئەكات.

ساڵی 1966- 2ی تشرينی يەكەم/ دادگايی كردنی لێپرسراوە راستەوخۆكانی تاوانی تيرۆكردنی، پەرلەمانتار (لامبراكيس) دەستی پێكرد.. لە ئەنجامدا بڕياری زيندانی‌كردنی (جوتزامانيس) بۆ ماوەی يانزە ساڵ و نيو و زيندانی كردنی (عمانويليديس) بۆ ماوەی هەشت ساڵ و نيو دەركرد.. ئەوانەش كە تەنها لێپرسراوێتی ئەدەبيان لەسەر بوە لەم روداوەدا ئازادكران.

ساڵی 1967- 21ی نيسان/ كودەتايەكی سەربازی لە يونان كراو.. داواكاری گشتی پێشوو (كولياس) پۆستی سەرەك وەزيرانی يونانی وەرگرت.

ساڵی 1968- 12ی ئەيلول/ هەر پێنج ئەفسەرەكەی پۆليس كە خانە نيشن كرابوون خرانەوە سەركارەكانی جارانيان و دەسەڵات هاتەوە دەستيان.



رۆژنامەنووس جاك بیرن

## بارودۆخی بەرهەم هێنان

ئەمە بە کورتی باسی ئەو بەسەرهاتەیە کە لە سالّی **1963** لەولاتی یونان رووی داوە.. رووداوەکانی دوایی تا دەست بەسەراگرتنی دەسەلات لەلایەن سوپاوەو دورخستنەوەی بنەمالّەی پاشایەتی لە یۆنان و گۆرانی شێوازی حوکم لە پاشایەتیەوە بۆ سیستەمی کوماری (کە تا ئێستا پەیرەو نەکراوە).. ئەم هەموو رووداوانە چیرۆك.

چیرۆکنووسی یۆنانی (فاسیلی فاسیلیکوس) نوسیەوەو نام'.ەی کردو بەناوی (زێد)وە بلاّوی کردوە.. بۆ ئەم مەبەستە حکومەتی (جۆرج باباندریۆ) دەرفەتێکی گەورەی بۆ ئەم نووسەرە رەخساند بەوەی هەموو بەلگەنامەو نوسراو و پسولەکانی کێشەکەی کە لە دادگاو پۆلیسخانەدا هەبوو خرایە بەردەستی.. ئەوە بوو چیرۆکەکە بوە تۆمارێکی راستگۆ بۆ رووداوی تیرۆرکردنی (فاسیلیکوس) لەوێنەیەکی دارێژراوی درامی نایاب.

دەرهێنەر (کوستا کافراس) لەسالّی **1966** دا بۆ بیرۆکەیەکی نوێ ئەگەڕا تا پێشکەشی سینەمای بکات لە سێهەمین کاری سینەماییدا.. لەو ماوەیەدا بەرهەم هێنەرێکی ئیتالّی سیناریۆیەکی بۆ نارد کە لە چوارچێوەی فیلمە ویسترنەکاندا خۆی ئەنواند و شێوازێکی نزیکی هەبوو لە رووداوی تیرۆرکردنی سەرەك کۆماری ئەمریکی (جۆن کەنەدی)..

کوستا کافراس ئەم بیرۆکەیەی رەت کردەوە لەبەرئەوەی بەلگەی تەواو ئاشکرای ئەم کێشەیەی لەبەردەستا نەبوو کە لە کۆتاییدا بتوانێت هەندێك لە کەسایەتیەکان و رێکخراو و ناوەندەکان بە تۆمەتی ئاشکراو بەلگە نەویست تاوانبار بکات کە لێپرسراوی ئەو روداوە بوون.. لەو کاتانەدا کە کتێبخانەکانی پاریس وەرگێڕاوی چیرۆکەکەی (فاسیلیکۆس) بە زمانی فەرەنسی کەوتە بەردیدەی خوێنەران.. لەبەرئەوەی کوستا کافراس خۆی ئەو چیرۆکەی بەزمانی یۆنانی خوێندبۆوەو زۆریشی بەدلّ بوە.. هەروەها کێشەکەش بەدادگاییەکی روون و ئاشکرا و یاسایی کۆتایی هاتبو کە تیایدا گۆشەنیگای رەسمی حکومەتی یۆنانی ئەوکاتەی تیا بەرجەستە ببوو.. بۆیە زۆر بە پەرۆشیەوە بەرەو ئەو کارە رۆیشت و ئامەزرۆی ئەوە بو کە رۆژێك بێت و بتوانێت بیکات بە فلمێك لە دەرهێنان و بەرهەم هێنانی خۆی.

لەسالّی **1967** دا بیرۆکەی ئەم پرۆژەیەی پێشکەش کرد بە کۆمپانیای (یونایتد ئارتست)ی ئەمریکی.. لەپێشدا وەریان گرت بۆ پێداچوونەوەی و لە دواییدا داوایان لێکرد سیناریۆی بۆ بنوسێت.. کاتێك سیناریۆکەی بەیارمەتی نووسەری ناودار (جۆرج سیمبرن) تەواو کردو ناردی بۆ کۆمپیانیاکە.. کۆمپانیاکە پەسەندی نەکرد و رەتی کردەوە بە بیانووی ئەوەی ئەم فیلمە فیلمێکی بازرگانی دەرناچێت و داهاتی باشی نابێت!!

بەڵام کوستاکافراس بەمە سارد نەبۆوەو بیری لەوە کردەوە کە چۆن پارەو بودجەیەك بۆ ئەم کارە پەیدابکات.. پەیوەندی کرد کە لەگەڵ هەندێك لە ئەکتەرە هاوڕێی و ناسیاوەکانیەوە لەگەڵیاندا ڕێئەکەوێت بۆ ئەنجام دانی کارەکە.. ڕۆڵەکانی بەسەردا دابەش کردن و هەموویان بەشداری خەرجی فیلمەکەیان کرد لەوانە ئەکتەران: (ئیف مونتان) و (جان لوی ترانتینان) و (فرانسوا بیریە)و (جاکیوس پیرین).. دوای ئەوە هەوڵیان دا وڵاتێك ڕەزامەند بکەن کە فیلمەکەی تیادا بەرهەم بێت و وێنەی بگیرێت.. بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندیان کرد بە وڵاتانی یوغۆسلافیاو رۆمانیاو ئیتالیا و جەزائیر.. سێ دەوڵەتی یەکەم ڕەزامەند نەبوون.. بەڵام جەزائیر ڕەزامەند بوو بڕیاریشی دا کە لە 40٪ ی بودجەکەی فیلمەکە هاوکاری بکات و جگە لەوەی پارمەتی گەورەی پێشکەش کرد لە ئەکتەری یەدەك و کومبارس و زۆربەی کارەکانیشی بە تەواوی ئاسان کرد.. ئەوەش بوە هۆی ئەوەی لایەنی بڵاوکردنەوەی فیلمەکەشی دەست بکەوێت.. لە نێوان کافراس و کۆمپانیای (فالوریا فیلم) ڕێکەوتن مۆرکرابو بۆ دابەش کردن و بڵاوکردنەوەی فیلمی (زێد) پێش چەند رۆژێك لەدەست پێکردنی وێنەگرتنی فیلمەکە لەشاری جەزائیری پایتەخت لە مانگی ئابی ساڵی 1968.

**دەرهێنەر:**

بەڵام بابزانین (کوستا کافراس) کێیە؟.. ئەم دەرهێنەرە هونەرمەندەی کە هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك ساردی نەکردەوە لەو سووربوونەی لەسەر دەرهێنان و تەواو کردنی ئەم فیلمە نایابە کە ناوی فیلمی (زێد)ە.



ئیف مونتان لە دەوری زێد دا

کوستاکافراس لە 13ی شوباتی ساڵی 1933 لەشاری (ئەسینا)ی پایتەختی یۆنان لەدایك بوە لە باوکێکی روسی و دایکێکی یۆنانی.. دوای تەواوکردنی خوێندنی ئامادەیی ڕووی کردۆتە فەرەنساو چوەتە زانکۆی (سوربون) بۆ خوێندن لە ئەدەبی فەرەنسیدا.. کافراس ئەڵێ: زانیاریم لە زمانی فەرەنسیدا زۆرکز و لاواز بو.. بۆیە زوو زوو سەردانی سینەماو شانۆکانی پاریسم ئەکرد بۆ باشکردن و بەهێزکردنی تواناکانم لەم زمانەدا..

ئەو سەردانە زۆرانەم بۆ سینەماو شانۆ بوە هۆی پەیدا بوونی عەشقم بۆ وێنەو جوڵاندن.. بۆیە بڕیاری وازلێهێنانی خوێندنم دا و سووربوونم بەجێ هێشت و پەیوەندیم کرد بە پەیمانگای باڵای سینەما لە پاریس (ئایدیك)..

کوستاکافراس دوو ساڵ لەو پەیمانگایەدا خوێندی‌و لە دواییدا وەك یاریدەدەر لەگەڵ شەش دەرهێنەردا کاری کرد. ئەوانەش:

1–(رینیه کلیر– *Rennie Klieer*) لە فیلمی: (هەموو زێڕی جیهان– *All Golds of the World*) لەساڵی **1961** دا.

2–(هنری فرنوی– *Henry Frnoye*) لە فیلمی: (مەیمونێك لە زستاندا– *Monkey in the Winter*) لەساڵی **1962** دا.

3–(جاك دیمی– *Jack Dime*) لە فیلمی: (كەنداوی فریشتەكان– *Gulf of Angels*) لەساڵی **1962** دا.

4–(رینیە كلیمان– *Renni Kleman*) لە فیلمی: (ئەمڕۆ، كات ژمێر– *The Day and the Hour*) و فیلمی: (خۆشەویستیەكی خوێناوی– *Bloody Love*) لەساڵی **1963**.

5–(ماكس ئوفولس– *Max Ofuolse*) لە فیلمی: (توێكڵی مۆز– *Banana Rind*) لەساڵی **1964** دا.

6–(جان بیكر– *Jan Beker*) لە فیلمی (هەڵهاتنێكی بەلەرزە– *Temblor Escape*) لەساڵی **1965** دا.

لەكۆتایی ئەو ساڵەدا واتە لە ساڵی **1965** كوستا كافراس بڕیاری دا كە ئیتر تەنها بە باڵەكانی خۆی لە ئاسمانی جیهانی هونەرو سینەمادا بفڕێ دوای ئەوەی لە زۆربەی نهێنیەكانی شارەزا بوو.

كافراس خودی خۆی چیرۆكێكی پۆلیسی هەڵبژارد و كۆمەڵێك لە ئەكتەرە ماوڕێكانی لە خۆی كۆكردەوەو وەك:

(ئیف مونتان و جاك پیران و جان لوی ترانتنیان) ئەمانە كە قارەمانەكانی فیلمی (زێد)یش بوون لەگەڵ ژنە ئەكتەری فەرەنسی ناودار (سیمون سنیوریە) و (میشل بیكولی) و یەكەم فیلمی دەرهێنا بەناوی (تاوانكارانی شەمەندەفەر– *Crimials of Train*) لەساڵی **1965**.. فیلمەكە باسی هەوڵەكانی پۆلیس ئەكات بۆ دۆزینەوەو ئاشكرا كردنی كەسایەتی تاوانبارێك كە كچێكی لەو وێستگەی شەمەندەفەرە كوشتوە.. دواتر ئەو پیاوكوژە یەكە بەیەكەی شایەتەكان ئەكوژێ.. ئەوانەی ئەو شەوە لەو وێستگەیە بوون و ئاگاداری تاوانەكە بوون..

لەم فیلمەدا تواناو بلیمەتی كافراس دەرئەكەوێت لە بەڕێوەبردنی كامێراو ئەكتەرەكان و پێشكەش كردنی سیناریۆیەكی پتەو و داڕێژراو كە ئەبێتە هۆی سەرنج ڕاكێشانی بینەران بە شێوەیەكی قوڵ و تەواو تا لە كۆتایی فیلمەكەدا پیاوكوژەكە ئاشكرا ئەبێت.. كە یەكێكە لە پیاوانی پۆلیس..

(بۆیە سەیر نیە لامان كە جارێكی تر كوستا كافراس پیاوانی پۆلیس مەحكوم ئەكات لە فیلمی "زێد"دا).

فیلمی (تاوانكارانی شەمەنەفەر) بە باشترین دە فیلمی بێگانە لەساڵی **1965** دا لە ئەمریكا دەست نیشان كرا.

فیلمی دووەمی كوستا كافراس فیلمی (پیاوی ژمارە–13– *The Man Number 13*)یە. ڕووداوی ئەم فیلمە ساڵی **1943** ڕوویداوە كاتێك فەرەنسا لەژێر دەسەڵاتی نازیێكاندایە.. هێزی بەرهەڵستكاری ئازادی فەرەنسا بڕیاری ڕزگاركردنی دوانزە كەس لە ئەندامە بەند كراوەكانی ئەدات لەیەكێك لە بەندیخانە نازیەكان.. كارەكە بە سەركەوتویی كۆتایی دێت.. بەڵام لەبری **12** پیاو **13** پیاو لە زیندانەكەدا ئەبن و ڕزگاریان ئەبێت.. پرسیارێك دێتە گۆڕێ.. ئایا **13**مین پیاو كێیە؟.. لە خۆیانە یان یەكێكە لە نۆكەرانی نازیەكان و بۆ مەبەستێكی تایبەتی خراوەتە ناو ئەم **12** پیاوە بەند كراوانە؟.. بەڵام ئەم فیلمە سەركەوتنی بەدەست نەهێنا چ لە ڕووی هونەری و چ لە ڕووی داهاتەوە..

**فیلمەكە:**

پێش هەموو شتێك ئەبێت ئەوە رەچاو بكەین فیلمی (زێد) كە لەوڵاتی جەزایر وێنەی گیراوە، ڕووداوەكانی نە لەشاری سلانیك و نە لە هیچ شارێكی تری یۆنانیە.. بەڵكو لە وڵاتێكە دەست نیشان

نەكراوە.. هەروەها ناوی كەسایەتیەكانی یۆنانی نیە.. مەبەستی سەرەكی دەرهێنەر لەمەدا ئەوەیە ئەم مەحكوم كردنە.. ئەم تاوانبار كردنە بخاتە پاڵ هەموو دامو دەزگایەكی پۆلیس و ئاسایش و موخابەرات كە لە ژێر سایەی رژێمی ئیرهاب و تۆقاندن دیكتاتۆریەت كاردەكەن‌و باوەڕیان بەدیموكراسیەت نیەو سەریەستی پیادە ناكەن.. بەلام بەرامبەر ئەمانە نوسینی كۆتایی فیلمەكە كە لەسەر پەردە ئەنووسرێت و ئیمزای (كوستاكافراس)ی دەرهێنەرو (جۆرج سیمبرن)ی نووسەری سیناریۆی پێوەیە ئەڵێ: (هەر بۆچونێك یان هەر لە یەكچونێك لەگەڵ ئەم رووداوانەو لەگەڵ ئەم كەسایەتیانە.. ئەوانەی لە ژیاندا ماون و ئەوانەی كە مردوون لەیەك بچێت بەڕێكەوت نیە.. بەڵكو بەدەستی ئەنقەستە!!).

هەروەها لیستێك لە قەدەغەكراوەكان كە دەسەلاتدارانی حوكمی كوتەدای عەسكەری فاشی یۆنانی ئەو سەردەمە دایناوە (لەساڵی **1967** وەو بۆ سالانی دوایی) لەسەر پەردە ئەنوسرێت وەك:

قژ درێژكردنەوە.. مینی جوب (تەنورەی ژنانەی كورت).. تولستوی.. ئاراجون.. تروتسكی.. مان گرتن (بەهەموو جۆرەكانیەوە).. كاری سەندیكایی.. یونسكۆ.. سارتەر.. هارلمود بنتر.. فێربوونی زمانی روسی و بلغاری.. ئەدوارد ئەلبی.. سەربەستی رۆژنامەگەری.. مۆسیقای میللی بەتایبەتی ئاوازەكانی (تیودوراكیس) و (بیتلز)و شكاندنی پەرداخ لەسەر شێوازی روسیەكان.

دەرهێنەر ئەگەر رووداوی تیرۆركردنی (لامبراكیس)ی هەلبژاردبێت لە كێشە هاوتاكانی وەك رفاندن‌و لەدوایدا كوشتنی (بن بركە) و تیرۆركردنی سەرۆكی ئەمریكای پێشوو (جۆن كەنەدی) كە پەسەندتر بووبێت هۆیەكەی ئەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی پیاو كوژەكانی هەردوو حالەتی دوایی ناسراو نین و كەسی ناسراو و هیچ دامو دەزگایەك تاوانبار نەكراوەو لێكۆڵینەوە تا ئێستا نەگەیشتوەتە ئەنجامێكی روون و ئاشكرا.. بە پێچەوانەی حالەتی



یەکەمەوە دەربارەی کێشەی تیرۆرکردنی پەرلەمانتاری یۆنانی (جریجوری لامبراکیس) کە بکوژەکانی ناسراوو تاوانبارکران و بەسزا گەیشتن کە کۆمەڵێک لە ئەفسەرە پایە بەرزەکانی یۆنان بوون بۆیە لێرەدا ئەو مەحکوم کردنەی کافراس ئاراستەی رژێمە فاشست و کۆنە پەرستەکانی ئەکات بەهێزتر و کاریگەرتر ئەبێت.

فیلمی (زێد) بەهەوڵی یەکێك لە رێکخراوە ئاشتی خوازەکان دەست پێدەکات بۆ گرتنی کۆنگرەیەك تا یەکێك لە پەرلەمانتارە نەیارەکان بۆ سیاسەتی حکومەت (ئیف مونتان) وتارێك پێشکەش بکات تیادا داوای داماڵینی چەك بکات لە حەوزی دەریای سپی ناوەڕاست.. کۆنگرە رێکخەرەکان بەرەنگاری کارێکی کتوپڕ ئەبنەوە ئەویش ئەوەیە کە خاوەنی هۆڵەکە پەشیمان ئەبێتەوە لە بەکرێ دانی هۆڵەکە (دوایی تێدەگەین کە پۆلیس هەڕەشەی لەخاوەن هۆڵەکە کردوە تا لە رێکەوتنی بەکرێ دانی هۆڵەکە پەشیمان ببێتەوە).. ئەندامانی رێکخراوەکە پێدەزانن کە پلانێك هەیە بۆتیرۆرکردنی (زێد)و ئاگاداری داواکاری گشتی شارەکە ئەکەن.. بەڵام داواکاری گشتی ئەم کارە بەدوور ئەزانێت و باوەڕیان پێناکات..

(زێد) ئەگاتە ئەم شارە و کۆنگرەکە لە هۆڵێکی بچوکدا ئەبەستێ بەڵام لە کەشێکی پڕ لە نائارامی.. نەیاران لەلایەکی شەقامی بەر هۆڵەکە وەستاون‌و دۆستانیشی لەلایەکی ترەوە.. (زێد) باسی ئاشتی ئەکات.. ئەو ئاشتیەی واتای دەستپێکردنی کۆتایی پیشەسازی قورسی چەکسازی‌یەو ئەڵێ:

لەکاتێکدا کە وڵاتەکەمان بەدەست کەمی نەخۆشخانە و پزیشك و مامۆستاوە ئەناڵێنێ.. حکومەت نیوەی بودجەی ساڵانە و بگرە زیاتر تەرخان ئەکات بۆ چەکسازی و کەشتیە سەربازیە ژێر دەریایە ئەتۆمیەکانیش (الغواصات النوویە) دەورو خولی کەنارەکانیان لێگرتووین و ئەسوڕێنەوە کە هەمووی هەڵگری موشەکی ئەتۆمیە.. کە بەهای هەر موشەکێك بەرامبەر بودجەی دروست کردن و رێکخستنی چوار زانکۆیە.. بۆیە من لێرەدا پرسیارێکتان ئاراستە ئەکەم گەلان پێویستیان بەزانکۆکانە یان موشەکەکان؟..

بەم شێوەیە ئەم پەرلەمانتارە قسەکانی تەواو ئەکات و لە هۆڵەکە دێتە دەرەوەو دەست بەجێ ئوتومبێلێکی بچوکی بار هەڵگر خۆی لێ ئەدات.. ئەبرێت بۆ نەخۆشخانە هەرچەندە لەوێ هەوڵ و تەقەلای زۆر لەگەڵیا ئەدرێت بەڵام رزگاری نابێت لەچنگی مردن و گیانی لەدەست ئەدات..

دادوەرێك دائەنرێت بۆ لێکۆڵینەوە (جان لوی ترانتینیان) لە هۆکارەکانی مردنی پەرلەمانتارەکە.. گۆشە نیگای رەسمی حکومەت رەت ئەکاتەوە کە گوایە بە رووداوی هاتوچۆ مردوە.. دوای ئەوەی پزیشکەکان ئاگاداری ئەوەی ئەکەن کە ئەم کوژراوە ئیسکی کەللەی سەری بەلێدانی شتێکی رەق وەك شیشێکی ئاسن شکاوە..

دادوەر لەسەر لێکۆڵینەوە بەردەوامەو لە هەمان کاتدا رۆژنامە نووسێکی لاو (جاکویس پیرین) لەلایەن خۆیەوەو بۆ حسابی خۆی لێکۆڵینەوە ئەکات.. هێدی هێدی روون ئەبێتەوە و دەرئەکەوێت کە لە بەرزترین ئاستی دەسەڵاتی پۆلیسی شارەکەوە پلان داڕێژراوە بۆ ئەنجام دانی ئەم تاوانە بەهاوکاری لەگەڵ رێکخراوێکی راستڕەوی توندڕەو بۆ گێرەشێوێنی بەرپاکردن لەکاتی سازکردنی کۆنگرەی ئاشتیەکە..

پۆلیس لەگەڵ دوو ئەندامی ئەم رێکخراوە رێکەوتوون بۆ ئەنجامدانی کاری تیرۆرکردنی (زێد) و بەڵێنیان داونەتێ کە پاداشتی چاك و لەسەرکاری باش دابنرێن.

دادوەری لێکۆڵینەوە هەڕەشەو گوڕەشەکان رەت ئەکاتەوەو سور ئەبێت لەسەر درێژەدان بە لێکۆڵینەوە بە گوێرەی یاسا.. چەند ئەفسەرێکی

گەورەی پۆلیس تاوانبار ئەکات بە تاوانی کوشتنی پێش وەخت بڕیار لەسەر دراو.. دادگایی تاوانبارەکان دەست پێدەکات و لە کۆتایدا بڕیاری بەندکردنی (یاجوفاجو) کە شۆفێری ئەو ئۆتومبیلەیە کە تاوانەکەی پێ ئەنجام دراوە، دەدرێت.. بەرپرسە ناڕاستەوخۆکانی ئەم تاوانەش کە دان بەتاوانەکەدا ناهێنن سزای ئیداری ئەدرێن.. ئەم هەواڵانە لە فیلمەکەدا لەلایەن رۆژنامە نووسە لاوەکەوە ئەزانین لە ئەنجامی چاوپێکەوتنێکی تەلەفزیۆنی کە تیایدا بەشدار بوە (چونکە ئێمە مەراسیمی دادگاییەکە لە فیلمەکەدا نابینین)..

لە ئەنجامی ئەم بڕیارانەی دادگاو داخوازی جەماوەری هەڵچووی رۆژانەی سەر شەقام و گۆڕەپانەکان بڕیاری خۆ ئامادەکردن بۆ سازدانی هەڵبژاردنێکی پەرلەمانی نوێ ئەدرێت..

بەڵام پێش ئەنجام دانی هەڵبژاردنەکە سوپای یۆنان کودەتایەکی سەربازی ئەنجام ئەدات و جەنراڵەکانی ئەم سوپایە دەسەڵات ئەگرنە دەست و جاڕی حوکمی عورفی سەربازی ئەدەن.. دادوەری لێکۆڵینەوە لەسەر کار لائەبرێت و وێنەی رۆژنامەنووسەکە کە لەسەر تەلەفزیۆن قسەی ئەکرد بێ جوڵە ڕائەوەستێ.. و دەنگێکی ژنانە لە دەرەوەی کادرەکەوە پێمان ڕائەگەیەنێت کە ئەم رۆژنامەنووسە لاوە بڕیاری بەندکردنی بۆماوەی سێ ساڵ دراوە لەبەرئەوەی چەند بەڵگەنامەیەکی ئاشکرا کردوەو هەندێك نهێنی درکاندوە.. هەمان دەنگ لیستێك لە قەدەغەکراوەکان ئەخوێنێتەوە کە هەندێکیان لەپێشەوە باسمان کردوە.

فیلمەکە بەوێنەیەکی پەرلەمانتارەکە کۆتایی دێت کە لە تەنیشتیەوە پیتی (Z) نوسراوەو لە خوار ئەم پیتەوە بەفەرەنسی نووسراوە (ئەمە زیندوە) ئەمەش واتای ئەو پیتەیە بە زمانی یۆنانی.. ناو هۆڵی سینەماکە رووناك ئەبێتەوە بە ئەوەی لەسەر پەردەکە بنوسرێت (تەواوبو– *The End*)..

ئەمە کورتە باسێکی فیلمەکەی کوستا کافراس بوو کە ماوەکەی سەدو بیست و پێنج خولەکە و رووداوەکانی دەرهێنەر لە چیرۆکێکی فاسیلی فاسیلیکۆسەوە وەریگرتوە.. کە ئەو نوسەرە سوودی لە رووداوی تیرۆرکردنی پەرلەمانتاری یۆنانی لامبراکیس وەرگرتوە بۆ داڕشتنی چیرۆکەکە..

کوستا کافراس ئەڵێ: من و سیناریست جۆرج سیمبرن هیچ گۆڕانکاریەکمان لەسەر کەسایەتیەکان نەکردوە تەنها ئەوە نەبێت کە کەسایەتی سێ رۆژنامەنووسمان کردوە بەیەك رۆژنامەنووس ئەم رۆژنامەنووسەش لە پێشدا هیچ گرنگیەکی نەداوە بە رووداوەکە تەنها وەك نووسینی بابەتێکی سەیرو سەرنج ڕاکێش نەبێت بۆ خوێنەوارەکانی رۆژنامەکەی کەتیایدا ئەنووسێت.. هەر لەم میانەیەوە هەوڵئەدات چاوپێکەوتن لەگەڵ هاوسەری پەرلەمانتارە کوژراوەکە بکات.. لەلایەکی ترەوە شایەتێك کە ناوی (نیك)ە چەند زانیاریەکی لەسەر رووداوەکە درکاندوەو هەر بە ڕێکەوت وێنەی چەند ئەندامێکی ڕێکخراوە ڕاست و توندڕەوەکەی گرتوە ئەوەش بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە لە ئامادە بوونیان لەناو خۆپیشاندەرانی شەوی تاوانەکە.

بەشێوەیەکی گشتی هەموو کەسایەتیەکان لەسەر بنەماو بناغەیەکی پتەو و بەهێز وەستاون.. لەسەروو هەموویانەوە دادوەری لێکۆڵینەوە کە دادوەرێکە حکومەتی دەسەڵاتدار داینـاوە بۆ لێکۆڵینەوە لە رووداوەکە.. ئەم دادوەرە بیروباوەڕی ڕاستڕەوانەیە (الیمین).. بەڵگەش بۆ ئەمە یەکەم کاردانەوەیە لەکاتێکدا کە پزیشکەکان ئاگاداری ئەکەنەوە کە گۆشە نیگای رەسمی بە پێچەوانەی ڕاستیەکانەو هۆی مردنی پەرلەمانتارەکە بەلێدانی شیشێکی ئاسن

بوه كه دراوه بەسەریا نەك لە ئەنجامی لێدانی ئوتومبیل.. یەكسەر بەبێ لێكدانەوە ئەڵێ:

ئایا ئەم پزیشكانە شیوعین یان نا؟.. لە حزبە نەیارو بەرهەڵستەكانن؟.. بێگومان ئەمە كاردانەوەیەكی زۆر ئاساییە بۆ كەسانێك لە كۆمەڵگایەكی دوور لە دیموكراسی بژین.. بەلام لەگەڵ ئەمانەشدا ئەم دادوەرە پیاوێكی بە ویژدانو داوێن پاك ویاسا پەرستە و بەگەرمی درێژە بەلێكۆڵینەوە ئەدات و هەوڵی پەیدا كردنی راستیەكان ئەدات بەمەرجێك سوور ئەبێت لەسەر ئەوەی وشەی (تاوان) بەكار نەهێنرێت بەدرێژایی باسكردنی كێشەی تیرۆركردنی پەرلەمانتارەكە.. تا ئەو كاتەی دەرئەكەوێت كە شوفێری بەڕێوەبەری ئاسایش دەستی لە رووداوەكەدا هەیە بە رِوویدا ئەتەقێتەوە و ئەڵێ:

(كەواتە تۆ بەرێكەوت لای شوێنی روودانی تاوانەكە ئەسوڕایتەوە..) لەدەمی دەرچوو وشەی تاوانی بەكارهێنا.. بێ ئەوەی كەس لە دانیشتوانی ناو هۆڵی دادگا هەستی پێبكەن..

نووسەری دادگا: ببورە گەورەم؟

دەنگی دادوەرەكە لەدەرەوەی كادر: چی؟

نووسەرەكە (كامێرا بە هێواشی لێی نزیك ئەبێتەوە)

گەورەم بنووسم (تاوان)؟ گەورەم بەڕێزت فەرمووت.. تاوان

دادوەر: چی ئەنووسی بینووسە.. بەڵێ بنووسە تاوان! ! لێرەدا بۆمان ئاشكرا ئەبێت كە دادوەرەكە لە كۆتاییدا باوەڕی پەیدا كردوە كە پلانێكی دارێژراو هەبوە بۆ تیرۆركردنی پەرلەمانتارەكە.. لەدوای ئەو باوەڕ هێنانە دادوەرەكە هەموو فشارەكانی كاربەدەستانی رەت كردەوە كە تاوانباری ئەخاتە پاڵ ئەفسەرە باڵاكانی پۆلیس لەگەڵ ئەوەشدا كە دوا رۆژو ئایندەی ئەكەوێتە مەترسیەوە بەلام لەبەرئەوەی دادوەرێكی پاكەو گوێ ناداتە هەڕەشەو گوڕەشە.. كۆستاكافراس لەوە دوور كەوتوەتەوە كە (زێد) بكات بە فیلمێكی پۆلیسی.. تاوانەكە لەدەست پێكردنی فیلمەكەدا روویدات وبەدرێژای ماوەكەی لەگەڵ لێكۆڵەرەوەكاندا سوراخی ئەنجامدەرەكانی بكەین.. ئەم شێوازەی رەتكردەوەو ئەوەی هەڵبژارد كە لە دەستپێكردنی فیلمەكەوە راستیەكان بدركێنی.. راستیەكانی تاوانەكە.. بەلام ئەوەی بینەر ئاگاداری نیە ئەوەیە.. ئەم تاوانە بۆكرا؟.. لەبەرژەوەندی كێیە؟ لێرەدا پرسیارەكە ئەگۆڕێت بۆ: كێ پەرلەمانتارەكەی تیرۆركرد؟.. بۆ ئەم كارە ئەنجام درا؟.. كوستا كافراس لەم شێوازەدا ناچار ئەبێت تیشك بخاتە سەر رووداوەكان كە پەیوەندیان هەیە بە چەند كاتژمێرێكی پێش كاری تیرۆركردنەكەو ئەو رۆژانەی بەدوایدا دێت و هەڵسوكەوتی كەسایەتیە سەرەكیەكان لەرێگای (فلاش باك)وە.. وەك گەڕانەوەیەك بۆ رووداوەكانی پێشوو..

كوستاكافراس سەركەوتووبوو لە بەكارهێنانی فلاش باك لە هەموو كاتەكانی گێڕانەوەی رووداوە كۆنەكان چ لە بارەی پەیوەندی بە بەڕێوەبەری گشتی پۆلیسەوە كە باس لە تاوانی كوشتنەكە لەگۆشە نیگای خۆیەوە ئەكات یان (نیك)ی شایەت كە ئەیگێڕێتەوە چۆن رۆژی تاوانەكە (یاجو) هاتۆتە لای و وتویەتی: من ئەمشەو گەورەترین هەڵە لە ژیانمدا ئەكەم.. یان شایەتی دووەم (كوست) كە

ئەیگێڕێتەوە چۆن بەیانی ڕۆژی تاوانەکە کولونیل ی دیوە بەجلوبەرگی مەدەنیەوە قسەی لەگەڵ یاجو کردوە کە شۆفێرێکی شارەزای ئۆتۆمبیلی بار هەلگرە.. و چەند حاڵەتێکی تر.. لەگەڵ ئەوەشدا کە لێکۆڵینەوە لە تاوانی تیرۆرکردنی پەرلەمانتارەکە لەیەك کاتدا لەسەر سێ ئاست کرا: دادوەر لە لایەنی خۆیەوە.. ڕۆژنامەنووسەکە لەلای خۆیەوەو هاوڕێکانی پەرلەمانتارەکەش لەلایەنی سێیەمەوە.. بەلام بلیمەتی و زانایی کوستاکافراس لەوەدایە بە ئاسانی گواستنەوەی ئەکرد لەنێوان ئەم سێ کۆمەڵە لەچەند دیمەنێکی تاك و تەرادا نەبێت بەیەکەوە نەئەبینران.. دەرهێنەر لەیەك جار زیاتر نەبوە هۆی شلەژاندن و هەڵچوونی بینەران تەنها یەك جار نەبێت ئەویش لەدیمەنی ڕاوە دوونانی (مانویل)ی هاوڕێ پەرلەمانتارەکە لەلایەن ئوتومبیلێکی نەناسراوی سەر بەلایەنی بکوژانی (زێد) بەمەبەستی لێدانی و کوشتنی.. بێگومان نابێت مۆسیقاو ئاوازەکانی بلیمەت (میکیس تیودو راکس) لەیاد بکەین کە ئەوکاتەی من فیلمەکەم بۆ یەکەم جار بینی ئەم پیاوە لەبەندیخانەیەکی یۆنان کاتی ڕژێمی سەربازی فاشستی پێشوو زیندانی کرابوو لەسەر هەڵوێستە پێشکەوتنخوازەکان و لەسەر دانانی ئاوازە مۆسیقیەکانی کە گوزارشت لە سەربەستی و ئازادی ئەکرد بۆ یۆنانی نیشتمانی و بۆ هەموو وڵاتەکانی کە بەدەست ڕژێمە دکتاتۆری‌و فاشیەکانەوە ئەیاننالاند.

کوستا کافراس لەبەر دوو هۆ مۆسیقاو ئاوازەکانی ئەم هونەرمەندەی خستبوە فیلمی (زێد)وە..

یەکەمیان.. وەك ڕێز لێنان بۆ خودی خۆی و بۆ هەڵوێستە پێشکەوتنخوازەکانی.. دووەمیان.. بۆ ئەوەی فیلمەکە بەتەواوی یۆنانی ئامێز بکات..

ئەمە فیلمی (زێد)ە کە پەردە لەسەر ڕوە ڕەشەکانی هێماکانی ڕژێمە کۆنەپەرست و دکتاتۆر و فاشستەکان رائەماڵێت..

ئەو دەستەو دایرەیەی بەنرخێکی هەرزان ویژدانی هەندێك هاوڵاتی بێ دەرامەت و هەژار بکڕێت بۆ



هەوڵی تیرۆر کردنی مانویل

ئەنجام دانی مەرامە گڵاوەکانیان..بۆ بەرهەڵستی کردنی خواستە ڕەواکانی جەماوەر و هێزە نیشتمانیەکان و بۆ لەناو بردنی هەموو خەبات و کۆششێك لەپێناو بەدی هێنانی ژیانی دیموکراسی و ئازادی و فرە بیرو باوەڕ.. لەو پێناوەدا هەموو کارێکی چەپەڵ ئەکەن تەنانەت تیرۆرکردنی خەباتگێڕە بە ئەمەکەکان..

فیلمی (زێد) یەکێکە لە فیلمە سیاسیە ئاراستە کراوە سەرکەوتوەکان لە جیهانی سینەمادا و تائێستا لە ڕۆژی بەرهەم هێنانیەوە ئامادەیی بەرچاوی هەیە چ لە هۆڵی سینەماکانی جیهان و چ لە پرۆگرامی کەناڵە تەلەفزیۆنەکان و هۆڵی یانەکانی سینەما.

# میمۆزاکانی* جەزائیر

■ ریشار دێمارسی (Richard Demarcy)

● و. لە فارسییەوە: عەبدولخالق یەعقوبی

**کاراکتەرەکانی شانۆنامەکە:**

کلێر (پیرێژن- دایەگەورە) Claire

کریستیان (ژنی لاو- کورەزا) Chirstian

((شوێنەکە (بە یادی خوالێخۆشبوو "ویتۆتی ژان"، "ویلا ژان"ی پێدەڵێن) زۆرتر لەوەی لە شوێنێکی راستەقینە و ئیمرۆیانە بچێ، شێوەی ژوورێکی تایبەت بە داب و دەستووری تازیەباریی دەدا. پیرێژن، یاساوڵی ئەو ژوورەو پاسەوانی رازو نهێنی ئەو ژوورە، زۆرتر دەڵێی یەک لە قارەمانانی ئاینی تازیەبارییە و لە مرۆی ئاسایی ناچێ. شتومەکی ناوماڵیش دەڵێی ئەسباب و ئامرازی تازیەبارین. پیرێژن سەرتاپا رەشپۆشەو زۆر بە وردی خەریکە مەلافەکانی سەر مێزەکە تاوتوو دەکا. دەڵێی دەیانژمێرێ یان لەبەرخۆیەوە پرتەپرت دەکا. لە دەرەوە زرینگەی هێوری زەنگێک دەبیسترێ)).

**پیرێژن:** کێیە؟ (بەرەو پەنجێرەکە دەچێ، ئەختێک کرکرەی دارینی پەردەکە دەکاتەوە تا دەرەوە ببینێت. تیشکێکی توند دێتە ژوورێ و دەپرژێتە سەر مەلافەکان).

ژنێکی ئەورووپایی؟ ژنێکی فەرەنسەیی؟ چی لە من دەوێ؟ (پیرێژن هەر لەجێی خۆی، چاوەڕێ دەمێنێتەوە. دوای چەند ساتێک، کەسێک لە دەرکەکە دەدا. جارێک، دوجار. پیرێژن هەمیسان جووڵە ناکا. ژنە بیانییەکە دەرکەکە دەکاتەوەو هەر لەوێ رادەوەستێ).

**ژنە بیانی:** دەرکەکە گاڵە نەدرابوو... (هەردوو لە باڵای یەک دەڕوانن).

**پیرێژن:** تۆ... تۆ... (وەک بڵێی سیحریان لێکردبێ چاو لە عەرز دەبڕێ). کریستیان... کریستیان...

**ژنە بیانی:** (بەهێوری، وەک ئەوەی بیەوێ دەرەتانێ بدا بە پیرێژن بێتەوە سەرخۆ) بەڵێ، منم... کچی کوڕەکەت... ئەمەش جۆرە قسەکردنێکە...

**پیرێژن:** (نیسان چاو لە عەرز دەکا، وەك بڵێی عەرز دەدوێنێ). کچۆڵەکەم... ئەم هەموو ساڵانە، ئەم هەموو ساڵانەو بێ سەرو شوێن! ئێستا چەند ساڵت تەمەنە؟

**ژنە بیانی:** نزیکەی چل ساڵ.

**پیرێژن:** وەرە ژووریٚ... هێندەم پێ سەیرە دەتبینم، هەر لەبیرم چوو پێت بڵێم وەرە ژووریٚ... (ژنە بیانی هەر لەبەر دەرکەیەو دوودڵە) وەرە ژووریٚ، ماڵی خۆتە... دا با چاوت لێبکەم... (پیرێژن دەچێ پەردەکە تەواو دەکاتەوە. تیشکی رەنگ پەریوی دەمەو ئێواریٚ ژوورەکە دەگرێتە ئامێزو نەختە سێبەرێك لێرەو لەویٚ هەر دەمێنێتەوە. پیرێژن، لە بێدەنگیدا، و بەچاوی رێز لە باڵای میوانە تازە هاتووەکەی خۆی دەڕوانێ، وەك بڵێی درێژایی زەمان دەپێویٚ و لە پشت ئەم رواڵەت و سیمایەوە، کە لەبەر چاوێتی، سەرو سیمایەکی تر دەبینێ).

هێشتاش هەر ئەو چاوە گەشانە و هەر ئەو نێو چاوانە بەرزە.. (ژنە بیانییەکە، کە تەواو پەشۆکاو دیارە، چاو بە چوار سووچی ژوورەکەدا دەگێڕیٚ. چاوی بە قەرەوێڵەیەکی بەرز دەکەویٚ کە چەپکە گوڵێکی ویشك لەبانییەوە هەڵواسراوەو دەستێك جل و بەرگی پیاوانەی لەسەر دانراوەو لەم سەراو سەریشی کەوش و کڵاوەکانی. لە پەنا قەرەوێڵەکە، لەگەن و سابوون و خاولییەك بەدی دەکریٚ... و هێندێك شتومەکی تر کە لە پەڕۆیەکەوە پێچراون. چەپکە گوڵێکی ویشکبوو بەدیوارەوەیە... پانتاییەکی خەمهێنەر بەسەر شوێنەکەدا زاڵە. پیرێژن دەیەوێ تەمی ئەو کەش و هەوا خەماوییە بڕەوێنێتەوە). کراسێکی جوانت لەبەرکردووە.

**ژنە بیانی:** بۆ کەش و هەوای ئەلجزایر کراسی هاوینان باشترە... دەریٚ هەوا هێشتاش هەر زۆر گەرمە... مەلافەکانت قەد دەکرد؟ با منیش یارمەتیت دەم... (ژنە بیانی دەست دەداتە مەلافەیەك و بە یارمەتی پیرێژن قەدی دەکا. پاشان یەکێکی تریش قەد دەکا. لەوە دەچێ زانیبێتی لەو کۆگا مەلافەیە ج کەم نەبۆتەوە).

وادیارە مەلافەت زۆرە. ئی دەر و دراوسێشن؟

**پیرێژن:** سبەی هەینییە. مەلافەی هەموان دەگۆڕم.

**ژنی لاو:** هەموان؟

**پیرێژن:** بەڵێ. هەموو ئێوارانی هەینی مەلافەی نوێیان تێهەڵدەکێشم... وەك قەدیم کچم. باڵنجێکیش بۆ "ژان"، بۆ ژێر سەری... دەنا وەکی دی زۆری بۆ رەقە...

**ژنی لاو:** (بێدەنگی. لەم وەڵامەی بەجارێك تاساوە). شەوانە باش خەوت لێدەکەویٚ؟

**پیرێژن:** زۆر لەمێژە جاری وایە چەند شەو لەسەر یەك تا بەیانی خەو لەچاوم ناکەویٚ...

**ژنی لاو:** لەکەیەوە؟... لەو کاتەوەی ئەو مردووە؟

**پیرێژن:** (چاو لە عەرز دەبڕیٚ) لەدوای مەرگی باوکتەوە، ژان. دەزانی چیە، جاری وایە پیاو بە هاسانی خەوی لیٚ حەرام دەبێ... خەو شتێکی زۆر ئاساییە. پیاو ئەو کاتەی هەیەتی زۆری سەرنج پێنادا... بەڵام وەختێك لە کیست دەچێ... چاو لە هەموو شتێك دەکەی...، لە بیرتە؟ (ئەوەی راستی بێ، کریستیان لەو کاتەوەی هاتۆتە ژوورەکە، نەك هەر گوێی بۆ قسەکانی دایەگەورەی، بەڵکو بۆ دەنگی لێدانی دڵی ئەم ماڵەش شل کردووە).

**ژنی لاو:** سی ساڵ و بگرە پتریش، ئێستاش ئەوە لەم ماڵەدا... ئەو ماڵەی هیچ کات لە بیرم نەکردووە... ئەو شوێنەی تێیدا گەلیٚ بەختەوەر بووم، تا ئەو رۆژە سامناکەی کە مەجبوور بووم بڕۆم... خۆشبەختانە تۆ مای... دڵنیام زۆر ناخۆشت رابواردووە، وایە؟ (دایەگەورە خۆی لە وەڵامی ئەم پرسیارە دەدزێتەوە. دەچێتە سەر کورسیلەیەکی خەیاتی و لە پەنا دیوار دادەنیشێ و خۆی بەکارەکەیەوە خەریك دەکا: دوورینی سفرە یان روومێزییەکی درێژی تۆری).

**پیرێژن:** بۆ ▪ کارێك هاتویتەوە بۆ ئەلجزایر؟

**ژنی لاو:** ئەمە هەر ئەو مێزەیە... (پیرێژن وەهای چاو تێ بڕیوە دەڵێی دڵنیا نیە ئەوە ژنە لاوەیەو لەوێ ڕاوەستاوە).

**پیرێژن:** بە خۆمم دەوت: "ئەوە دەمرم و ئیتر هیچ کات نایانبینمەوە: ژان، هانری، تۆ، دایکت... دوابەدوای ئەو ڕووداوە بۆ هەمیشە لێك هەڵبڕاین... پێکەوە چەند بەختەوەر بووین...

**ژنی لاو:** گەلێ جار دایکم خەبەری لێدەناری بێی بۆ فەرەنسەو لامان بمێنیتەوە.

**پیرێژن:** هیچ کات نەمدەتوانی. باوە گەورەت و ژان لێرە نێژراون. ئێرە نیشتمانی ئەوان و نیشتمانی منە. سەرەڕای ئەمانە، کێ ئاگای لەو دەبوو... ئێرە، ئەو...

**ژنی لاو:** ژان... باوکی من! پێم سەیرە تۆ هێشتاش هەر پێی دەڵێی ژان... وەك جاران... دەتگوت: "ژان، تکایە پەردەکە دادەوە... ژان، قفڵەکە..." (لەناکاو بێدەنگ دەبێ).

**پیرێژن:** باوکت خۆشحاڵە تۆ لێرەی. (کاتژمێرێکی دوورە دەست دووجار زەنگ لێدەدا).

سەعات دووەو هەوا هێشتاش هەر گەرمە... (پیرێژن دەچێ کرکرە دارینەکە دادەداتەوە. دیسان سێبەرو ڕووناکیی تێکەڵ دەبن. کاتێك دەگەڕێتەوە سەرنجی بۆ لای ژنی لاو رادەکێشرێ کە لەچکەکەی تا سەرچاوی دێنێ و وەك حافزێك بەکوێرە کوێر لە ژوورەکە دێت و دەچێ. پیرێژن متەقی لەخۆی بڕیوەو سەیری ژنە لاوەکە دەکا).

**ژنی لاو:** (لەبەرخۆیەوە) ئالێرە مێز، لێرە وەجاغی چێشت لێنان، لێرە شێری ئاو. (شێرەکە دەکاتەوە، ر ئاو بەسەر عەرزدا دەڕژێ و دەچێتە نێو کونێکەوە...) لێرەش... لێرەش... (پارچەی سەر ئەسبابێك هەڵدەداتەوە، دوگمەی رەش و سپی گەش وەك ریزێك ددان دەردەکەون). پیانۆ، کاتێك دەمژەنی پشیلەکەش دەهاتە سەر پیانۆکە و خرپ دەخەوت... (دەس لە دوگمەکان وەردەدا. هێندێکیان دەنگێکی نادیارو بۆشیان لێدێ، هێندێکی تریان ناکۆکن. سەرەڕای ئەوە، پارچە ئاهەنگێکی مندالانە دەژەنێ، ئاهەنگی: "سوارچاکی بچکۆلە"ی شومان. بێدەنگییەکی قورس).

**ژنی لاو:** (زۆر بەهێوری) پێم وایە کەسێك گوێی لە قسەکانمان راگرتووە.

**پیرێژن:** جگە لە من و تۆ کەس لێرە نیە.

**ژنی لاو:** وانیە، کەسێکی تری لێیە. هەست بە بوونی دەکەم. زۆر لە من نیزیکە. زۆر زۆر نیزیك... هەستی پێدەکەم... هانکەهانکی هەناسەی دەبیسم... بەڵێ... ئەوە نیزیکتر بۆوە، هەست دەکەم چاوم لە ئەم دەفتەرچە نۆتە دەکا. چاو لە دەستی من دەکا. (خێرا دەست لەسەر دوگمەی پیانۆکە هەڵدەگرێ، لەچکەکەی بە دڵخۆشییەوە دەباتەوە سەرێ و لە بەرامبەر خۆیداو بەسەر پیانۆکەوە وێنەیەك دەبینێ کە زیاتر لە نەخش و نیگاری سەر دیواران دەچێ).

**ژنی لاو:** ئەمە ئەوە: (وەك هاوار بکا وایە. لە پیانۆکە دوور دەکەوێتەوە).

**پیرێژن:** بەڵێ، خۆیەتی. ئەو لێرەیە. (چەند وێنەیەکی کۆنی تری پێنیشاندەدا کە تەپ و تۆزیان لێنیشتووەو رەنگی دیواریان گرتووەو زۆر بە زەحمەت دەبیندرێن).

ئەوێ.. ئەوێش (ئاماژە بۆ شوێنی چە ﹥ ء گوڵە ویشکە هەڵواسراوەکەو قەرەوێڵەکە لەنێو ؛ ـاریك و ڕوونی ئەوسەری ژوورەکە دەکا).

ئەوەش باوکی، هانری، باوەگەورەی تۆ، سی‌و هەشت ساڵی تەمەن بوو.

**ژنی لاو:** ئەوی دیکەش دایکمە...

**پیرێژن:** تێو هێڵین پێکەوە، لە کەنار زەریا.

**ژنی لاو:** (وێنەکە لە دیوارەکە دەکاتەوە) کەوایە ئەو باوکی منە، ژان، ژان... (وێنەکە لە بەر

رووناکایی پەنجێرەی ژوورەکە رادەگرێ و لێی ورد دەبێتەوە) کەوایە ئەوە تۆی، تۆ، تۆ.

ئەی مردوو، لە کوێی؟

تۆ لێرە دەنووی، لێرە مەلە دەکەی، لێرە هەڵدەفڕێ، یان لە دەشت و دەر، هاوڕێ لەگەڵ باکە رێنوێنی تۆیە رێ دەگریتە بەر؟ نا، نازانم. تۆ بوویتە گەردەلوولی تەپ و تۆزو زیخ و چەو. تۆ بوویتە پریشکەی ئاگری بان زەریایەك کە تا تەشقی ئاسمان بڵێسەت باڵا دەکا. بەڵام دواجار من هەر پێت دەگەم و دەتگرمەوە.

ئەمجار لە دەستم دەرناچی
نا، تۆ ناتوانی دەرباز بی لە هیچ لاوە
بۆ کۆچی بەرەو ئاسمان
پەیژەت بۆ هەڵنەپەسێراوە
ئابووتی تۆ گەمیە نیە،
نینۆکی تۆ باڵی مەلی ماسی خۆر نین،
نا، ئاسمان پەیکەرەی پاپۆڕی تۆ نیە،
ئاخ، ئەی ئەفسوونگەری گەورە !
کاکۆڵت شەپۆلی زەریاو
چاوت رەنگی خۆر ئاوایە.
ئەمجار لەنێو دڵی مناى
منیش دەستت لێبەرنادەم تا هەتایە.

**پیرێژن:** با بچم فڕوجێکت بۆ سوور کەمەوە. ئەو دراوسێیەشمان هەموو هەینیان دێ، جەنابی مۆڕۆ، دەیناسییەوە؟ دڵنیام نایناسیەوە. هەر ئەو فڕووجم بۆ دێنێ. لەوانەیە هەر ئێستا بێت. (چاوێك لە ژنی لاو دەکا) بۆوە دەبێ پێی پێبکەنی؟

**ژنی لاو:** چی بۆوە دەبێ پێی پێبکەنم؟

**پیرێژن:** چاوت لێدەکەم، دەتبینم، بەڵام دڵنیا نیم لێرەی..، نا نا، هەر لێیگەڕێ... وەرە لێرە دانیشە، رەنگە دڵت کوڵێکی قسە پێیە هەڵیڕێژێ. (دەچێ قرتاڵەیەك دێنێ. پێکەوە سەوزی چاك دەکەن. هەمیسان ئاگری بێدەنگییەکی ئازار دە هەندە دابیسێ. پیرێژن هەوڵی ئەوەی مەیە ئەو ئاگرە بکوژێنێتەوە).

دایە گەورە/ **پیرێژن:** مێردەکەت هەر لە پاریس ماوەتەوە؟

کریستیان/ **ژنی لاو:** بەڵێ، لەگەڵ منداڵەکان. ئێستا شوکور گەورە بوون.

**دایە گەورە:** دەبێ رۆژێك بێن بۆ ئێرە. کەنار زەریای ئێرە زۆر جوان و دڵگیرە. دەبێ دەشت و دەریشیان پێخۆش بێ.. باوکت... (پاشماوەی قسەکەی دەخواتەوە) جگە لەمە، ئێستا ئیتر فەرەنسەییەکان وردە وردە رووردەکەنە ئەلجزایر... ماوەیەکی زۆری بەسەرداهات. ئێستا ئیتر ساڵی هەشتاو هەشتە (*1988*) و بیست و پێنج ساڵە شەڕ تەواو بووە... سەرەڕای ئەمە، ئێرە نیشتمانی ئەوانیشە. ئەوان نەختێکیش ئەلجزایرین، هەرچەندە باب و باپیریان ئیسپانیاییە.. یان راسترەکەی بڵێم کالیسیایی.

**کریستیان:** لە قوتابخانە ئیسپانیاییش فێردەبن.. ئەو کاتەی دەهاتم، پێدەکەنین و دەیانوت: "هەر بینا رۆژێك لەم رۆژانە بێین بۆ لای دایە گەورە عەرەبەکەمان... خۆ دایەگەورە ئیسپانیایی دەزانێ، ئەم ماوەی پشوودانەمان دەکەین بەوانەی زمانناسی". (وێنەیەك دەداتە دەست دایەگەورەو ئەویش بەسەرنجەوە لێی دەڕوانێ).

دایە گەورە: هەر راست وەك باوکت... [illegible]ەر بەو نێو چاوە گرژو مۆنە خەمبارەیەوە، بەو کاکۆ[illegible] رەش و جوانانەیەوە، دەتگوت شەپۆلی زەریان و قیلت بەسەردا کردوون...

**کریستیان:** تۆ هێشتاش بە ئیسپانیایی قسە دەکەی؟

**دایەگەورە:** ئەو گۆرانیانەی ساڵانی قەدیمیش دەتگوت؟

**دایەگەورە:** جاروبارە بۆی دەڵێم.

**کریستیان:** یەکیانم بۆ بڵێ.

**دایەگەورە:** لێرە، ئا ئێستا!؟...

**کریستیان:** بەڵێ...

**دایەگەورە:** نا، ناتوانم... (لەناکاو سەوزییەکە وەلا دەنێ. پاشان لەبەرخۆیەوە سەرەتای هەوای لایەلایەیەك دەڵێتەوەو لەپڕ بێدەنگ دەبێ).

**کریستیان:** باسی ئەوم بۆ بکە. (بێدەنگی) بە راستی چۆن مرد؟

**دایەگەورە:** ... شەڕ...

**کریستیان:** نا! نا! نا! ئەمە درۆیە. ئەو درۆیەی بە درێژایی تەمەنی منالیم لەگەڵیان کردم. ئەو زەمان رۆیی. من هاتووم بۆ ئەوەی بزانم چۆن بوو مرد...

**دایەگەورە:** تکایە گوێم بۆ بگرە کچی خۆم... جارێ نا، دوایی، دوایی. باخووی پێبگرم. دەبێ بیرەوەرییەکانم وەرد دەمەوە، خۆت دەزانی خۆ هەروا هاسان نیە... راستە باوکی تۆیە، بەڵام خۆ کوڕی منیشە. تکایە تۆزێك دان بە جەرگت دابنێ. (بێدەنگی. تێکچووەو بە ئاسایی ناڕەحەتەوە سەوزی چاك دەکا). بە پاپۆڕ هاتی؟

**کریستیان:** بەڵێ.

**دایەگەورە:** لەوە دەچێ پیاو بە پاپۆڕ بێ بۆ ئێرە، لە دوورەوە شار زۆر جوان بێ.

**کریستیان:** پیاو سەری لەزەردەپەڕی ئێوارانی ئەلجزایر سووڕدەمێنێ. بەتایبەت بۆ من. بیری لێبکەوە، پاش سیساڵ. لە پێشەوەی پاپۆڕێك دانیشێو لەناکاو شارۆچکەیەك ببینێ لەسەرخۆو هێور لێت دێتە پێشێ، هەر راست وەك بڵێی بەرەو لات بخزێ. بۆ ساتێك نازانی و سەرت لێدەشێوێ ئەرێ ئەو شارە بۆ لای تۆ دێ هەر ئەو شارەی سەرتاسەری لەژێر تیشکی بەتینی خۆردا سپی دەنوێنێ- یان نا ئەوە پاپۆڕەکەیە لە شار نیزیك دەبێتەوە. (گەیشتنەکەی دێنێتە بەرچاو) هەرچەند لێی نیزیکتر دەبوومەوە، بە روانینم پتر لە شار ورد دەبوومەوەو تێیدا دەگەڕام: "بڵێی ئەو گەڕەکەی تێیدا دەژیان لە کوێ بێ؟ "کلو سالامبیە" لە کوێیە؟ بڵێی هێشتاش هەر مابێ؟ داخۆ ئێستا چی بەسەر هاتووە؟ ماڵی خۆمان لەکوێیە؟ لەوێ؟ لەولایەوە؟ ئێستا دایەگەورە لە کوێیە؟ بڵێیی هەر لە هەمان ماڵە بچووکە سپیەکەدا بێ کە پەردەکانی شین بوون؟ هێشتاش حەوشەکەی بۆنی تەرزە دەدا؟ پلیکانەکان هێشتاش بۆنی بۆیەو واکەس دەدەن؟" هەر ئەو پلیکانانەی لە دەس گەرما پەنامان بۆ دەبردن: ئەوێ فێنك بوو. بۆنی واکسی تازەی لێدەهات، بەکەیفێمان بوو. پێمانوابوو لە دەرێ گەرما شار قڕ دەکا، لەولاوە هاڕە هاڕی ماشێنە نیزامییەکانیش گوێی کەڕ دەکرد، ئێمەی منال هێشتا نەماندەزانی رەشبگیر چیە، بەڵام دەترساین... ئاخ! بۆنی تەرزەی نێو ئەو حەوشەو حەسارە. هەرکە گەیشتمە ئێرە بەم بۆنەدا ماڵەکەم ناسییەوە. (بێدەنگی. دیسان دەست دەکاتەوە بە سەوزی پاکردن).

بەڵام ئەم شارە سپی پۆشە هەروا وەك شاری مۆتەکەو شت لێم نیزیك دەبۆوەو منیش دەترسام.

**دایەگەورە:** دەترسای؟ لەچی دەترسای؟

**کریستیان:** (لەبەرخۆیەوە و لە هەمان کاتیشت دا رووی دەمی لە دایەگەورەیە).

ترس لە دیتنەوەی ئەم ماڵە، ترس لە زانین و دۆزینەوەی رازو نهێنی ئەو شتەی بەدوایدا هاتووم، ترس لەو ترسەی بە منالیی هەمانبوو، ئەوکاتەی زەنازەنای خەڵك و گرمەگرمی گوللەمان دەبیست، ترسێکی زۆر گەورەی پێکهاتوو لە هەموو ترسەکان: ترسی دوێنێ، ترسی ئێستا، ترسی دیتنی شوێنی ئەو شەڕە سامناکەی کە من دواتر پێم زانی... بەختێکی باشم بوو، کە پاپۆڕەکە لەنگەری خست و خەڵك دابەزین، زرینگە زرینگی زنجیرەکانی رایچڵەکاندم و گەڕامەوە بۆ ئەم دنیا راستەقینەیەو توانیم تا ئێرەکانێ رێ ببڕم، دەنا دەگەڕامەوە.

**دایەگەورە:** شتێکی ترت نەدی؟ بۆ وێنە...

**کریستیان:** زۆر لە گەڕانەوە دەترسام. هەرای تاکسی‌یەکم کرد. نیشانییەکەم لەسەر کوتێک قاقەز نووسیبوو. وشەیەك چیە لەگەڵ شۆفێرەکە نەدوام. ئەویش قرپوقەپی کردبوو. دەتگوت بە حاڵ و باڵی زانیبووم. تەنانەت چاویلکەیەکی رەشم لەچاو کردبوو. بۆ ئەوەی هیچ نەبینم لە ناوەوەش قاقەزی رەشم بە شووشەکانییەوە چەسپاندبوو، بەتایبەت هیچ شتێکی ئەم شارە تا بتوانم خۆم بگەیەنمە ئێرە. کەچی سەرەڕای ئەوە وام هەست دەکرد ترپەی پێی ئەم شارە دەبیسم، و ئەوە خۆی بە دەخزێنێتە نێو هەناوم. لاق و پلم دێشا، ملم دێشا، شاخ لەم پێڵاوە تازە گووتێبووانەم! (دایاندەکەنێ).

**دایەگەورە:** سەربازەکان چی؟ ئەوانت نەدی؟ هەروەك ئەو رۆژانەیە... زۆر لە مێژە ئیتر لەماڵ دەرناکەوم.

**کریستیان:** جاروبارە هاوارێکم دەبیست. تاکسی‌یەکە رایگرت. (دەست لەسەر گوێی دادەنێ).

دوایی ئیتر چم نەبیست، هیچ شتێکم نەبیست. کە گەیشتمە گەڕەکەکە هەستم بە بۆنی گوڵاڵە سپی کرد. پۆلێك زەرنەقووتەی زەرد لەسەر لق و پۆپی درەختەکان هەڵنیشتبوون. ئەوکات بوو ئەلجزایرم دووبارە دۆزییەوە و توانیم چاو لە پەرژینی حەوشەو ماڵەکە بکەم... باوکم لە...

**دایەگەورە:** تکایە لەسەرەخۆ بە... نەختێك لەسەرەخۆبە. (هەڵدەستێ، شێری پەنا دیوارەکە دەکاتەوەو کەمێك ئاو دێنێ). لە پاریسەوە هاتی؟

**کریستیان:** بەڵێ لە پاریسەوە بۆ مارسی بە فڕۆکە هاتم، دوایە سواری پاپۆڕ بووم. لەوە دەچوو دەستێك پاڵم پێوە دەنێ بێم بۆ ئێرە، وام هەست دەکرد ئەوە من نیم بڕیار دەدەم. (دایەگەورە دیسان خۆی لە باسەکە دەدزێتەوە. چاوێك لە قەرەوێڵەکەی ئەوسەری ژوورەکە دەکاو هەر وا لەبەرخۆیەوە وشەیەك، کە پیاو لێی حاڵی نابێ، دەڵێتەوە).

**دایەگەورە:** من قەت سواری فڕۆکە نەبووم... تازە بۆ من نابێ... پاریس بۆ من نامۆیە. تەنانەت ئەوکاتەی لە فەرەنسەش بووم سەردانی ئەم شارەم نەکرد. من، "ژنێکی فەرەنسایی"، لێکیدەوە! (هەڵدەستێ و دەچێ سەوزییەکان دەشواتەوە). ژنێکی فەرەنسەیی! یان وەك دەڵێن "پێ ڕەش"*

**کریستیان:** تۆ خەڵکی ئەلجزیرەی.

**دایەگەورە:** دڵنیام ناتوانم ئەم شارە جێ بهێڵم. باشە، من کێم؟ دایك و باوکم ئیسپانیایی بوون و مێردەکەشم، هاندی، فەرەنسەیی... من نەختێك لەهەر کامیانم، هەر ئەو شتەی هەموو جارێ باسی دەکەم، تەواو وەك چێشتی مجێسور وام! تۆش، دایکت بەرەچەڵەك لە هیستا نییە. تۆ فەرەنسەییەکی لەمیستانیی. (ئەو پرسیارە دەکا کە ئۆقرەی لێهەڵگرتووە). بەڵام تۆ بەخاتری چی هاتووی؟

**کریستیان:** دایە، من بۆیە هاتووم، من بۆیە هاتووم راستیی مەرگی باوکم پێ بڵێی. ئەو راستیەی کە هەمیشە لە منت شاردۆتەوە. من دەبێ بەو راستییە بزانم!

**دایەگەورە:** مەرگی باوکت؟

**کریستیان:** بەڵی دایە، مەرگی باوکم!

**دایەگەورە:** ئەرێ توخوا کچۆڵەکەم... هەڵیگرە بۆ دوایی...

**کریستیان:** بەڵام دایە من ئەوە نیزیکی چلساڵم تەمەنە. لە سی ساڵ لەوەو پێشەوە بە بێ ئەوەی هیچ شتێکی لێبزانم دەژیم. چاوم قووچاندووە و کارم کردووە و هیچ کات نەمویستووە بە شتێکی بزانم. بەڵام ئێستا کاتی ئەوە هاتووە هەموو شتێکم بۆ روون بێتەوە.

**دایەگەورە:** زۆر دوورە... زۆر دوور...

---

* Pied- Noir بە فەرەنساییەکانی دانیشتووی ئەلجزایر، بەر لەسەربەخۆیی ئەم وڵاتە (1964)، دەڵێن.

**کریستیان:** دەمەوێ بزانم باوکم چۆن مردو بۆ مرد، لەکوێ نێژراوە، چەند ساڵ ژیا، بەر لە مەرگی چی کردووە، و بەتایبەت بەچی مردووە. بەچی؟ لەکوێ؟

**دایەگەورە:** ئەمانە هەموو دەگەڕێنەوە بۆ زەمانی زوو. دەبێ لێیانگەڕێین مردووەکان بحەسێنەوە.

**کریستیان:** نا، ئەوان حەساوە نین. من و تۆش حەساوە نین. هەموو شتێك زۆر نیزیکە، زۆر نیزیك، هەم بۆ تۆ، هەمیش بۆ من. هێشتاش لەنێو دڵمان دایە، وەك کەسێك هێزێك لە هەناوییەوە هانی بدا ڕۆژێك خۆی بکوژێ، هازرو ئامادە لەسەر لێواری هەڵدێرێکی هەڵەمووت.

**دایەگەورە:** لەسەرەخۆبە... دیسان نەختێك لەسەرەخۆبە. تکات لێدەکەم، بەڵێن بێ هەموو شتێکت پێبڵێم.

**کریستیان:** (چاوی بە سندووقێك دەکەوێ کە وێنەی گورگڵێنەیەکی لەسەر کێشرابۆوە). هێشتاش سندووقی بووکە دارینەکانم ماوە؟ دەکرێ چاوێکی لێبکەم؟

**دایەگەورە:** هەموو شتێکم پاراستووە. تەنانەت بووکە دارنیەکانیشت هەر ماون. (کریستیان دەرگای سندووقەکە دەکاتەوە و شتی جۆراو جۆری لێدەردێنێ، یەکیان قاقەزێکی کۆنی لوول کراوە). بەو دەستە نەسرەوتووانەت چاکت کابە بەو بووکە دارینانە دەکرد. ئەو دوو مەلەوانە چکۆلانەت لەبیرە هەمیشە لەگەڵیان دەنووستی؟

**کریستیان:** دەفتەرەکانم... ئای، دەستوخەتم... ئەوەتانێ؛ ئەوەش بووکە دارینەکان. (بووکە دارینەیەکی پێچراو لە قاقەزێکی سپی دەردێنێ). ئەمەش یەکێکی تر... (بووکە دارینەیەکی تر دەردێنێ کە هەر لەوەی پێشوو دەچێ؛ بەڵام سەری پێوە نیە). لەتێکی ون بووە...

**دایەگەورە:** لەنێو قوتوویەك دایە. (کریستیان قوتوویەکی رەشی چکۆلە دەردێنێ. دەست دەخاتە نێو قوتووەکەو سەری تاشراوی پشیلەیەکی لێدەردێنێ و لەسەر لەشی بووکە دارینەکەی دادەنێ. پەڕۆ کۆنەکەی کون بووەو زیخی لێدەرژێتە خوار).

**دایەگەورە:** دەبێ بیدوورمەوە. (لەگەنێك لە بن بووکە دارینەکە رادەگرێ. زیخەکەی دەرژێتە ناو لەگەنەکە. لە زەنگ دەدەن).

**کریستیان:** لە زەنگیان دا. (هەردووکیان بێ جووڵە رادەوەستن. پاشان پیرێژن دەچێتە بەر پەنجێرەکە).

**دایەگەورە:** جەنابی مۆرۆیە... دەچی دەرکەی لێبکەیەوە؟ (ژنی لاو دەچێتە دەرێ. دەگەڕێتەوە. پرێسکەیەکی پێیە لە پارچەیەکەوە پێچراوە. قابلەمەیەکی سەرنراویشی بە دەستەوەیە. دەیانداتە دەست پیرێژن).

**دایەگەورە:** دەستت خۆش بێ. (پیرێژن زۆر بە رێك و پێکی پرێسکەکە لەسەر مێز دادەنێ و دەیکاتەوە فرۆجێکی لێدەردێنێ. سەرو پێی فرۆجەکە براون. لەتێك لە سنگی لێدەکاتەوەو پۆپەو زمانی دەبڕێ).

**دایەگەورە:** (ئاماژە بۆ قابلەمەکە دەکا) خوێنەکەشی بۆ هێناوم. پێی وایە "مریشکی لە خوێندا کوڵاتوو" زۆر بەتام و چێژە. بە کالیسیایی پێی دەڵێن "ئاکابیدێلا" (*Acabidala*). تا ئێستا تاقیم نەکردۆتەوە.. (کریستیان پاڵ بە مێزەکەوە ئەدا) دەڵێی باش نییە؟

—**کریستیان:** پێم وایە لەبەر گەرما سێ... (کریستیان بۆ لای پەنجێرەکە دەچێ و دەیکاتەوە. تیشك دێتە ژوورێ. زرمەزرمی مۆسیقای عەرەبی دەبیسرێ. گۆرانییەکی ژنانە لەنێو زەنازەنای خەڵك دا.

**دایەگەورە:** وا دیارە لە گەڕەکەکەمان دا شاییە.

**کریستیان:** زۆر سەیرە. لەبیرمە سێ ساڵ لەوەپێش هەر ئەم پەنجێرەیەم کردەوە. دەرەوە هەراو هوریایەك بوو مەگین خوا بیزانێ بەڵام دایکم

هەرزوو پێوەیدا. بە ترومبیل ڕێپێوانیان دەکرد. بۆ ئەلجزایری فەرەنسەیی. (وەك بڵێی بیر لە شتێك بکاتەوە). "ئەلجزایری فەرەنسەیی!" ئەم وشانەم ئێستا چەندە قۆڕ دێنە بەرچاو... (پەنجێرەکە پێوەدەداو دادەنیشێتەوە. فڕووجەکە لەنێو قابلەمەکەدایە. دایەگەورە سفرەیەك دەردێنێ. لەسەر مێزەکە ڕایدەخاو دەوری و کەوچك و چنگاڵ بۆ سێ کەس دادەنێ). جەنابی مۆرۆش بۆ شام دێ؟

**دایەگەورە:** نا... ئەوە نی ژانە. شەوانە دێ و پێکەوە شام دەخۆین. جاروبارە پێیخۆشە هەر لێرە بخەوێ، دەڵی لەوێ چاکم خەو لێناکەوێ. گۆیا لەوێ لەسەر عەرز ڕادەکشێ و سەریشی دێشێ. (چاو لە مێزەکە دەبڕێ). جاری وایە مێزەکە بۆ هەمووان دەڕازێنمەوە، بۆ هانری و ژان و هێلێن و تۆ. هەمیشە ڕۆژی حەوتی ژانویە...

**کریستیان:** ڕۆژی لە دایکبوونی من.

**دایەگەورە:** جا ئەو دەم ژوورەکە دەڕازێتەوە. سفرەکەو هەموو شتێکی سەر مێزەکە. مۆمەکان، کێك، هەموو شتێك وەك جاران دەڕازێنمەوە. هەر ئەو چێشتانەی سالانیش: قرژاڵ، بابۆڵە، ماسی، سالادی میوە. (بە تامەزرۆییەوە چاو لە مێزەکە دەکا). ئەوکات بە هەمووتان ڕادەکەم و دەستدەکەین بە خواردن... لە بێدەنگیدا... تا باشتر بیر لە بەختەوەریی پێکەوە بوونمان بکەینەوە. (زۆر بە هێوری، وەك بڵێی بیەوێ نهێنییەك بدرکێنێ). دوایی... هەمووی فڕێ دەدەم... هەمووی... ڕۆژی لە دایکبوونی تۆیە، وەك سالان. (بێدەنگی).

**کریستیان:** باشە ئێستا جوابم دەوە. ئەو چۆن مرد؟

**دایەگەورە:** باوکت لەشەڕدا کوژراوە. خۆ بۆ خۆت باش دەزانی.

**کریستیان:** چەند لاساری. ئیتر درۆم لەگەل مەکە دایە. باوکی من هیچ کات نەچووە بۆ شەڕ. "لەشەڕدا کوژراوە". کەوایە نیشانی زێڕشیان پێداوە. گوێم بۆ شل کە، ئەمە ئەو وەڵامەیە هەمیشە بەگوێیاندا داومەتەوە، بەڵام من ئیتر ئەو منالە بەستەزمانەی ئەو کاتە نیم ئێرەم جێهێشت و ڕۆیشتم. تۆ دەبێ ڕاستییەکەیم پێ بڵێی. ئەو هیچ کات سەربازیی نەکردووە. ئەوەندە نەبێ "پێ ڕەشێك" بوو لە کارخانەی گازدا کاری دەکرد. ئەو سەرباز نەبوو. ئەودەم هەموو وڵات لە ئابلوقەی شەڕدا بوو... کە ئەوکات بەمەیان دەگوت "پێکەوە سازان". ئاپۆرەی سەربازی فەرەنسەیی، بەتایبەت کڵاوسوورەکان، هەموو دنیایان تەنیبۆوە. هێزێکی نیزامیی تریش هەبوو، نا هێزێکی تر نەبوو، (تووڕەو ئاسەبی دەبێ) واتە لە هەموو شوێنێ سێبەری دیار بوو، وەك شەوە. هێزی شەوە بوو. باوکی من شەوەیەو تۆیش شەوەی، منیش شەوەم... لێرە ئێمە هەر شەوەین و ئیتر هیچ. وەك ئەم فڕووجە سپییە، سپی و سەربڕاو وەك ئەم قابلەمە خوێنە کە سپییە، سپی! لێرە هەموو شتێك سپی و ڕەنگ بزڕکاوە، وەك ئەم شارە ڕەنگ بزڕکاوە. ئەلجزیرەی سپی! بەراستی سەیرە! ئەلجزیرەی شاری شەوە، شاری شەوە هەتامەتایە.

**دایەگەورە:** ئارام بگرە کچم، تکات لێدەکەم. بەڵێن بێ، هەموو شتێکت پێبڵێم. بە هەموو شتێك دەزانی.

**کریستیان:** کەوایە پێم بڵێ چۆن مرد؟ چۆن؟ لەکوێ و کەی مردووە ئەوە دەزانم. سالی 1957 لە بەندیخانەی باربروس بوو، کە زۆریش لێرە دوور نییە. ئەوەش دەزانم تیرەبارانیان نەکرد. دەمزانی درۆم لەگەڵ دەکەن. بەڵام خۆیشم پێویستیم بەم درۆیە بوو. لە دڵی خۆما دەمگوت: "باوکم، باوکی من کەرێتییەکی گەورەی کردووەو تیرەباران کراوە...". بەلام دواتر زانیم: نا، شتی وا نابێ، ئەوان قەت ئەوروپاییەك، کەسێك کە سەرباز نیە، "پێ ڕەشێك"، فەرەنسەییەك تیرباران ناکەن، تیرەبارانیان نەکردووە. شتی وا هەر نابێ. دەیجا چۆن مردووە؟! هەروەك دۆستی سەردەمی منالیی خۆی، ستوان

مایق، ئەو پێ ڕەشەی کە بە چەکەوە ڕایکرد بۆ ئەودیو و پاش ئەوەی گرتیان ئەوەندەیان لە جەنگەڵ بێگاری پێکرد تا بۆ خۆی مرد... ئەرێ، ئەرێ ئێوە لە منی دەشارنەوە؟!

**دایەگەورە:** کەوایە با ببینی. من ئیتر ناتوانم لەوە زیاتر قسە بکەم... (لەژێر دۆشەکەکە چەند لاپەڕەیەك ڕۆژنامە دەردێنێ کە بەهۆی کۆن بوونیان زەرد بوون). هەموو شتێك لێرەدا نووسراوە.

**کریستیان:** (دەیخوێنێتەوە و دادەنیشێ. یەکەمین وشە هێواش، زۆر بە هێواشی دەخوێنێتەوە)، سزادان بەگیۆتین. سزادان بەگیۆتین. باوکی منیان بەگیۆتین کوشتووە! (سەردێڕەکان دەخوێنێتەوە). "تاقە ئەورووپاییەك کە لە زەمانی شەڕی ئەلجزایردا بە گیۆتین سزا دراوە". "عەدالەت! فێرنان وێنۆتی (*Fernand venoty*) ترۆریست، بەرەبەیانی ئێمڕۆ، کاتژمێر پێنج و دە دەقە بەر لە پێتی مارك (*Pet Maroc*) و عەبدولقادر لافتای هاوبەندی سەر بە بەندی مەحکووم بە مەرگەکانی زیندانی باربروس، بەگیۆتین ئیعدام کرا". کەوایە جەنایەتکار بووە؟ ڕەنگە جەنایەتێکی سامناکی کردبێ؟!

**دایەگەورە:** باوکت ئەو پیاوە نەبوو پیاوبکوژێ، هەرگیز. دڵنیابە!

**کریستیان:** ... "سەرۆك كۆمار -کوونی- داوا بۆ لێبوردنی وێنۆتی ترۆریستی قبووڵ نەکرد. دواجار پێکەوە سازانی پاریس لەگەڵ ترۆریستەکان کۆتایی پێهات". چا ئەم وێنەیەی! پیاو پێی وایە چنگیان لە مووی سەری گیراندووەو هەڵیانکەندووە... (ماوەیەکی زۆر بێدەنگی. پاشماوەی لاپەڕە لێکراوەکانی ڕۆژنامەکە دەخوێنێتەوە. لە خوێندنەوە دەبێتەوە. وەك بڵێی ڕق و قینێك لە ناخیەوە هەڵقووڵێ لایە لایەی سەردەمی منالیی دەڵێتەوە. سەرەتا نەرم و هێواش، دوایی بە دەنگێکی بەرزو بڵیند... دەڵێی هاوارێکی بەرزە لە ژوورەکەدا، شێوەنێکی بەرزو لەناخ هەڵقوڵاو کە ئەوە دوای ساڵەهای ساڵ لە زیندانی گەرووی ڕزگار دەبێ... پاشان، ماوەیەکی زۆر بێدەنگیی... دایەگەورە، هەروەك چۆن عادەتێتی، ئانیشکی لە سەر وەجاغی چێشت لێنانەکە داناوەو چاوی لە قابلەمەکەیە. وەك بڵێی پاڵی بە پەنجێرەکەوە دابێ).

**کریستیان:** هێشتاش هەر ئەو وەجاغەت هەیە؟

**دایەگەورە:** هێشتاش هەر ئەوەیە. لەو دەمەی شووشەی شیری تۆم لەسەر گەرم دەکردەوە تا ئێستا کەوا ئەم فڕووجە سوور دەکەمەوە...

**کریستیان:** کاتێك بەم شێوەیە ڕادەوەستای زۆرم پێ جوان بووی، هەڵدەستامە سەرپێ، دەهاتی دەتبردمە سەرمێزی خواردن و خۆیشت ئاوا ڕادەوەستای، بۆ ئەوە ئاگات لە شێرەکە بێ: دەتگوت لەبەر پەنجێرە یان لەسەر مەیوان ڕاوەستاوی... دەمگوت "دایەگەورە"... لەبەر پەنجێرە ڕاوەستاوی... لەنێو ئەو ئاگرەدا چی دەبینی دایەگەورە؟"

(دایەگەورە ئاوڕ ناداتەوە... لەو سووچەوە کە بەسەر وەجاغەکەدا نووشتاوەتەوە، پشتی پان و تەخت دێتە بەرچاو).

**دایەگەورە:** دەمگوت: بەختەوەریی گەورە... بەختەوەریی گەورە... بەڵام بەدبەختییەکی گەورە چاوەڕوانی ئەم ماڵەی دەکرد... دایکت لێرە چەند بەختەوەر بوو. ڕۆژێك ژان پێی گوتم: "دەزانی دایە، لە پاریس، ئەو دەمەی لە زانکۆ بووم، هێلێنم ناسی. کیژێکی بۆرەی لە هێستانییە. بە نیازم بیخوازم. قەرارە بە یەکجاری بێ بۆ ئێرە!..." من پێمخۆشبوو، بەڵام وەك هەموو جارێ لە دڵی خۆمدا گوتم: "هیوادارم پێکەوە بسازێن و ئێرەی بەدڵ بێ. خودا بکا لەوەی کە دەبێ ماڵی لەگەڕەکێکی پڕ لە عەرەب و منالە ورکە بێ شەرم نەکا. منالە ورکەی چی؟ بە ئیسکێت و ڕەوڕەوە قورازەکانیان هەراو هەنگامەیەك ساز دەکەن هەر وەرەو سەیری کە. ئێرە گەڕەکێکە پڕ لە ماڵە هەژار... ماڵەکەشمان

چکۆلەیە... بەڵام نا، کاتێك هات، هەرکە چاومان بەیەك کەوت، کەوتینە بەردڵی یەکتر. کیژێکی بۆرەی بسك شۆڕو زێڕین. دڵم داخورپا. پێم گوت: "ئێرە ماڵی خۆتە کچم". ئەویش وەڵامی دامەوە: "نا، ئێرە ماڵی هەموومانە، ماڵی ژان، ماڵی تۆ و ماڵی من". هەر لەو ڕۆژانەوە ئەوینی ئەم وڵاتەی کەوتە دڵەوە. پێکەوە دەچووین بۆ بازاڕ. هێلێن ئەم مرۆڤانە، ئەم خەڵکەی خۆشدەویست، هەر ڕاست وەك باوکت، عەرەبەکانیش ئەویان خۆشدەویست. لەو قسە ناحەزانەی بە پیاوی فیۆدالی و تەنانەت فەرەنسەییەکانیش دەگوت بەمیان نەدەگوت. هێلێنی دایکت هاڤاڵی من بوو. پێکەوە دەچووین بۆ کەنارو ماسیمان دەکڕی. عەرەبەکان دەیانناسی. ئەویش وەك تۆ ئی ئەم وڵاتەیە... زۆری حەز بەوە دەکرد دەست بەسەر فۆکلەو نێوچاوانی ژان دابێنێ؟. کە ژان لەسەر کار دەگەڕایەوە، پێی دەگوت: "دیسان فوکلە جوانەکەیان لێئاڵۆز کردووی. ڕاوەستە، ئا ئێستە کاکۆڵت بۆ ڕاست دەکەمەوە". بەر لەم شەڕە ماڵوێرانکەرە، ئێمە زۆر بەختەوەر بووین. (وردە وردە دەبێتە شەو. گڕی شینی وەجاغ گازەکە ژوورەکە ڕووناك دەکا).

**کریستیان:** تۆ هەمیشە گۆرانیت دەگوت و هەوای گالیسیت فێری دایکم دەکرد. فێری منیشت دەکرد... بریا بتزانیبا ئێستا چەندەم پێخۆشە نەختێکم بە ڕاستیی و دروستیی شتەکە زانیوە. زۆر پێویستیم پێبوو. هەروا کە پێویستیم بەوە بوو بێم بۆ ئێرە. ساڵەهای ساڵ بوو پێم وابوو خەریکە دەخنکێم... ئاخری زانیم، هەرچەند کارەساتێکی گەورەیە. ئەرێ فەرەنسەیی تر لێرە ماون؟

**دایەگەورە:** دوای وەرگرتنی سەربەخۆیی هەر من و جەنابی مۆرۆ ماوین. هەڵبەت عەرەب ڕێزی منیان زۆر دەگرت. ئاخر ئەوان دەیانزانی من دایکی ژان وێنۆتیم. سەرەتا بۆ جەنابی مۆرۆ ناخۆش بوو. پاشان بارودۆخەکە هێندێك گۆڕاو...

**کریستیان:** تا بەردەم گیۆتینەکەی لەگەڵ چووی؟

**دایەگەورە:** نا... نە من، نە باوەگەورەت و نەدایکیشت.. هەر قەشە ئیجازەی ئەوەی هەیە. باوکتیان لەگەڵ پێتی مارۆك و عەرەبێکی تر برد کە ناوەکەیم لەبیرنەماوە. زۆر لە عەرەبەکان بەگیۆتین سزا دران. با چیتر باسی نەکەین... ئێستا ئیتر دەزانی شتەکە چۆناوچۆن بوو...

**کریستیان:** بۆ دایە گیان، با باسی بکەین، بە لەسەرەخۆیی باسی بکەین. باسی هەموو شتێك، تەنانەت ئەو شتە سامناکانە. دەبێ باسیان بکرێ، ژان پێیخۆشە، من و تۆیش... دەبێ باسیان بکرێ، هەمیشە. هەتا ئەو ڕۆژەی ئەو ئامازەمان بۆ بکا کە ئیتر باسی نەکەین. دەبێ وردە وردەو بە ئارامی خوو بە دەردەکانمان بگرین.

**دایەگەورە:** تۆ ڕاست دەکەی. منیش وا هەستدەکەم پشووم هاتۆتەوە بەرخۆم. شەو دێ، پاشان سپێدەی بەیانیش.

**کریستیان:** دەزانی دایە، هەست دەکەم باوکم لێرەیە، نیزیك ئێمە. دڵی لێرەیە. هەناسە دەدا، لێرە... (هەردووك، بێ جووڵە، گوێ هەڵدەخەن). ئەو دەمەی کە قاقەزە ڕۆژنامەکانت پێدام، هاتە ژوورێ. پێم وابوو ئەویش لە بسان شانمەوە نووسراوەکان دەخوێنێتەوە. فرمێسکەکانی دەسڕی، بۆ ئەوەی بتوانم بیانخوێنمەوە، بۆ ئەوەی کچەکەی بە ڕاستیی و هەقیقەت بزانێ.

**دایەگەورە:** ئەرێ، منیش هەست بە بوونی دەکەم... زۆربەی شەوان دێ سەرێکم لێهەڵدێنێ.

**کریستیان:** قسەشت لەگەڵ دەکا؟

**دایەگەورە:** بەڵێ، یان دەنا کەسێکی تر دەنێرێ، خووم پێگرتووە. هەموو هەینیان، بەیانی زوو چاوەڕێی دەبم. جاری وایە نایا. دەڵێم ڕەنگە "ژان"ی من ماندوو بێ. ئەو دەمەیە کەسێکی تر لەبری خۆی دەنێرێ.

**کریستیان:** کەسێکی تر؟

**دایە گەورە:** بەڵێ، بۆ نموونە باوکم. زۆربەی شەوان. ئەم زستانە زۆر هات. من لە خەو هەڵدەستام و سیمای باوکم لەوبەرەوە دەدی. چاوی لێدەکردم. دەموچاوی هەروا نەرم و ناسك بوو. ریشی پاك پاك دەتاشی. ئەوجار دەمزانی قسەیەکی لەدڵدایە و دەیەوێ بیدرکێنێ. تا بەرەبەیان گێژو وڕ لە نێو جێگاکەم دا دەمامەوە: "باوە، چیت پێخۆشە بەمنی بڵێ"... بەلام هیچ حاڵی نەدەبووم. ئەم زستانە لەدڵی خۆمدا گوتم: "ئێستا من پیرو کەلەولام، ژیان لەبەرم هەڵدێ، باوکم بانگم دەکا، بە بزەی سەر لێوی پێم دەڵێ وەرە... دایکیشم دەبینم... ژانیش، ژانی زیکەلانەی خۆم و ئەو هانرییەی کە زۆر زوو لەگەڵ ژان یەکی گرتەوە".

**کریستیان:** من هەینیان زۆرجار زۆر زوو خەبەرم دەبێتەوە، زۆر زوو... ئیتر خەو لە چاوم دەزڕێ، لە ماڵ دەردەکەوم و بۆ تماشای سپێدەی بەرەبەیان. هەر بۆیە بەیانیانی پاریسم خۆشدەوێ. بەهاران سواری دووچەرخە دەبم و دەچم بۆ تماشای رووباری "سێن" و چزیرگەی ستین لویی و باخی لۆکزامبۆرگ. بەرەبەیان، کاتێك پاڵ بە پەرژینی پردەکەوە دەدەم و چاو لە شەپۆلی بەخوڕەمی ئاوەکە دەبڕم، هەمیشە بیر لە باوکم و سەردەمی منالیم و بەرەبەیانی ئەلجزایرو ئەم ژوورە کە هەمووکات رووناکە دەکەمەوە. بیر لە تۆ کە لەپای وەجاغ گازەکەت دانیشتووی، لە بۆن و بەرامەی هێشووە زەردەکانی میموزاکانی سەر لق و پۆپی درەختەکان دەکەمەوە...

**دایەگەورە:** بەیانییەکی رۆژی هەینی باوکتیان بردە بەردەم گیۆتین. هەموو هەینیان دێتە پەنا قەرەوێڵەکەم و دەمدوێنێ. من زۆر خۆشحاڵ دەبم. باسی هەموو شتێکم بۆ دەکا: سەردەمی منالییەکەی، کاروباری، ئاشنایەتیی لەگەڵ مێلێن، لە دایکبوونی تۆ... بەیانیان زوو، وەك بڵێی رۆحی شەوەو لە رۆژ دەترسێ دەیەوێ بگەڕێتەوە، ئەو کاتەیە هەست بە بەدبەختیی خۆم دەکەم. "ژان، رۆڵە گیان مەڕۆ، هێشتا رۆژ نەبۆتەوە، هێشتا کەڵەشێر نەیخوێندووە، ژان، تکات لێدەکەم بمێنەوە. باشە چ بووە، دیسان شەڕت کردووە، سەروچاوت خوێناوییە، کێ لێیداوی؟ زۆرت خوێن لەبەر دەڕوا! ژان، ئاگات لەخۆ بێ! رەنگت سپی سپی هەلگەڕاوە! ئاگات لەخۆ بێ، سەرت نەشکێنن".
(کریستیان لێی نیزیك دەبێتەوەو لە ئامێزی دەگرێ).

**کریستیان:** ئارام بگرە دایەگیان، ئەوەتا من لە لاتم. ژانیش لێرەیە، لای ئێمە، دڵی بۆ ئێمە ترپەی دێ. ژان یارمەتیمان دەدا بۆ ئەوەی قسەبکەین. ژان چیتر لە سپێدەی بەیان ناترسێ... ئازایە دایەگیان، تۆ دەبێ وەلامی پرسیارەکانی من بدەیتەوە...
(دایەگەورە خۆی لە باوەشی دێنێتە دەرێ).

**دایەگەورە:** نا، نا. دەمەوێ لە بیرخۆمی بەرمەوە، بێدەنگ بە، تۆ جەزرەبەم دەدەی. تۆ بۆ ئەوە هاتووی جەزرەبەم بدەی.

**کریستیان:** ئەی تۆ چی؟ پێت وایە هەر ئەوەندەی هەقیقەتی شتەکەت لێشاردوومەتەوە جەزرەبەت نەداوم. واتان لێکردم هەزار هەقایەتی سامناك بۆ خۆم بگێڕمەوە. بۆ ئەوەی لە شتەکە حالی بم. شەوانە بە دەم هاوارکردنەوە خەبەرم دەبۆوە: "بابە! بابە! بابە تۆچت کردووە؟ ئەوان چ بەلایەکیان بەسەر هێناوی؟" وام هەست دەکرد خەریکە دەخنکێم. ئەوە خەریکە پێ دەنێمە چل سالییەوە. نامەوێ چیتر خەو بەم مۆتەکەیەوە ببینم. چیتر نامەوێ لەبەر ترس و دڵەڕاوکێ بەدەم هاوارو رۆیۆوە لەخەو راپەڕم. دەمەوێ هەقیقەتی شتەکە بزانم، هەقیقەتی راستەقینە! تۆ بەڵێنت داوە هەموو شتێکم پێ بڵێی. ئێستاش دەبێ بەجێی بێنی! (بێدەنگیی) ئەو رۆژەی ئیعدامیان دەکرد دیتت؟

**دایەگەورە:** نا، رۆژێك پێشتری دیتم... تا دوایین ساتیش پێمانوابوو لێی خۆش دەبن. وەکیلەکەی دەیگوت حوکمی دادگای نیزامی زۆر توند بووە، ئەو

بۆمبایەی باوکت لەو کارخانە گازە دوورە شارەی دانابۆوە لەوە نەدەچو کەسی کوشتبێ. ئاخر کەس بەوێدا هاتوچۆی نەدەکرد... ئەو بۆ خۆی حاشای لەو پیلانانە دەکرد کە دەیانگوت لە قاوەخانەو سینەمایەك بەڕێوەیان بردبوو. باشە خۆ بۆمباکە هەر نەتەقابۆوە... نا، هەموو وای بۆ دەچوون لێی خۆش بن. ئەودەم پێیاندەگوت "شەڕی ئەلجزیرە". هەرچەند قەیرانی نێو شاری ئەلجزیرە زۆر پەرەی ئەستاندبوو، هەرچەند توندڕەوەکان دەیانویست مەحکووم بە مەرگەکان دەسبەجێ لەدار درێن... بەلام هیچ نەبێ ئەو پیاوێکی فەرەنسەیی بوو. وەکیلەکەی دەیگوت: "پیاوێکی فەرەنسەیی بەرنە بەردەم گیۆتین؟! شتی وا هەر نابێ. گوتی (سەرۆك کۆمار) لێیخۆشدەبێ. ناهێڵی لە داری دەن. ئەمە جەنایەتە". سەعات شەش و نیوی بەیانی هەینی بوو، لاوێکی عەرەب بە هەلاتن هات و لەزەنگی دەرگای دا. چاوم لێبوو لەگەڵ مێلێن قسەی کردو مێلێن خۆی بە پەرژینی پلیکانەکانەوە گرت. لەوانە بوو لەسەرخۆ بچێ، بەلام هەرچۆنێك بوو دانی بە جەرگیدا هێنا. من خەریك بووم تۆم ساز دەکرد بتنێرم بۆ قوتابخانە. ئەو لاوە عەرەبە وتبووی: "خاتوون، خاتوون، کارەساتە، ئیمڕۆ بەیانی سەعات **5** و **10** دەقە وێنۆتیان بە گیۆتین ئیعدام کرد. دەستاوبەجێ و دوابەدوای ئەو پێتی ماروك و عەبدولقادریشیان لەداردا... خەلك هاواریان دەکرد... ئیمڕۆ بەیانی لەسەرتاسەری "کازێبا" و لە دەرەوەی زیندان، ژنان هەراو هەنگامەیان ساز کرد... بوێر بە خاتوون! ... بوێر بە... بژی ژان وێنۆتی!" و هەلات و ڕۆیی. لە پاریس تەسلیم ببوون! "بۆ عیبرەت" ڕۆژنامەیەك لەسەر دێڕێکدا وتبووی: "بۆ عیبرەت، ونێوتیان کوشت!"... بوو بە شەو. (سەعات پێنج جار زەنگ لێدەدا). سەعات پێنجە... ئیتر پێم وایە ئێستا هەموو شتێك دەزانی... ببوورە، دەچم دەرگای حەوشە کلۆم بدەم. (دەچێتە دەرێ).

**کریستیان:** (لە پشت پیانۆکە دادەنیشێ. لە تاریك و ڕوونی ژوورەکەدا لەبەرخۆیەوە قسە دەکا. ئەو چەپکە تیشکەی لە درزی دەرگا نیوە ئاواڵەکەوە دێتە ژوورێ، هەر بە تەنیا دەپرژێتە سەر دەستەکانی و نیوەی دەموچاوی). باشە بەدوای چیدا هاتووم بۆ ئێرە، کام سەردەمی منالیی؟ تێکەڵ بە بەدبەختی؟ یان بەختەوەری؟ دەبێ بڕۆم. بڕۆم و چیتر بەدوای هیچ دا نەگەڕێم، بگەڕێمەوە بۆ تماشای پردەکە، چاوم بە دوو کوڕە گەورەکەم بکەوێ، خۆم چکۆلە کەمەوەو لە ئامێزیان بگرم و ئەم زەمان و ژیانە لەبیر کەم... ئەم ولاتی شەوەیە لەبیر خۆم بەرمەوە. بەلام نا! دواجار هەر دەبێ هەموو شتێك بزانم، جا با هەرچەند پێویست بێ خەنجێرەکە پتر لە دلم ڕۆکەم. جا با هەرچەند لەبەر ئەم بێ عەدالەتییە سامناکە. لەبەر شەرمەندە بوونم لە حاند بیر و بڕواکانی کاتی لاویم، مەرگ بە ئاوات بخوازم... نا، دەبێ بمێنمەوە، چون ئیمشەو بەختەوەرم، بەختەوەر. دەزانم بە منالی بەختەوەر بووم و بۆن و بەرامەی ئەم ماڵە بۆن و بەرامەی خۆشبەختییەکی گەورەیە، تەنانەت ئەگەر دواییش...

**دایەگەورە:** (چەند میموزای جوانی بەدەستەوەیە. لەسەر مێز دایاندەنێ). جا پێکەوە شێوەکەمان بخۆین. پێکەوە. وەك ئەو نیوەڕۆیانەی دایك و باوکت لەسەر کار بوون و تۆ لە قوتابخانە دەگەڕایتەوە. (لە پشت مێزەکەدا دادەنیشێ).

**دایەگەورە:** سینگت دەوێ، جەرگ چی؟

**کریستیان:** سپاس...

**دایەگەورە:** ملەقۆجە، وەك ئەو دەمانەی چکۆلانە بووی؟

**کریستیان:** نا. نا. نامەوێ... سپاس. (کریستیان وەك بڵێی نەختێك رادەچلەکێ. دایەگەورە دەوری سێهەمیشی لەسەرمێز داناوە. بەبێ ئەوەی کەسێکی تری لێبێ. دەستدەکەن بە خواردن. کریستیان دەس

رادەگرێ. ناتوانێ چنگاڵەکەی لە دەورییەکە نیزیک کاتەوە).

**کریستیان:** ببوورە، بۆم ناخورێ، برسیم نیە... کەمێك ناڕەحەتم.

**دایەگەورە:** چاوت لێیە، ئەوەندەت لە شت کۆڵییەوە. منیش ئیشتیام بۆی ناچێ... بێجگە لەوانە، من و باوەگەورەت و دایکت سوێندمان خواردبوو بۆ هەمیشە میچت بۆ نەگێڕینەوە!

**کریستیان:** باشە بۆ؟ چەندە لاساری. ئەو باوکی منە. من هەقی خۆمە بزانم. لەو هەموو بەدزی دزییەی ئێوە خەریکە دیق دەکەم. ئەو باوکی منە، تێدەگەی، باوکم!

**دایەگەورە:** لێت حاڵیم. کوڕی منیشە.

**کریستیان:** کوڕی تۆ؟ بەڵێ، بەڵام باوك هەموو شتێکە. تۆ باوکت خۆش ویستووە، بەچاوی خۆت دیتووتە، دەستت لە دەستی خستووە، ناسیوتە، لە گیانەڵڵادا بەلایەوە بووی، بەهەموو شتێکی دەزانی، تەنانەت سەبارەت بە ئەو قسەت بۆ کردووین، ئێستا من دەتوانم زۆر شت لە بارەی باوکی تۆ بڵێم... کەچی من باوکی خۆمم نەدیتووە. (بێدەنگی) دڵی چاکت بووە دوای ئەو ڕووداوە لێرە ماویتەوە؟

**دایەگەورە:** جەزرەبەم زۆر دی. هەوەڵەکانەی دەتکوت لەبەرچاوی فەرەنسەییەکان تاعوون لێدراوم. نەژان مابوو، نە مێردەکەم، منی تەنیا مابووم و قورسایی ئەو خەمە و برینی کاریی ئەو کۆستە... دایکتیان ڕێ نەدەدا بۆ کارو دەرا مادی نەبوو. خۆ بەر لەمەش باوکت لە بەندیخانە بوو، دایکت مەجبوور بوو مۆبڵ و یەخچاڵ و نۆشەکەکەی بفرۆشێ پیانۆکەشیان پێچاوە، بەڵام قەت نەگەڕانەوە و هەروا ماوە. نەمزانی بۆ. خوشکی بلیتی فڕۆکەی بۆ هەناردو لەگەڵ تۆ بەچەمەدان و پشیلەکەتەوە گەڕانەوە بۆ فەرەنسە...

**کریستیان:** مێردەکەت چی بەسەرهات.

**دایەگەورە:** زۆر زوو مرد. تەواو تێکچوو بوو. لەو دواییانە پێی دەگوتم: "کلێر، من ئەوە دەڕۆم. تکایە لێم خۆش بە. بەڵێنیم پێبدە دواتر، دواتر کە هەموو شتێك کۆتایی پێهات، لە سەرۆك کۆماری ئەو وڵاتە نوێیە داوا بکەی لانی کەم ناوی یەکێك لەم کۆڵانانەی ئەلجزیرە بەناوی ژانەوە بکەن...

**کریستیان:** بە قسەیان کردی؟

**دایەگەورە:** نا، هیچ کات رازی بەکاری وا نەبوون. بەڵام مەیدانێکیان بەناوی مورریس ئۆدێنەوە کرد، هەر ئەو کەسەی لەژێر ئەشکەنجەدا مردبوو. منیش ناوی ویلاکەم نا: "ویلاژان"

**کریستیان:** باشە، ژان لە کوێ نێژراوە؟

**دایەگەورە:** لە ئەلمەدینە... بچین بۆ وێ، ها؟

**کریستیان:** جەنازەکەیان پێدانەوە؟

**دایەگەورە:** نا، خۆیان لەوێ ناشتیان.

**کریستیان:** باشە... ئەوکاتەی ئیعدامیان کرد چیدەکرد؟

**دایەگەورە:** زۆر شەکەتم. چیترم قسە پێناکرێ. هانێ بۆخۆت بیخوێنەوە... (کریستیان لە تاریك و ڕوونی ژوورەکەدا ڕۆژنامەکە دەخوێنێتەوە).

**کریستیان:** دوشەممۆ، ***11***ی فوریەی ***1957***، ئەلجزیرە: نیزیك سەعات چواری بەرەبەیانییە. وەکیلی ژان بەرەو بەندیخانە دەبەن. لە حەوشەی بەندیخانە، گیۆتین دانراوە. بڵێی ژان وێنیۆتی و هاوڕێکانی هاڕەهاڕی ئەو ماشێنانەی بەرەو بەندیخانە دێن، ببیسن؟ بڵێی زرم و کوتی دەرگاکانی زیندانی باربروس ببیسن؟ ئەی ئەو هەراهەراو زەنازەنا کپەی نێو حەوشە؟ سرتە سرتی ئەوانەی بە گوێی یەکدا دەچرپێنن؟ ڕەنگبێ بیبیسن. شەوانە دەنگ باشتر دەبیسرێ. سەرەڕای ئەوە بەشی زیندانیە مەحکووم بەمەرگەکان ڕێکەو شەقامە. لەوێوە هەراو هەمهەمەی دەرێ باشتر لە بەشەکانی تر دەبیسرێ. ڕەنگە زانیبێتیان چ باسە. ئەوان هەواڵی ئەوەیان هەیە چەند کەسێ لە کۆنسانتین و ئوران لەدار دراون. ژان

وێنۆتی دەزانێ وەکیلەکانی چاویان بە سەرۆك کۆمار کەوتووەو بەم زووانە بڕیارێك دەدرێ. بڵێی ئەم هەراو هاوارە هەمووی هەر لەبەر ئەو بێ؟ ئەوکاتەی یاساوڵ لەناکاو خۆیان بە بەندی ژمارە 22دا دەکەن ئەو خەوتبێ؟ بڵێی بە سێ چوار کەس شاڵای بۆ بەرن و دەست و لاقی ببەستن؟ دوو هاوبەندییەکەشی رەگەڵی دەکەون. لە سەرتاسەری زیندان هاوار بەرز دەبێتەوەو دەگاتە ئەوپەڕی خۆی. ژنان دەستیان لە میلەی پەنجێرەکان توند کردووە هەتا هاواریان بەرزتر بێتەوەو توندتر بزریکێنن. هەموو دەزانن کێ بەرەو گیۆتین دەبەن. "ئەوە ژان وێنۆتییە!"، "ئەوەش پێتی ماروکە!" "ئەمەیان عەلی شفلالایە!" هەرسێك دێنە نێو حەوشە. هەوا زۆر خۆشە. ئەمساڵ بەهار زوو هاتووە. لەم رۆژانەدا بای وادە هەڵیکردووە. ئالبێر سماجا (*Albert Smadja*) بەهاتنیان دەزانێ. یاساوڵ دەستی ژانیان لە پشتەوە گرتووە. چەند وشەیەك لەگەڵ وەکیلەکەی ئاڵ و گۆڕ دەکا. بەگوێی ژول دێکلێر دا دەچرپێنێ. ئەویش داوای لێبوردنی (لەلایەن خواوە) بۆ ئەکا. ئێستا لە بەردەم گیۆتین دا راوەستاوە. دەمامکێك دەموچاوی جەللادی داپۆشیوە. لە پشت ئەو دەمامکەوە سیمایەك شاردراوەتەوە. سیمای فێرنان مسونیە (*F. Meissonnier*). ئەم "کار کوشتەی پیاو کوشتنە" دوارۆژ دەڵێ: "ئەمەیان تاوانبار بە مەرگێکی نموونە بوو. سەر بەرزو ئازاو بێ غەل غەش تا بەردەمی مەرگ". دەستەکانی لە پشتەوە پێکەوە توند شەتەك دەدەن. شارل لێنە (*Charles Lainne*) بە چۆك دادێ و دەپاڕێتەوە. ئالبێر سماجا رووی وەردەگێڕی و دەگری. سەعات 5 و 10 دەقە ژیای کوڕە بچکۆلانەکەی جارانی گەڕەکی کلوسالامبیە کۆتایی پێدێ. سەعات 5 و 12 دەقە محەمەد لاخنیش مەنشوور بە "عەلی شفلالا" دەچێتە پێشێ و سەعات 5 و 13 دەقەش محەمەد ئەنوەری ناسراو بە "پێتی ماروك"... پاش ماوەیەکی کورت ماشێنێك لە زیندانی باربارۆس دێتەدەرێ. سێ قاقەزی راگەیاندنی هەواڵی لەسەدار درانیان بەسەر دەرگای بەندیخانەوە دەچەسپێنن. زیندانییەکان ماوەی دوو رۆژ ماندەگرن و هیچ ناخۆن.

(رۆژنامەکە لە دەستی دەکەوێتە خوارێ).

ئاسمان ساماڵ بوو خۆشەویستم،

ئەوی ساڵێ بەهار زۆر زوو گەیشتبووە لامان،

بای وادە هەڵیکردبوو.

میموزاکان وەك پۆلێك زەرنەقووتەی شێت و شێواو لەسەر لقی دارو درەخت نیشتبوونەوە،

زەرنەقووتە ترساوەکان.

ئاسمان ساماڵ بوو خۆشەویستم

(بێدەنگیی. لەتە رۆژنامەکانی تر چاو لێدەکا).

کەس هەبوو پشتیوانت بێ؟

**دایەگەورە:** کەس؟؟ با، بۆچی. رۆژێك پیاوێك هات و پێی وتم: "خاتوو وێنۆتی، شانازی بە کوڕەکەتانەوە بکەن، شانازی بەخۆتانەوە بکەن، خاتوو وێنۆتی". پێم سەیر بوو. زانی لە مەبەستی نەگەیشتم، هاتە پێشترو وتی: "خاتوو وێنۆتی، من لەبەرەی شەڕی هیندوچین بووم، ئەم شەڕەش تەواو دەبێ، جا دەیبینی. ئێمەش دەڕۆین... ئێمە لێرە لەماڵی خۆمان دانین". من وەڵامم داوە: "نانا، ئێرە ماڵی منە..." هیچ کات ئەو پیاوەم لەبیر نەکردووە. بریا بمدیتبایەتەوەو بۆ ئەو قسەیەی سپاسم کردبا...

کریسیان: لەبیرت نەکردووە؟ دیسان دیتەیە؟

**دایەگەورە:** بەڵێ ، نا. (دەموچاوی سوور هەڵدەگەڕێ... پاشان بزەیەکی دێتێ).

**کریستیان:** تەمەنت چەند دەبوو؟

**دایەگەورە:** پێم دەنایە نێو 57 ساڵییەوە.

**کریستیان:** رەنگبێ ئەو دەمیش هەر ژنێکی زۆر جوان بووی.

**دایەگەورە:** بەڵێ. چۆنت پێبڵێم. لە شەقام و کۆڵانان هەستم بەمە دەکرد. تەنانەت بەچاوی گەنج و لاوەکاندا دەمزانی.

**کریستیان:** (بە تەوسێکی تێکەڵ بە گاڵتەوە).
دڵنیام ئەم قسەش هەر ئەو پێی وتووی.

**دایەگەورە:** بەڵێ.

**کریستیان:** تەنانەت پێشی وتووی ژیانت سەرلەنوێ دامەزرێنەوە.

**دایەگەورە:** (دوودڵە). بەڵێ... بەلام مەخابن، ئەوکات زۆر تێکچوو بووم... دەبوایە بە قسەم کردبا... راستیت دەوێ، دڵم گرتبووی، پیاوێکی لەبەردڵان بوو... باشە تۆ ئەمانە لە کوێ دەزانی؟

**کریستیان:** کاتێك باست دەکرد، بە دەنگت دا دیار بوو... ئەم پیاوە هەقی بەدەس بووە. ئێستا، کە دەزانم، سبەی چیتر شەرمەندەی باوکم نابم. هیچ کات.

**دایەگەورە:** بە راستی هەقی خۆتە کچم!

**کریستیان:** شەرمەزارییان فێری من کردبوو، هەروەك ئەم وڵاتی فەرەنسەیە کە لەو شەڕە چەپەڵانەی شەرمەزارەو متەقی لێنابا. کە منداڵ بووم، هەموو شتێکیان لێدەشاردمەوەو لەم و لەو قسەم دەبیستەوە. هاوسێیەکمان هەبوو، رۆژێك هاتە لام و وتی: "تۆ دەبێ کچێکی ئاقڵ بی، دەبێ کارێکی وا بکەی خوا لە باوکت خۆش بێ". من لە قسەکانی نەدەگەیشتم، بەلام باوەڕم پێدێنا. هەوڵم ئەدا وابم و لە دڵی خۆمدا دەمگوت: "دەبێ کارێکی وا بکەم خوا لە باوکم خۆش بێ". وەك دەڵێن سەرتۆپی منالان بووم.. بەلام نا، منالێکی تاوانبار بووم. بێ ئەوەی بزانم بۆ، بەڵێ، بۆ، بۆ، خوایە گیان؟ بەخاتری باوکم؟ ئێستاکە بەهەموو شتێك دەزانم. دەزانم دایە گیان، هەر وا کە تۆ دەتزانی باوکم هەقی بووە. ئای دایەگیان، بۆچی لێت دەشاردمەوە؟ جاری وابوو رقم لە باوکم هەڵدەستاو شەرمم لەخۆم دەکرد.

**دایەگەورە:** منیش رقم لە ژان بوو کچم، هێشتاش لەخۆم شەرمەزارم کە قینم لە کوڕی خۆم بووە.

**کریستیان:** " تۆ؟ تۆ، نا! شتی وا هەر نابێ!

**دایەگەورە:** (بەرەو قەرەوێڵەکە دەچێ، دەڵێی لەگەڵ ئەو جل و بەرگەی لەسەر قەرەوێڵەکە کەوتوون قسە دەکا؟. شتومەکی دەورویەری قەرەویلەکە هەڵدەگرێتەوە: خاولی، لەگەن...) بەڵێ... رۆژێکی بەهار بوو، لە کەنار زەریا پیاسەم ئەکرد. هەوا زۆر خۆش بوو. دە ساڵ بەسەر ئەو کارەساتەدا تێپەڕیبوو. لەپڕ هەستم بە بەختەوەری کرد، بەختەوەر وەك جاری جاران، پاشان ئاوڕێکم داوە. کەس دیارنەبوو. ئینجا هاوارم کرد: " کوڕەکەم منی کوشت!" هاوارم کرد: "ژان، من تۆم هێنایە ئەم دنیایەوە، تۆش کۆشکی ژیانی منت تەخت و خاپوور کرد، باوکت لە خەمان دیقی کرد: منیش ئەوە دە ساڵی رەبەقە هەر بە لەش زیندووم! هەزار جار مەرگی خۆم بەچاو دیتووە! ژان، رقم لێتە. چیتر نامەوێ بیتبینم، تۆ مێردی من، ژیانی منت کوشت! نەوەی من، بووکی منت کوشت!" جاری وایە کە دێینەوە سەرخۆ، چاولێدەکەین دەبینین ئەو شتەی پێمانوابوو داهاتووە رابردوو لە قەڵەم دەدرێ. تەواو بووە، لاوێتی مردووە. باوکی تۆ لاوێتی منی کوشت!

**کریستیان:** باشە هەر چۆنێك بێ ئەو کوڕی تۆیە!

**دایەگەورە:** ئەوە گرینگ نیە. من ئەوم بە تاوانبار دەزانی، بەلام ئەو شەوانە دەهات بۆ لام، لە کۆڵم نەدەبۆوە: "دایە، دایە، قینت لە من نەبێ، جێم مەهێڵە، دەزانم چەندەم جەزرەبە داوی، بەلام دایە، نەمدەویست ئازارت دەم، خۆ دەزانی من چ ەندەم نەفرەت لەم بێ عەدالەتی و نا بەرابەرییە وا ئەم نیشتمانەی بۆگەن کردووە، لەم رەگەز پەرستییە کە باڵی بەسەر هەموو شتێکدا گرتبوو... دایەگیان، دایە، من هێشتاش رۆڵەی تۆم دایە. دیسانیش بانگم کە بچین پێکەوە لەژێر درەختەکان پیاسە بکەین، لەگەڵ هێلێن و کریستیان و باوکم و پشیلە رەشە بچکۆلانەکەمان. بچین بۆ کەناری زەریا". بەلام بەختەوەریی من، تاسەی ژیانی من مرد، هەر ئەو

شەوە، ئەو بەرەبەیانی ***11ی*** فوریەی ***1957*** تە، ئەوکاتەی ترس و سامیان لە رۆحی کوڕی من خزاند. ئاخ! ژانی خۆم، کوڕم، باوکم، برام، بزەی منالانەم! لەگەڵ ئەو دووچاوە گەشەت، ئاخ! لەگەڵ ئەو سیما ساکارەت، ئەو چاوانەت، ئەو کاکۆڵانەت چییان کرد!

**کریستیان:** دایک قەت ناتوانێ حاشا لە رۆڵەی خۆی بکا، تەنانەت ئەگەر... (دایەگەورە وەک بڵێی شەقەزللەیەکیان لێدابێ راست دەبێتەوە).

**دایەگەورە:** تەنانەت ئەگەرچی؟ بۆچی؟ بۆچی، دایک، باوک دەتوانێ، دەبێ واش بکا. دایک دەبێ حاشا لە رۆڵەی بکا، ئەوە بزانێ جەنایەتکارێک لەزگی دەرپەڕیوە و ژیانی تەفرو تونا کردووە، و لەبیری کا!

**کریستیان:** باوکم هەرگیز جەنایەتکار نەبووە! (دایەگەورە دەڵێی هاوار دەکا).

**دایەگەورە:** من چووزانم؟ من چووزانم؟

**کریستیان:** تۆ شێتی شێت!

**دایەگەورە:** ئای رۆڵەکەم! بمبوورە! چەندەم خۆش دەویستی. فۆکلەکانی...

**کریستیان:** بەلام تۆ باش دەزانی هەق بە باوکم بوو لەو مەردە ئازاو بەجەرگانە، لەو مرۆڤە دەگمەنانە بوو کە دەیزانی مێژوو چەند سست و هێور رێ دەپێوێ، لەو "پێ رەش"ە هەڵکەوتانەی ئێرە بوو کە بیری لە برایەتی دەکردەوە..

**دایەگەورە:** بڕوای تۆ ئەوەیە کچم؟ بڕوای تۆ ئەوەیە، بەراستی دڵنیای وایە؟

**کریستیان:** (دایە گەورەی لە ئامێز دەگرێ) بەهەموو شتێک دا دیار بوو هەق بەو بوو، بە هەموو شتێک، چاوێک بە دەوروبەرت دا بگێڕە، دایە بچکۆللانەکەی خۆم! بێژە تۆ دایکە بچکۆلانەکەی خۆمی، تۆزێک باوکمی، تۆزێکیش دایکم... سوێندت بۆ دەخۆم هەق بەو بوو. کوڕەکەت هەقی بوو، دایەگیان... من ئێستاکە سەر بڵیندو خۆشحاڵم. بیهێنە بەرچاوت، ئەگەر باوکم دەستی هاوکاری ئەوانی گووشیبا، بیهێنە بەرچاوت، رۆژێک کچەکەی یان کوڕەکەی دەیانزانی کە باوکیان خاین و خۆفرۆش بووە، هاوسێ جوولەکەکەی بەگرتن دەدا، یان لە ئەلجزایر، ئافریقاو ئاسیا ئەشکەنجەدەر بووە، لە پشتەوەو گوللەی بەخەڵکی بێ پشت و پەناوە دەنا... هەموو جارێ لە قوتابخانە لێیان دەپرسیم: "باوکت چیە؟" زمانم دەبەستراو رام دەکرد. بەلام ئێستا هاوار دەکەم: "باوکم بەگیۆتین ئیعدام کرا! ئەو تاقە ئەورووپاییەکی ئەلجزایر بوو کە لە رێگای خەبات بۆ سەربەخۆیی گەردنی کەوتە ژێر تیغی گیۆتین! بەڵێ تەنیا بۆ عیبرەت!..." (قاقەزەکان بە تەواوی ژوورەکەدا بڵاودەکاتەوە). ئای! بەلام نا، بێدەنگ دەبم و هێواش بە خۆم دەڵێم: "باوکی تۆ چی، دابێژە لە ژیانیدا چیکردووە؟ باوکی تۆ بە ئەندازەی باوکی من چاکەی کردووە، تۆ دەزانی باوکت کێیە؟ بڕۆ بزانم..." هەر ئەمەو ئیتر هیچ دواجار شارەکەمان گۆڕی. رۆژێک دایکم دەستی گرتین و لەو شارە رۆیشتین. وامان دەزانی لە چنگ شەیتان هەڵدێین.

**دایەگەورە:** دایکت پێشتر پێی وتبووم.

**کریستیان:** چیتر تاقەتی نەمابوو. تەواو تێکچووبوو. زۆربەی شەوان لەدڵی خۆمدا دەمگوت: "بابە، بابە، بۆ مردی؟ بۆ لێرە دەڕۆین؟ بۆ دایەگەورەو بابەگەورە جێدەهێڵین؟" باشە باشە بابەش دێتەوە لەگەڵمان بێ؟ دایکم بزەی د،خستە سەرلێو، کەچی خەمبار بوو، هەر لەو بەیانییەوە کە ئەو پیاوە عەرەبە هات و لە زەنگی دا، دایکم زۆر خەمبار بوو. ئەو پیاوە وتبووی: "تازە وای لێهات". و هەلاتبوو. "ئەو کارەیان کرد. لەکەس ناترسێن. ماڵئاوا". من دەمزانی.

**دایەگەورە:** ئای لە منالان، هەمیشە گوێ قوتن. ئەوە لای خۆی دوورم خستوویەوە گوێت لە هیچ نەبێ. تۆ نەدەبوو بتزانیبا! نەدەبوو!

**کریستیان:** باوەڕت بێ، منیش لێی بێزار بووم، ساڵەهای ساڵ... کە ئەو کچۆڵانەم دەدی لەگەڵ باوکیان خۆشحاڵو بەختەوەر دەژیان، لێی بێزار دەبووم باشە بۆ منی جێهێشتووە... ڕۆژێك وێنەکەیم لەسەر ڕەفەکە هەلگرت و دڕاندم... دایکم لەخۆی دەپرسی ئەو وێنەیەی بڵێی چی لێهاتبێ... چاولێکە، ئەوەتانێ. (لەتەکانی وێنەکە لە کیفەکەی دەردێنێ). چەسپت هەیە؟ (لەتەکانی پێکەوە دەچەسپێنێتەوە). منیش حاشام لێکردبوو.

**دایەگەورە:** نا، تۆ نا!

**کریستیان:** بۆ، منیش وەك تۆ، شەوانە هاوارم دەکرد: "دایەگیان، دایەگیان، باوکم ئازار دەدەن. دایەگیان لە باوکم دەدەن". دایکم دەیلاواندمەوە، دەیبردمە پەنای خۆی دەیخەواندم. وای دەزانی خەوم لێدەکەوێ. بەڵام من گوێم لێدەبوو رووی لە من وەردەگێڕاو تێرتێر دەگریا. ئێمە هەموومان شەوانە خەو لە چاومان دەزڕا. تۆش خەوت لێنەدەکەوت؟

**دایەگەورە:** من، نا... بەتایبەت دوای ئەو خەونە سەیرەی لە سێ ساڵ لەوە پێشەوە بەردەوام دەیبینم... لە خەونم دا ژان سەری پێوە نیەو لەنێو دارستانێك و لەسەر بەرزاییەك کە رووی لە ئۆقیانووس بوو پیاسەی دەکرد. سەری هەڵدەگرن، دەیبەن دەیخەنە ناو قرتاڵەیەکەوە. لەشی بەرەو من وەردەسووڕێنێ و دەستەکانی بەرەو رووم درێژ دەکا. ڕاست وەك بڵێی بانگم دەکا و یارمەتیم لێدەخوازێ. دواجار بەبێ سەر لەسەر بەرزاییەك و رووەو ئۆقیانووس دەڕواو تێدەکەوێ. (سێبەری گەورەی باڵندەیەك دەڵێی لە قەرەوێڵەکە دێتەدەرێ و بە هێمنی لە ژوورەکەدا باڵ لێکدەداو پاشان ون دەبێ).

**کریستیان:** ئەمە خەون نیە دایە، ئەوە ژان بوو تۆی بانگ دەکرد. دەیویست تۆ گوێی بۆ شل کەی و نەهێڵی سەری لێبدرن. ژان نەیدەتوانی بەبێ سەر لەو سێڵاوە ڕزگاری بێ... منیش خەونم پێوە دیتووە، زۆر جار. لای نیوەڕۆ، هەتاوی بەتین لە بان ئۆقیانووس بوو. کۆمەڵێك مردووی زۆر ڕەنگ پەڕیو چاوەڕوانی پاپۆڕێك بوون کە لە ئاسۆوە دەهات. پاپۆڕەکە هەموو کەسێکی سوار دەکرد باوکم نەبێ کە دەبوایە بەتاقی تەنێ و سەرلێشێواو لە کەنار دەریا بمایەتەوە. لە بان سەرو لەپەڕ پەڕۆچکەی ئاسمان پاپۆڕەکە بەرەو خۆر دەڕۆیشت و مردووەکان گۆرانیان دەچڕی. کاتێك خۆر لە نێوەراستی ئاسماندا بوو، بۆ لەناکاو هەژدیهایەك لەنێو دڵی هەورەکانەوە نەهاتە دەرێ و پەنجەی لە پاپۆڕەکە گیر نەکرد. لەو کاتەدا پشیلەیەکەی ڕەشیش لە هەورەکان هاتەدەرێ تیغێکی بەرزو بڵیندو بە باق و بریقی بەچنگەوە بوو. ماوەیەکی زۆر بەگژ ئەژدیهادا هات و دواجار توانی بیکوژێ. بەمجۆرە پاپۆڕی مردووەکان توانی ئەمن و ئەمان ڕێگای خۆی بەرەو خۆر درێژە پێبدا. هەموو نیوەڕوان هەر وابوو. باوکی من لە کەنار دەریا دەمساوەو وەك منداڵ دادەنیشت و سەری لەسەر ئەژنۆی دادەنا. بەڵام ئێستاکە دەزانم سواری پاپۆڕی مردووەکان دەبێ و دەڕوا دایەگیان، دواجار دەڕوا... بێجگە لەمە، ئەو ئیتر لێرە نیە، هەر لە ئێستاوە ئێرەی جێهێشتووە. بوو بە شەو دایە. (پەنجێرەکە دەکاتەوە. مانگەشەو ژوورەکە ڕوون دەکاتەوە).

**دایەگەورە:** شەو، شەو... (لە سووچێك، لەنێو چوارگۆشەیەك کە بە تیشکی مانگ پێکهاتووە دادەنیشن).

**کریستیان:** ئاخ دایەگیان! وا هەست دەکەم بۆ یەکەمین جار، مردووی ئێمە، ژان، حەساوەتەوە، دوا ئاکام هەڵدەستێ و دەتوانێ ڕێگا بگرێتەبەر.

**دایەگەورە:** منیش، کچم، ڕەنگە ئەوە یەکەمین جارە پاش سی و دوو ساڵ، هەست بە ئاسوودەیی دەکەم.

**کریستیان:** منیش هەروام، دایەگیان. دڵی منیش ئاخری ئارامی گرت. باوکم دێتە بەرچاو کە لە کەنار

زەریا پیاسە دەکاو ئەمجار سەری لەنێو دەستی دایە... (لێك نیزیك دەبنەوە).

**کریستیان:** ئێستا ئیتر شەوە. ئیتر ئەو لێرەیە دایەگیان، بەرەو لای ئێمە دێ. مردووی ئێمە چەند رەنگ پەڕیوە، پێدەکەنێ. دایە، باوکم بەرەو لای ئێمە دێ.

**دایەگەورە:** (جل و بەرگی مردووەکە، کە لەسەر قەرەوێڵەکە کەوتوون، قەد دەکاو پێڵاوەکانی هەڵدەگرێ). کوڕەکەم دێ بۆلای ئێمە کچم. سەری لە باوەشی دایە، بەو فوکلە جوانەی کە دەڵێی لە قیلت هەڵکێشاون. پێدەکەنێ. ئەرێ، مردووی ئێمە بە دەممانەوە پێدەکەنێ. کارێکی باشمان کرد بە درێژایی شەو ئاگامان لە مردووەکەمان بووە، (بێدەنگیی. مەلافە تۆرییەکە بە سینگی خۆیەوە دەکوشێ).

**کریستیان:** جا ئێستا، خوشکی من، چاك خەومان لێدەکەوێ. دەزانم دواجار...

**دایەگەورە:** سبەی دەچین بۆ قەبرانی ئەلمەدینە. پاشان سەرێك لە کەنار دەریا هەڵدێنین، خوشکم.

**کریستیان:** فڕووجەکە سووردەکەینەوەو هێشووە میموزاکان دەخۆین، هەر ئەو پۆلە زەڕنەقووتانەی سەر لق و پۆپی درەختەکانی ئەلجزایر تماشا دەکەین. منیش دەڕۆم... و دەگەڕێمەوە... لەگەڵ مناڵەکان، لەگەڵ پردەکە... دەگەڕێمەوە.

**دایەگەورە:** سپاس لەوەی کە هاتی. بەڵێن بێ تا ئەوکاتەی دێن زیندوو بم، بەڵێن بێ.

**کریستیان:** جا با ئێستا بنووین خوشکم.

(سەرسەکۆ وردە وردە تاریك دەبێ. لەو تاریکاییەدا ئاوازی لایەلایە دەبیسرێ).

**پەراوێزەکان:**

* *Mimosa: چەشنە درەختێکی ناوچە گەرمەسێرەکانە کە گوڵێکی زەردرەنگ و بۆنخۆش و وەك تۆپ خڕی هەیە. (وەرگێڕی کوردی).*

**سەرچاوە:**

*1-دەقی ئەسڵی ئەم شانۆیە ناونیشانی ژێرەوەی هەیە:*

***C'est une tradution en persan de***
***LES MIMOSAS D'ALGERIE***
***de Richard Demarcy, Acteurs/ Auteurs, -No 96-97/ Nov- Dec 1991, Paris.***

*2-ئەو کتێبەی بۆ ئەم وەرگێڕانە کەڵکی لێ وەرگیراوە:*

*میموزاهای الجزایر، ریشارد دمارسی، ترجمەی ناد علی همدانی، چاپ **1378** انتشارات تجربە*

# فایلی ژمارە



نووسەری چیرۆکنووسی سویدی

## یالمار سۆیدەر بێری -

# یاڵمار سوێدەربێری

# Hjalmar Soderberg

• و. لە سویدییەوە: عەبدوڵڵا قادر دانساز

### لە جیاتی پێشەکی

ماوەیەکی زۆرە، خەونی وەرگێڕانی بەرهەمەکانی یالمار سوێدەربێری بوونە بە گینگڵ لێم و لێم نابنەوە. بەڵام هەڵبژاردنی بەرهەمێك لە بەرهەمەکانی ئەو بوو بە گرفتێکی گەورە لە بەردەممدا، چونکە ئەم نووسەرە بەرهەمی نایابی گەلێك زۆرە. ئیتر لە کۆتاییدا کەوتمە سەر ئەو رایەی کە بەرهەمە پەخشانییە کورتەکانی بکەم بە سەرەتایێك بۆ وەرگێڕانی بەرهەمەکانی؛ وە لێرەشدا گرفتی گەورە هاتە بەردەمم، ئەویش هەر کەسێك بیەوێت یالمار سوێدەربێری بناسێت دەبێت سەرلەبەری "سەرگوزشتۆکەکان"ی (کە کۆمەڵە چیرۆکێکەو بیست کورتە چیرۆکی لەخۆ گرتووە) بخوێنێتەوە، چونکە بەشێوەیەك لە شێوەکان بەیەکەوە بەستراونەتەوە. هەر لەبەر ئەو هۆیەش ناچاربووم کە لەوانەوە دەستپێبکەم، وە هەشت چیرۆکی وەرگێڕدراوی نێو ئەم چیرۆکانە لەوێوە هاتوون، ئەوانیش: ئەو هێلکارییەی کە بە مەرەکەبی چینی کێشراوە، خەو بە جاویدانییەوە، فەرووەکە، سێبەرەکە، پاداشتی خراپە، نەمەباران، کوشتن، سەگێکی بێخاوەن) چیرۆکەکانی کەش: (ماچەکە؛ زەخرەفەی گۆڕستان؛ سیگنی) لەنێو بەرگی پێنجەمی ("نووسینەکانی 1-9" 1-9 Sakrifter بەرهەمە کۆکراوەکانی لە 9 بەرگدا 1977-1978) وەرگێڕدراون. هەر لەبەر ئەوەی کە یالمار سوێدەربێری بە زمانی کوردی نەناسراوە ناچار بووم هـ مندێ وتارو شیکردنەوە لەسەر بەرهەمەکانی وەربگێـ ، وە لە هەڵبژادرنی ئەو بابەتانە تەنها ویستومە شتێکی گشتی لەسەر ئەو نووسەرە وەربگێڕم، دەنا بەرهەمێکی زۆر لەسەر ئەو نووسەرە نووسراوەو شایەنی ئەوەشن وەربگێڕدرێنە سەر زمانی کوردی. وە لە هەر هەمووشیان زیاتر کاتەکە بەشی ئەوە ناکات کاری زیاترم بۆ ئەم رێکەوتە ئەنجام بدایە.

تێبینییەکی گرنگ لەم بەرهەمانەی ئێستا بڵاودەبنەوە دەدەم بە خوێنەران، کە ئەویش ئەوەیە کە

یالمار سوێدەربێری شوێنێکی جوگرافی زۆر تەسك لەنێو شاری ستۆکهۆڵم دا جێگەی ڕووداوەکانی ئەون، وە هەر لەبەر ئەو هۆیەشە کە هەر لە ئێستاوە هەوڵی ئەوە دەدەم کە خوێنەری کورد لەگەڵ نێوی جادەو کۆڵان و شوێنەکانی نێو بەرهەمەکانی رابهێنم و شارەزای بن، چونکە لە بەرهەمەکانی‌دا بەردەوام هەر ئەو جێگایانە دووبارە دەبنەوە. لەگەڵ نێوی ئەم چیرۆکانەدا ساڵی نووسینەوەیان لەنێو دوو کەوانەدا نووسراوەتەوە.

هیوادارم بەم بەرهەمانە توانیبێتم چمکێك لە بەرهەم و ئەدەبی یالمار سوێدەربێریم ناساندبێت بە خوێنەران، وە هیوادارم کە وەرگێرانەکەی من لە تام، ڕیتم، و پایەی ئەو کەڵە نووسەرەی کەم نەکردبێتەوە و حەزی خوێندنەوەی بەرهەمی دیکەی ئەو نووسەرەیان لەلا دروستبکات.

یالمار ئێمیل فرێدریك سوێدەربێری "Hjalmar Emil Fredrik Soderberg" لە 2ی تەموزی ساڵی 1869 لە ستۆکهۆڵم لە دایك بووە. باوك و دایکی؛ ئەندەرش فرێدریك سوێدەربێری "Anders Fredrik Soderberg" رازگر بووە لە شورای مامۆستایان و ئێما براندێر "Emma Brander" یش دایکی بووە.

لە ساڵی 1890 خوێندنی ئامادەیی لە ئوپسالا تەواو کردووە، سوێدەربێری ماوەیەکی کورت لە شارێکی چکۆلانەدا خەریکی رۆژنامەگەری بووە وە پاش ئەوە چەند ساڵێك لە دەزگای باجی سەرسنووری پاشایی کاری کردووە، بەڵام لە ناوەندی ساڵانی 1890دا بەبێ دوو کاری کردن خۆی بە ئەدەبەوە خەریك کرد. جگە لە چەندین رانان لە رۆژنامەو گۆڤارەکاندا، بەسەرهاتی "گومڕایی" "Forvillelser" 1895، بەسەرهاتۆکەکان "Historieter" 1898، لاوێتی مارتین بیرك "Martin Birks ungdom" 1903، "بێگانەکان" "Framlingarna" کۆمەڵە چیرۆك 1903، وە لەگەڵ رۆمانی دکتۆر گلاس "Doktor Glas" 1905. هەروەها ئەو بەشێوەیەکی وەستایانە بەشێکی زۆری بەرهەمەکانی "ئەناتۆلی فرانسیس" "Anatole France's"ی وەرگێراوە، "چیرۆکی هەڵبژاردەو 1897، "شاژنی قاچی قاز" 1899، "سەوسەنە سوورەکە" 1902. ئەم وەرگێرانانە شایەدی ئەوە هەڵدەگرن کە توانای سوێدەربێری وەکو ستیلیستێکی کامڵ دەرکەوتووەو دەشتوانی بڵێیت کە لەو بارەوە نموونەیی بوو.

سەرچاوە: "Project Runeberg".

بەرهەمەکانی سوێدەربێری بەپێی ساڵی دەرچوونیان:

1-"گومڕایی" "Forvillelser" 1895 رۆمان.

2-بەسەرهاتۆکەکان "Historieter" 1898 کۆمەڵە چیرۆك.

3-"لاوێتی مارتین بیرك" "Martin Birks ungdom" 1903 رۆمان.

4-"بێگانەکان" "Framlingarna" 1903 کۆمەڵە چیرۆك.

5-"دکتۆر گلاس" "Doktor Glas" 1905 رۆمان.

6-"یەترووید" "Gertrud" 1906 شانۆنامە.

7-"تاریکی دادێتە سەر ڕێگاکە" "Der morkner ofver vagen" 1907 کۆمەڵە چیرۆك.

8-"لاپەرەی هەڵبژاردە" "Valda sidor" 1903.

9-"نیگەرانی دڵ" "Hjartansoro" 1909 کیتابی هزر.

10-"ڤینۆس" "Aftonstjarna" 1912 شانۆنامە.

11–"یاریە جدیەکە" "Den Allvarsamma leken" 1912 رۆمان. 1913 کۆمەڵە چیرۆک.

12–"ئەژدیها بەهرەمەندەکە" "Dentalagfulla draken" 1913 کۆمەڵە چیرۆک.

13–"کاتی چارەنووس" "Odestimmen" 1922 شانۆنامە.

14–"یەسوس باراباس" "Jesus Barabas" 1929 دراسەیەکی مێژوویی.

15–"گەشت بەرەو ڕۆما" "Martin Birks ungdom" 1929 کۆمەڵە چیرۆک، دراسەیەکی ئایینی مەسیحی.

16"مەسایەی گۆڕان پێکراوە" "Den forvandlade Messias" 1932.

17–"دوا کیتاب" "Sista boken" 1942 دوا بەرهەمەکانی.

18–"دەسەلات، پیری و ژن" "Makten, visheten och Kvinnan" 1946 پاشماوەی بەرهەمەکانی کە لە دوای مەرگیدا لەلایەن "هێربێرت فریدلێندەر" "Herbert Friedlander"ەوە بڵاوکراوەتەوە.

19–"بەرهەمی کۆکراوە 1–10 Samlade verk" بەرهەمە کۆکراوەکانی لە 10 بەرگدا 1943.

20–"نووسینەکانی 1–9" "Sakrifer 1-9" بەرهەمە کۆکراوەکانی لە 9 بەرگدا 1977–1978.

## پێشەکی[1]

**نووسینی: پێرفێستبیزی[2]**

چوار رۆمان، پێنج کۆمەڵە چیرۆک، سێ شانۆنامە، کتێبێکی هۆزی، جووتێک کاری مێژووی ئایین و گەلێك بابەتی رۆژنامەگەری نووسیوە. ئەوانە هەر هەموویان لەکاتی بڵاوبوونەوەیاندا سەرنجی هەموانیان بەلای خۆیاندا راکێشاوە، و زۆربەیان هەتاوەکو ئەمڕۆش زیندوون. لەگەڵ ئەوەشدا بەرهەمەکانی ژیانی یەکێك لەو بەرهەمە هەندە بەرفراوانەکان نین، بە ژمارەی لاپەڕە بپێورێن. ئەو هەردەم نووسەرێك بووە خەڵکی بەرهەمەکانیان خوێندوەتەوە.

بەرهەمەکانی کراون بە فیلم، لە شانۆدا نمایش کراون و لەم ساڵانەی دوایشدا سەرلەنوێ وەرگێڕدرانەوە سەر زمانی ئینگلیزی و فەرەنسی. ئەو لە لایەن یانەی کتێبەوە و زنجیرە کتێبی گیرفانەوە چاپ دەکرێت. ژمارەی بەقەرز وەرگرتنی کتێبەکانی لە کتێبخانەدا ساڵانە بەردەوام لە دەوروبەری بیستوپێنج هەزار رادەوەستێ. لە یەکەم دە ساڵی ئەم سەدەیەماندا سوێدەرییێری کە – هاوشان لەگەڵ یالمار بێرگمان[3]– پێشکەوتن لەو بەدەستهێنەرترین کەسانەن کە بەرهەمەکانیان بە زیندوویی ماونەتەوە.

پێش چەند ساڵێك لەمەوبەر لە رادیۆدا زنجیرە بەرنامەیەك دەربارەی ئەو دە رۆمانە عەشقییە گەورانەی لە جیهانی ئەدەبیدا هەیە باسکرا. لە دەنگدانی رادیۆدا رۆمانی "یاریە جدییەکە"[4] دوای "کریستینا لاڤرانس دۆتەر[5] ئانا کارێنینا[6] و "تریستان و ئیسۆلدێ"[7] بە پلەی چوارەم هات. ئەم کتێبە –کە فرێدریك بوێك[8] دەربارەی نووسیبووی کە "ئەمە وەك ئەوە وایە کە ئەو هەموو

چەکمەجەکانی لە گشت پاشەڕۆکێکی کۆن پاککردەوە"- بۆ من هاوشان لەگەڵ "ژووری سوور"[9] و "سەرگوزشتەی یۆستا بێرلین"[10] گەورەترین رۆمانن لەنێو رۆمانە سویدییەکان لە ماوەی ئەو سەد ساڵەی کە "گەوهەرەکانی شاژن"[11] لە "رۆمان دەربارەی ئۆلۆف"[12] جیادەکاتەوە.

لەنێو جیاوازی چێژ لێوەرگرتندا لەوانەیە بەتایبەتی کەسانی لاو -بەلای کەمەوە قوتابییەکان- بەردەوامبن لە خوێندنەوەی یالمار سوێدەربێری. خەڵکێکی زۆر بە سەردەمێکی سوێدەربێریدا تێپەڕدەکەن، ئەو دەبێ بە دەنگدانەوەی ناخیان، وە پلە بە پلە هەم دیسان کاتی گەڕانەوەیە بۆلای ئەو، دووبارە خۆی پێ بناسێنێتەوە لەگەڵ ئەوەشدا شتێکی تازە بدۆزێتەوە.

یالمار سوێدەربێری سویدی نییە، تەنها ستۆکهۆلمییەکە- و ئەوروپی. سوید لە خوارووی "سلوسن"[13] وە لە باکوری "شەقامی ڤالهەلە"[14] جێیەکی بچوك لە نووسینەکانیدا دەگرنەوە. لەجیاتی ئەوانە ئوتێلی "ئەنگلایس"[15] و باڕەکەی "رۆدبێری"[16] چەقن و "کونگس ترێدگۆردن"[17] ناوچەیەکی گوندنشینە کە لەوێدا هەموو شتێك دەکرێت لێی روویدات. شەقام هەم ساڵۆن و هەم ماڵە.

ئەو ستۆکهۆلمەی لەوێدا سوێدەربێری تیایدا دەجوڵێتەوە شارێکی جیهانییەو گووشراوەو بووە بە گوندێك. ماوەی نێوان شتەکان هەندە کەمن، مەیخانەکان زۆرن. پیاو لە پەنجەرەکان و سەر شۆستەکانەوە چاودێری دەکرێت، بەڵام بە ئێواران چراکان لەسەرەخۆ هەڵدێن و "ئەلێ"[18] یەکانی دەوروپشتی کڵێسای "یاکوب"[19] دەبێت بە شەقامی "مالم حیلناد"[20]ی سەردەمی ئێمە. ئەوێ شارێکە لە کەسانی ئاشنا بە ئێمە، گفتوگۆ لەسەر رووداوی رۆژانە، پشکی قەرز دانەوەو نانخواردنی ئێوارانی چینی ئەرستۆکراتی. سوێدەربێری -وەك "گونار ئێکیللوێف"[21] نووسیویەتی -توانایەکی هەیە کە "شارەکە بۆخۆی مۆبێلە بکات. ئەو شارە هەروەك دەبێت بە ئەپارتمانێکی بە رێکوپێك کراوی زگورتییەك، پڕکراوە لە بیرەوەری، پۆرترێت و شتی بە میرات دەستکەوتوو- بەڵام لەهەمان کاتدا چنراو بەتەنهاێتییەکی شەقولەق کراو". چونکە کەسە بەرجەستەکانی شاعیر هەروەك خودی خۆی وان کۆچەرن لە نێوان ژووری بەکرێ گرتوو و ئەپارتمانی کاتیدا، وا هەستدەکرێت کە لە لۆجی ئۆپێراکاندا، لە بەڕێوەبەرایەتی رۆژنامەکاندا یاوەکو "گرۆپن"[22] لە ئوتێلی "گراند"[23]دا بژین. ستۆکهۆڵم هەروەك تایبەتمەندێتییەك تیشك دەخاتە سەرهەموو ئەو شتانە.

ئەوە ستۆکهۆلمێکە لەوێدا، لە تێڕوانینی بیرەوەریدا، (زەنگۆڵی ئەسپی تراموایەکان لە سوچی شەقامەکاندا هێشتاکانێ هەروەك مەنجەڵێ لە پێچی رێگایەکدا لە لادێدا دەزرنگێتەوە.. ئەوکاتە هێشتا پیاو دەیتوانی بە هێمنی و خۆشی بە "یورگۆردن"[24]دا بڕوات و پارچە مۆنراوەیەك بداتە دەم یەکەوە بێئەوەی پێویست بەوە بکات لەبەر ئۆتۆمبێلێك خۆی فڕێداتە نێو قوبلگە ئاوێکەوە، ئەوکاتە هەتاوەکو "کاڵ سێدەرستروێم"[25] هێشتاکانێ خەوی دەبینی بەوەی کە لە حەلحەلەی ئاسمان خۆی تێکەڵ بە فریشتەکان بکات.. ئەو کاتانە هێشتاکانێ پیاو بە شەوانی هاوین دەیتوانی بەچکە ژووژوێك لەسەر شۆستەکانی دەرەوەی "لاگەرلوند"[26] بدینێتەوە..)

لەگەڵ ئەوەشدا یالمار سوێدەربێری زۆر بە دەگمەن بە تەمومژی رابردووەوە سەردەمی خۆی دەپێچێتەوە، ئەو بوونەوەرە بێئومێدانە بڕیار

دەدەن، بەلای کەمەوە نەبێت "هیستوریێتەر"[27] ئەو کتێبەی کە لە ناخەوە بەدبەختترین بەرهەمی ئەون و پڕە لە تۆقین لەبەرامبەر مەرجە ناهەموارو چروکەکانی ژیان. لە بان ئەوەشەوە دەگمەنن ئەو نووسەرانەی هەندە زۆر دەربارەی بابەتی کابوس بنووسن؛ ئەوانە دەبن بە ڕووداوێکی ڕاستەقینەی تر کە ئەوە وەك دەردەکەوێ ئەو سوێدەربڕییە عەقلانییە دەکەن بە پێشڕەوی ئەزمونگەرییەکان، هێڵێك لە خەوەکانی ئەوەوە ڕەتدەبێت تا "سەرگوزشتە بەدەکان"[28]ی "پێر لاگەرکڤیست"[29] و لەوێشەوە بەردەوام دەبێت بەنێو گومانکەرانی سالانی چلەکان تا "لاش گویلنستێن"[30] و "ڤیللی شیورکلوند"[31].

لە قاوەخانەی "ئافتۆن شێرنە"[32] -کە لە ڕاستیدا نێوی "بۆلیڤارد" بوو وە کەوتبووە لای "شەقامی کارلا"[33]- دادەنیشتن، لە شانۆنامەکانی سوێدەربڕی، ئەوانەی حیسابیان لەگەڵ داماتوودا کرلووەو ڕێگە بە ویسکی دەدەن جێگەی خەونەکانیان بگرێت. ئەوان لەنێو قەنەفە مەخمەلیە پیاوانەکاندا لە ڕاستی ڕا دەکەن و خۆیان بەرەو دوا دەچەمێننەوە، بەڵام ئەوان بەدەگمەن منجەمنج لە پرسیارەکان دەکەن لەوێدا ئەوان لە دەرەوەی بەرپرسیاری کۆمەڵدان، لە باری کۆمەلایەتی و خێزانداریشدا چۆکیان داداوە لە بەردەم ویستنی ژیانیاندا کەچی هاموشۆی یەکتری دەکەن.

"بوبێرگمان"[34] هاوڕێی قوتابخانەی سوێدەربڕی، جارێکیان فۆتۆی پۆلەکەی خۆی لە "نۆرەلاتین"[35]ی سالی "*1888*"ی نیشاندام و وتی:

(سەیری ئەمانە بکە ئەوەندە خەڵکانی بەدبەخت، خۆکوژی دەکەن، مرۆڤێلێك کە بە تەنهایی لە ئوتێلی شارە بچکۆلەکاندا مردن، پارەکەیان بەشی نەدەکردن. توانای هەڵبژاردنەکانیان کەم بوو. کاسبییەکی زۆر مێشتاکە نەدۆزرابوونەوە. بێگومان خەڵکی لەو سەردەمەدا لێرە لەم وولاتەدا بیانوی زیاتری بەدەستەوە بوو کە ڕەشبینتر بێت لە ئێستا).

کوڕی گەنجی سەردەمی ئۆسکاری لە میواندارییەکانی نانی ئێوارەی چینی بۆرژوازیدا، لەگەڵ کچی خێزانێکی خانەدانی ناسك، لە بارێکی ناهەمواری ئابووریدا کە چاودێری دەکران لەلایەن ئەفسانەی کچێتی و باوکیانەوە. پاش ئەوە دەچوونە دەرەوەو پارەیان دەدا بە کچێك لە کۆمەڵگادا بۆ کارێك کە لەلایەن پاکوتەمیزییەوە بە شتێکی زۆر دەگمەن تەماشا دەکرا، لە کاتێکیشا کچی خێزانە خانەدانەکە لەگەڵ زنجیرە دانستانێکی عاشقانەدا لە ژوورەوە بەند دەکرا. دەربارەی هەلوێستی کات بۆ ژنان "مارتین بیرك"[36] بە ڕستە گەلێك دەدوێ کە هێشتاکەش هەست بەزیتیبیەکی مەزن دەکرێ، لەگەڵ ئەوەشدا واقعی دوای ئەوان گۆڕانی بەسەردا هاتووە.

گەلێك لەسەر سوێدەربڕی بەشێوەیەکی وەها کە کەمێك بۆ شکاندنەوە نووسیوویانە: بەتایبەت سەبارە ت بە بابەتە سنووردارەکانی و کەموکوڕی لە بابەتە داستانییەکانیدا، خوێنە ترنگەکەی و ڕەشبینییە ڕەقەوە بووەکەی. بەڵام لەگەڵ دووبارە خوێندنەوەیدا ئەوا ڕووناکی ئارەزوو و هاوخەمی لێ دەچۆڕێ. ئەوە نەفرەت کردنە بەرامبەر بە ڕستەی بۆش، کەموکوڕی لە خۆبادان، نیگەرانییەکە بەبێ بەزەیی بەخۆدا هاتنەوە.

هەروەها یالمار سوێدەربڕی لە سنور دانانەکانیدا بەتەواوی ڕاستگۆیە، هەرگیز وا خۆی نیشان نەداوە کە کەسێك بێت و ئەو ئەوەی وا دەبینی کە کەمێك ناپیاوانەیە کە بەهەر شێوەیەك بێت کەسێك بدۆزرێتەوە، شیعر داهێنان بۆ شتێك، ئەو خۆی بە پارچە قوماشی ئەفسانەو شتی بێگانە نەدەڕازاندەوە هەروەك لە نەوەدەکاندا (لێرەدا مەبەستی *1890* یە نەوەکو *1990* "وەرگێڕی

کوردی") زۆریان پێ پەسەند بوو. لە کاتێکدا "ئۆسکار لێڤەرتین"[37] بە درێژایی "ئاشیرۆن"[38] گەشتی دەکرد، سوێدەربێری بۆ خۆی لە "ئۆشترویم"[39] دەمێنێتەوە. لەو کاتەدا "هەیدنستام"[40] "هانس ئالینیۆس"[41] دەنێرێتە پێچە بێدەرەکانی[42] نێو فاتیکانەوە، سوێدەربێری رێگە بە "ئارڤید شێرنبلوم"[43] دەدا لە بەڕێوەبەرایەتی رۆژنامەی "سڤێنسکە داگبلادیت"[44] کاربکات. لە کاتێکدا لەلای "سێلما لاگەرلوێف"[45] کاتی ئاهەنگی سەماکردنە لەلایەن "بێری"یەوە، "دکتۆر گلاس"[46] نانی ئێوارە لەسەر پردی "یورگۆردن" دەخوات کەسە ئیدیالەکانی سوێدەربێری دانیمارکی و فەرەنسی بوون: "هێرمان بانگ"[47] و "ج.پزجاکوپسین"[48]، "موپاسان"[49] و "ئاناتۆل فرانس"[50]. شەیپوری درێژ، رۆمانتیکی کەوش و می کەی رەگەزپەرستی سویدی بۆ ئەو بێگانە بوو. ئەو ئایدیانەی لە لاوێتیدا لێی گیربوون بە ئەمەکەوە لەگەڵیاندا مایەوە.

ئێمە دەزانین ئەومان لەکوێدا هەیە. ئەو زۆر بە روونی ئەوەی ووت. وە لەوانەشە ئەوە بۆ ئەو سانا بووبێت بە ژیرییە لۆژیکیانەکەوە. ئەو هەرگیز وای نیشان نەدەدا لە تاریکیدا دەست بەملاو بەولادا بکوتێ بەڵکو بە هەمان کەللەرەقی پەردە لەسەر دووڕوویی لادەدات لەلای خۆی هەروەك لەلای کەسانی دیکە، لەبەرئەوە نووسینەکانی ئەو مرۆڤ جارێك لەلایەن هەستەوە دڵنیاو لە لایەن رۆشنبیرییەوە نیگەران دەکەن.

کاتێك سوێدەربێری لە تەمەنی بیستوچوارساڵیدا تایبەتمەندیەکانی نووسەری نەرویجی "ئارنی گاربۆری"[51] دەستنیشان دەکات، ئەو بە وشە دەیکات کە هەروەکو خۆشی بگرێتەوە:

ئەو لەکاتی خوێندنی گیانی مرۆڤدا بەردەوام بەدوای سەرچاوەی تاقانەو دێریندا بەرەو دواوە دەگەڕایەوە: بەرەو خودی خۆی؛ وە لە دەوڵەمەندی خودی خۆیدا لە دژایەتی کردنەکاندا ئەم ناوەندی میزاجەی بە جوانی پێکهێناوە، کە بەهەمان بەرفراوانی وەکو هاوخەمێك رێگەی پێ دەدا بەردەوام بەشوێن یاری سێبەری سەلیقەی مرۆڤ بکەوێت"

"بوبێرگمان" کە کۆشش دەکات بۆ ئەوەی بە بێلایەنییەوە پۆرترێتی هاوڕێکەی بکات کە خۆی نزیك دەکاتەوە لە رەزیلیکردن لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا دەنووسێ:

"سوێدەربێری سروشتێکی هزرکارو پڕ لە گومانی بێدارە کە لە دژی بە پیرۆزکردنی کۆمەڵ لە هەرچ بابەتێکا ویستبێتی خۆی ئاشکرا کردووە. شەهوانییەکی کەئابەدار بەبێ هیچ لە رادەزیادیەکی خڕۆکەی سووری خوێن. سەرێکی کارامە، گیانێکی پێشتر فۆرم بۆ دانراو لەگەڵ تێڕوانینێکی ئامادەکراو و ئیمکانیاتێکی زۆر کەمی بەرفراوانبووندا"؟.

ئەوە راستە کە ئەو خۆی نوێ نەکردەوە. ئەو هەروەکو خۆی مایەوە، ئەوانەی کە تازەبوونەوە خوێنەرەکانی بوون -ئەوە بە دوای ئەوە، ئەو لە رۆشنبیریدا کەللەرەق بوو کە دەهاتە سەر ئەوەی کە خۆی توندبکات بەوەی کە ئەو بە راستی و راست دەیبینی، ئەو دەیویست -کە هەروەها "بێرگمان" نووسیبووی- شتێك بێت زیاتر لە ویژدانێکی هونەرییەوە بێت، ئەو دەیویست لە هەموو شتێ زیاتر ویژدانێك بێت. ئەو بێزی دەکردەوە لە ناکاملی. تیشکی راستەو راست بەنێو کلێشەکان، نمایشە لێخنەکاندا دەکێشا ئەو هەرگیز نەدەدوا بەبێ ئەوەی شتێکی هەبێت بیڵێت.

لەوکاتەدا دوور نییە لەوە زیاتری پێ بێت ئەگەر رێگای مێتانە رووی پێدرایە. ئەو زۆرجار دووچاری لە نووسین کەوتن و پەژارەیی دەبوو. لە نامەیەکدا باس لە سەردەمانێکی درێژ دەکات کە ئەو بۆ هاوڕێکانی

لە کەڵك کەوتووەو بە زەحمەت وێراوێتی بچێتە ئەودیوی دەرگاکانەوە. ئەو رەخنە لەخۆگرێکی بەهێز بوو. زۆر لەوانەی کە ئەو نووسیبووی رەتیکردنەوەو رێگەی بە "مارتن بیرك"دا بیربکاتەوە: "ئەوەی، کە دەبێت ببێ بە شاعیر، چ شتێك نییە جگە لە جێی گاڵتەجارییەك بۆ خواو مرۆڤەکان، بۆیە پێویستە لە ماوەی ئەو هەموو ساڵە درێژانەی خوێندندا پێش ئەوەی ئەو بناسرێ و بەناوبانگ ببێت، تەختەی نیونیشانێکی درۆزنانەی بەسەر دەرگاکەیەوە هەڵواسێت و وا نیشانبدات کە خەریکی شتێکە کە مرۆڤەکان بەجێی رێزلێنانی دادەنێن".

"نیچە" شاعیرانی تاوانباردەکرد بەوەی کە زۆر درۆ دەکەن: "هەموو ئاوەکانی خۆیان لێخن دەکەن بەڵکو ئاوەکە قووڵ دیار بێت". یالمار سوێدەربێری درۆی نەکرد. ئاوەکەی ئەو روون و ژەهراویی بوو، وە ئێمە بە بێ هیچ بەربەستێك تەماشای ئەو بنە تاریکەی دەکەین. بەلاغەو ئیمانی چڕ بۆ ئەو دانراوە. ئەو دەستکاری داوەری و وشەی نەدەکرد. پەخشانەکانی ئەو لەلایەن ئاوازەوە بێخەوش و ساکارن، و پیاو بە هەمان ئاسانی دەیان ناسێتەوە وەك نیگارێکی "کارل لارشۆن"[62]. ئەو ژمارەیەکی کەم لاساییکەرەوەی هەبوو. بەڵام ئەو بێگانانەی کە دەیانەوێت فێری سویدییەکی باش بن، بە "سەرگوزشتۆکەکانی" و "دکتۆر گلاس"ەوە دەست پێدەکەن. لەوانەیە ئەو، پاش ستریندبێری تاقانە پەخشاننوسی سویدی بێ، چونکە رەنگە تەنها باس و دەربڕینەکانی لە زەیندا بمێننەوە دەنا پیاو تەنها دێڕە شیعرەکانی لەلا دەمێنێتەوە هەروەها راشهاتبوو کە بڵێ کە ئەو هەرگیز هەندە پەلەی نەبووە کە پێویستی بە کورتکراوەی ناشرینی وەك "مێنسکا: مرۆ"[53] و "ئارتۆن: هەژدە[54] بێت.

لە کارەکانی یالمار سوێدەربێری کەسەکان لە کتێبێکەوە بۆ یەکێکی تر دەگەڕێنەوە: "دکتۆر مارکێل"[55] "هێنریك ریسلێر"[56] و "مارتن بیرك" وە ئەوە ئاسانە کە خزمایەتی نێوان "تۆماس ڤێبەر"[57] و "ئارڤید شێرنبلوم" ببینی. بۆیەکە کەم هەست بە ناچاری ئەوە دەکەیت کە لە دڵا شیرینترین کتێب لە نێوان کتێبەکانی ئەودا ناوزەدە بکەیت. "گومڕایی"، نۆبەرەی ساغترین و مۆدێرنترین رۆمانی نەوەدەکانە. "لاوێتی مارتین بیرك"[58]، هەر لە سەرەتاوە بووە بەرهەمێکی کلاسیکیسویدی، وە "مارتین" خۆی بوو بە کەسایەتیەکی سیمبولی وەکو ڤێرسەر"[59]، "ئۆبلۆمۆڤ"[60]، "لیۆپۆلد بلووم"[61].

ئەوە کتێبێکە لە بارەی هەستی بێدەسەڵاتی و رۆشنبینی کە دەیان هەزار خوێنەر خۆیانیان تیادا دەبینیەوە. نێوی گەڕیدەیەکی ماندوویان پێدراوە، هەرگیز وێرانی دڵێرانەو کاریگەرانە لە ئەوان ناخوازێت. داخوازییەکە شتێکی ترە: راستگۆییەکی رۆشنبیرییانەیە، هیچ خۆ هەڵخەڵەتاندنێك، کە هەرگیز خۆت وابەستەی رایەك نەکەیت تەنها لەبەرئەوەی بەگشتی پێی رازین یاوەکو خێری هەیە.

"دکتۆر گلاس" "لە ساڵی **1905**" بە زۆری لە رۆمانەکانیدا ئەو بوو کە گفتوگۆی لەسەر کراو لە جیهانیش زیاتر بڵاوبووەوە. ئەو باس، بەپێی نووسەرەکەی، لە کوشتنی چەوسێنەرێك دەکات، رێگە بەوە دراوە لەبەرئەوە "گریگۆریس"[62]ی قەشە لە پەنای شەو و یاساوە باوەش بە ژنەکەیدا بکات بەدژی ویستی خۆی. قەشەکە تاواندەکات بەرامبەر بە موقەدەساتی خۆشەویستی و بە حەبێکی بچکۆلانە لە دوکانی ئاوفرۆشەکە لە "باخی پاشا" دوایی لە سێدارە بدرێت. "دکتۆر گلاس" "هێلگا گریگۆریوس"[63]ی خۆشدەویست کە ئەویش لەلای خۆیەوە ئاژیرانە ئەو خیانەتکارە "دۆن خوان"[64]ەیە کە "کلاس رێکێ"[65]ی خۆشدەویست.. لەسەر ناوی خۆشەویستی دکتۆر یارمەتی ئەو دەدا بۆ ئەوەی ئەو پیاوەی

دەستکەوێت کە دکتۆر دەزانێ ئەو کابرایە "مێلگا" بەجێدێڵێت. "دکتۆر گلاس" ئەو دەکوژێت چونکە ناتوانێ خۆشەویستەکەی ببینێ ئەشکەنجە دەدرێت. ئەو مەبەستی ئەوەیە کە هەموو شتێ لە کلتووری ئێمەدا کە لەبەر برسێتیو خۆپارێزی ناتوانێ بنووسرێتەوە دەگەڕێتەوە بۆ خۆشەویستی، یاوەکو راستتر خەوبینین بەخۆشەویستیەوە.

نۆڕاندنی خۆشەویستی لە بەرامبەر زوڵمی مرۆڤەکاندا، فێڵ و هەڵخەڵەتاندن -لەوانەیە بابەتی گەورەی یالمار سوێدەربێری بن. گیان رەقدەبێت و لەکەدار دەبێت. شاخەکەی "میدسۆمەر دانس"[66] لەوێدا "دکتۆر گلاس" یەکەمین ماچی خۆشەویستی لە ژیانیا کردووە، ئەوە بەهەشتە نۆڕاندراوەکەیە. ئەوەی دەمێنێتەوە- هەروەك لە "ڤینۆس" -ئەوە پیاوێکی مەتەرە[67] و ژیان هەر هەموویان پاندەکاتەوە. ئەوەی لەلای خودی سوێدەربێری دەمێنێتەوە نائومێدیەکی نیفلیجە، تووڕەبوونێکە لەسەر درۆزنێتی لە هەڵسوکەوتی مرۆڤدا و زەردەخەنەیەکی ماوخەمییە بۆ ئەوانەی کە خەباتیان بۆ بێهودەیی کردووە.

خۆشەویستی لای سوێدەربێری هەم شارەزاییە لە شێوازێکی ئاینیدا کە تاقانە رزگارکەر ئاین و غەریزەیەکی ناچارییە و لە ویست بەهێزترە. ئەمە هەم لایەکی رۆمانتیزمی هەم لایەکی سروشتی هەیە، ئەوان لەنێو یەکتریدا ناتوێنەوە جگە لە تێپەڕینێکی خێرا لە ساتێکی کەمخایەندا. ناسارییەکە لە دوارۆژدا چاوەڕوانی دەکات.

"خۆشەویستی، بەڵێ -ئەرێ ئەوە لە راستیدا چییە؟ ئێرلاند یانسۆن"[68] لە شانۆنامەی "یەرتروید"[69] پرسیار دەکات. "من هەردەم وام هەست بە وشەی (خۆشەویستی) کردووە کە وشەیەکی سەیرو سەمەرەیە. زۆر بێگانە دێتە بەرگوێ. ئەوە وا نایەتە بەرگوێ کە بە راستی سویدی بێت". یالمار سوێدەربێری دژی دووڕوویی ئاکارییانە، عاشقانی دەسەڵاتدارێتی پیاو و نەخۆشانی عەشقی هەیبەتی کۆمەڵ راپەڕین دەکات، و هەروەها لە باسکردنەکانی دەربارەی خۆشەویستیشدا گێڕەوەیەکی مێژوویی سەردەمەکەیەتی. وەکو ستریندبێری ئەویش وا تێدەگات کە هەستەکان بەستراونەتەوە بەو ژینگەیەی کە لەوێدا رووداوەکان روویانداوە، ئێمە لەسەر بەرنامەیەکی زۆر دەژین کە بەردەوام تێکەڵی یەکتری دەبن: سیاسی و تایبەتی، ئێستاتیکایی و ئیرۆتیکی.

خۆشەویستی ژن و کاری پیاو هەر لە سەرەتاوە دوژمنی یەکترین، لەلای "یەرتوید" ئاوەها نێودەبرێت، چونکە لەلای هیچ یەکێك لە سێ پیاودا پێشوازی لە هەستە قووڵەکانی نەکرا؛ ئەو سزای بەتەنهایی بوونی بەسەردا سەپێندراوە. لە هەمان کاتدا تا رادەیەکی تەواو بێ بەزەییانە نەبەستراوەیە بەم پیاوانەوە کە لە پێش هەموو شتێکدا ئەوان بە بۆنەی ئەوەوە هەن و هەرگیز بە سووکی سەیری ناکەن. ئەوان بەربەرەکانی کاری یەکتری نین و بەرەنگاری یەکتر نابنەوە-بەهەمان شێوەی کەمی وەکو "داگمار"[70] و "لیودیا"[71] لە "یارییە جدییەکە". بەڵام "لیودیا". بەهەموو باوەڕ بەخۆ هێنانێکی ئازادی رەوشتیانەیەوە، بێدەسەڵاتە، وە "ئارڤید" لەلایەن ئەوەوە سووکایەتی پێدەکرێت و بریندار دەکرێت. لەوانەیە بۆ تۆڵەسەندن یاوەکو بۆ بنیاتنانی هاوسەنگیەك بێت لەبەرامبەر "یەرتروید" کە مەرجی رەهای خۆشەویستی بە رێزلێنانێکی ژیرانەوە دەگێڕدرێتەوە وا دەکات کە سوێدەبرێری یەك تۆزێ "لیودیا" هەست ساردو تەسکبین بکات. "لیودیا" "یەرتروید نرخ دابەزیوە. ئەو لە داواکارییەکانی کەمکردوەتەوەو هەندە گران

پێویستی بە ئازار چەشتنی وەکو "یەرتروید" نییە. با کەسانی تر لە جیاتی ئەو ئازار بچێژن.

"لیودیا" بەو جۆرە راستەقینەتر دەبێت، قسەکانی ناکۆکتر دەبن و بەو شێوەیە هەستکردن بە تێنەگەیشتووی ئاسانتر دەبێت. ئەو بە چاوی – "کنیوت یانسۆن"[72] هێمای بۆ ئەمە کردووە– عاشقانە سەرنج دەدرێت و پاشان، لە کۆتاییدا، بەچاوی خیانەتکاریانەی بێدەسەڵات لە تێگەیشتن دەبینرێ. بەڵام ئەو لە هەمان کاتدا زۆر بە ووردی باسکراوە، وە بەو هەستە بێلایەنیەی کە هی نووسەر و "شێرنبلوم"، کە خوێنەر دەتوانێت بۆچوونی خۆی دەربارەی ئەو دروستبکات.

ئەوە ژنە کە لە هەردوو "یەرتروید" و "یارییە جدییەکە"دا لە مەرجەکانی خۆشەویستیدا خیانەتی لێ دەکرێت و ئەوە پیاوە لەلایەن ئەو ژنەی کە خۆشیدەوێت خیانەتی لێ دەکرێت. "ئارڤید" دەیەوێت باوەڕ بە ئارەزویەکی بەهێزی قووڵتر لە ئارەزوویەکی سێکسی بکات. کاتێك "لیودیا" خیانەتی لێدەکات، دەڕشێتەوەو نامەیەك دەنووسێت کە لە چاوی خۆیدا نامەیەکی بەخشندەێتی بوو. "لیودیا" نامەکە بەخۆ بەگەورە زانین و سووکایەتی پێکردن دەبینێت. لەگەڵ ئەوەشدا سوێدەربێری وامان لێدەکات کە لە کاردانەوەی هەردووکیان تێبگەین، ئا لێرەدا لەبەر خاتری نائاسایی بوونی لە نیگایەکی کورتدا رۆڵی نێرومێ نیشاندەدرێت.. شێوەی رەفتاری "ئارڤید" لە "لیودیا" زیاتر مافی ئاکاریانەی پێدەدرێت. چونکە "ئارڤید" –بە کوڕێکی زۆڵ و ژنێکی خیانەتکەر– بە ئارەزوویەکی بەهێزەوە رەفتار دەکات، هەرچی "لیودیا"یە لە راستیدا پاڵپێوەنانێکی ئێرۆتیکیە. ئەوان هەردووکیان بێئاگان، بەڵام "لیودیا" هەست بە بەرپرسیاری ناکا، مەهانەو هەستکردنەکانی "ئارڤید" بە بتاغە دانانەوە پەرە دەسێنێت و بەو شێوەیە دوایی لێی دەبوورێت، هەرچی "لیودیا"شە وەکو نهێنیدارترێك لەوەی کە پێویستی دەکرد کە ببوایە دەخرێتە روو. هەڵبژاردنی گۆشەنیگاکە بەچاوێکی جیا هەڵسوکەت لەگەڵ "لیودیا"دا دەکات.

رەخنەگرانی سەردەم (هەموویان پیاو بوون) وا لە "ئارڤید" تێگەیشتوون کە کەسێکە کە لە رۆتینیاتی ژیانی سەرمایەداراندا گیریخواردووە، هەرچی "لیودیا"یە –بۆ ئەوەی سیتاتی "بوبێرگمان" لە رانانی کتێبدا بهێنمەوە– "ژنێکی چکۆلانەی دڕندە، نموونەیەك لە گومڕاکەرانی سێکسی.."ـە. "لیودیا" خیانەتکارە لەگەڵ پیاوەکەی، هەرچی لاکوتیکردنی[73] "ئارڤید" وەکو نزیکتر لە رێزدارییەوە تێی بڕوانرێت. خوێنەری سەردەمێکی درێژی دوای ئەوە لەوانەیە زیاتر لەسەر رەوشتپارێزی زۆرهێنانی باری ئابووری واقی وڕبمێنێت. "ئارڤید" و "لیودیا" یەکتریان خۆشدەویست بەڵام توانای ئابوورییان نەبوو بە شەرعی خێزان دروستبکەن. بە تێپەڕبوونی کات دووبارە یەکتری دەبیننەوە. بەڵام هەرگیز بە جدییەتێکی رۆژانەوە بەڵکو تەنها لەدڵ لە یەکچوونێك سەرەڕۆییانەو حالگرتوانەدا بو –وە لە پاش ئەوە دووبارە بۆ ئەو دڵنیاییەی کە ئەوان تیایدا دەژین کە بە هەمان رادە وەکو بێزاری پێویستییەکی ناچارییە. ئەوان لە توانایاندا نییە بەپێی هەستەکانی خۆیانەوە بژین، ناوێرن داوای ئازادی بکەن، وە لەوانەشە ئەوە بۆ یەکتری بەڕەوا نەبینن.

لە "یارییە جدییەکە"دا هەموویان خیانەتیان لێکراوە "ئارڤید" لەلایەن "لیودیا"وە، "دامار" لەلایەن "ئارڤید"ەوە "داگمار" خیانەتی لە "ئارڤید" کردووە بەوەی کە ئەو باوکێکی دەوڵەمەندی هەبووە. ئەوان درۆدەکەن و خۆیان بۆ پارە دەفرۆشن، بۆ دڵنیابوون. ئەوان ئارەزووی خۆیان و مەیلی خۆپارێزی خۆیان، برسێتی خۆیان و ئازارچەشتنی خۆیان، ئاکاری خۆیان و خەونەکانی

خۆیان هەیە. وە هیچیان بەراست نایەن -ئیتر ژیان، و کۆمەڵ ناوەمایە، ئەوە بۆیەکە وایە کە سوێدەربێری هەندە زۆر دەربارەی ئەوە بزانێ هەروەك ئەو بەنێو کاتی رووداوەکاندا لە هەموو سەردەمێکی تازەدا خۆی دەترنجێنێتە پێشەوە بۆ لای خوێنەر.

ئێمە لە پشت "ئارڤید"ەوە گوێمان لە دەنگی سوێدەربێری دەبێت. ئەو لە راستیدا لەنێو خێزانداریدا گیریخواردبوو، لە یەکەمین خێزانداریدا، کە هەموو ماناکانی لە دەست دابوو. ئەو لە سالآنی "1902–1906" لە عەشقیدا بۆ "ماریا ڤۆن پلاتێن"[74] کە ئەو -ماوەیەك دوای ئەوە لە نامەیەکدا- بە زیاتر لە هەموو شتێکی یەکلاکەرەوە لە ژیانی دادەنێت. "ماریا ڤۆن پلاتێن" مۆدێل بوو بۆ هەموو "یەرتروید"، "لیودیا" و "هێلگا گریگۆری". "یەرتروید" لە کاتێکدا نووسراوە کە عەشقەکە بوونی هەبوو، وە وا دەردەکەوێت کە سوێدەربێری لەگەڵ ئەو رایەدا بێت لە رەخنەگرتنەکانی یەرتروید لە دوولەت بوون و بیربڵاوی ئیرۆتیکای پیاواندا. رۆمانی "یارییە جدیەکان" لە ماوەی سەردەمێك هاتە کایەوە کە ئەو کاتە هێشتاکە تاڵی کارەساتەکە مابووەوە. هەستی -هەنوکەیی لە یەرتروید بووبوو بە سەردەمی رابردوو، وە "یارییە جدییکە" لە کەسێکی نائومێددا بەرجەستە دەبێت کە وەکو "مارکل" لە رۆمانی "دکتۆر گلاس" ئەوە دەردەبڕێ کە "مرۆڤەکان نیگەران نین لە بارەی بەختیارییەوە، ئەوان بەشوێن شەهوەتدا دەگەرێن". بەهەر حاڵ "هێلگا گریگۆری" بەو شێوەیە کاری کردووە، وە ئەو "دکتۆر گلاس"ـە نهێنی هەڵهێنەرەکە کە هات بەسەریدا کە "هەمان شێوە جێبەجێکردن بوو کە پڕی کردبووم لە بێزاربوون لەبۆ ئەو قەشە پیرەو بە عەشقێکی بێ سنوور بۆ ئەو ژنە گەنجە، بەڵێ، بە ئەمەکێکی سلکەرەوە کە لە بەردەم نزیکی خواوەندا دەوەستێ".

یالمار سوێدەربێری ئەدەبی لەو شتە دروستکرد کە ژیان و راستەقینە بوو. بەڵام -ئارڤید بە لیودیا دەڵێت- تەنانەت لە بۆ خودی شاعیرێك رێی تێدەچێت کە ئەدەب لە عەشقەکەی خۆی دروستبکات "مەتاوەکو تروسکاییەك ژیانی تێدا بێت. دەبێ پێش هەموو شتێ ئەو بمرێت، پێش ئەوەی بتوانێت مەرهەم لە لەشی بدات". وە ئەوە راستە کە سوێدەربێری، یەکێکە لە گەورەترین شاعیرانی عەشق لە ئەدەبی سکەندانافیدا، لە "یەرتروید" و "یارییە جدییەکە" دەربارەی هەوەسێکی نووسیبووی کە لە دەست چووبوو وە لە "لاوێتی مارتین بیرك"دا دەربارەی ئەشکەنجەیەکی دەروونی نووسیبووی کە هێشتاکە شێوەی بەرجەستەی وەرنەگرتبوو.

لەوێدا کە شارەزایی سترینبێری دەربارەی ژن بە رق کۆتایی پێدێت، سوێدەربێری بەرەو خۆبەدەستەوەدان دەبات. چونکە لەلایەکەوە ژن پێش هەموو شتێك دایکە، وە لەلای دووەمەوە ژن خەونی عەشقە، ئەو هەوەسە دوولایەنەیە بە پێچەوانەی سترینبێری سوێدەربێری هیچ رۆڵێکی بینراو بە منداڵ نادات. عاشقەکانی بەدەگمەن لاون، بەڵام منداڵداریش نین. "مێرتە برێم"[75] لە نەرویج منداڵەکەی خۆی و "توماس ڤێبەر" دەبێت، "ئارڤید شێرنبلوم" منداڵی هەیەو "یەرتروید" کورێکی هەبووەو مردووە. بەڵام پیاو زۆریان لە بارەوە نابیسێت. لە نێو ئاکاری خێزانە خانەدانە کۆنەپەرستەکاندا کە سوێدەربێری خەباتی دەکرد منداڵ لە چەقدا بوون وەکو ئەرکێك کە رێگە بدەن خێزانەکە بمێنێ و وە لەنێو سەربەرزی و دارایدا خۆی بهێڵێتەوە. دژی ژن وپیاوێك کە وەکو دەزگایەکی یاسایی -بەقێزلێکردنەوەیەکی وەهای وەك لە دکتۆر گلاسدا بە رووکەشی رەنگکراوە دەبینێ-

سوێدەربێری ئەو عەشقە بێ قەیدو شەرتە، ئەو پەیوەندییە ئازادە بە عەشقێکی کاتی دانانێت.

ئێمە کە لەبەر رۆشنبینیەکی سایکۆلۆژیانەو شیعری ستۆکهۆلمی سوێدەربێری دەخوێنینەوە بە ئاسانی ئەو رووبەڕوو بوونە تاڵەی ئەو لەو سەردەمەی سویددا لەبیر دەکەین: کە چۆن لە لاوانی قوتابخانەکان قەدەغەکرابوو تەماشای "پەرتروید" بکەن، کە چۆن کۆمەڵە دژی بێ رەوشتی ئەو دامەزرابوو وە چۆن "کۆنفیرمە کەرەکان"[76] ناچار دەکران "نیگەرانی دڵ" لەژێر گۆرەوی نێو چەکمەجەکاندا بشارنەوە. ئەو وەکو فریودەری لاوان تەماشا دەکرا، چونکە ئەو درۆ ئاشکراکانی ئاشکرا کرد، لەبەرئەوەی هەستی بۆنکردنێکی "سەگی دۆمەلان"[77]ی لە بەرامبەر ریاکاری قسەی پڕوپوچدا هەبوو.

زیاتر لە هەموو شتێکی تر یالمار سوێدەربێری کابرایەکی ئاکاردارو رۆشنکار بووە. ئەو باوەڕی بە مزرو هۆش هەبوو وەکو ئامرازێکی رێ پاککردنەوە لە شتی مایە پوچ و گەنیو. ئەو ئەمەکدارییە و ئەو ویستەی کە "ئارفید شێرنبلوم" لەسەر کەیلی "دوێبلین"دا لە بارەی ئەوەوە دەخوێنێتەوە جدییە و نەوەکو کینایە. لە هەمان کاتدا خۆی وەکو لە چارە نوسراو و بەرنامە بۆ دارێژراو دەهاتە پێش چاو: هەستی کرد کە پێش وەخت ئامادە بووبوو، هەر لە سەرەتاوە پیر بووبوو. وە ئا ئەم پێکهاتە یەککرتووە لە هەستی سۆزاوی بەهێزی سەرکوێرکراو و ئەو قەزاو قەدەرەی بەزۆر بەسەردا سەپێنراوە مۆرکی تایبەتی یالمار سوێدەربێری پێوەیە. ئەوە مرۆڤی بەهۆش دەکات بە شاعیر. کەڵلەرەقی ئەو، نزیکتر لە سوربوونێکی قەزاو قەدەری دەگەڕێتەوە بۆ چەند سیمبولێکی تایبەت –ئاژاوەگێڕێکە، "ڤینۆس"، قەنەفەی قاوەخانە، زرنگەی زەنگی یاقوب، هەستی جیاوازی روونـاکی– بەردەوامیەکی مۆسیقایانە، دووبارەکردنەوەیەکی پڕ لە نهێنی بەکارەکانی دەدەن: ئێمە چاومان پێوە دەبێ کە چۆن لە بۆ ولاتێکی تایبەت بۆ خودی یالمار سوێدەربێری خۆی نەخشەکە دەکێشرێت. ئەوەی کە ئێمە نێوی بە ستۆکهۆڵم یا کۆپنهاگن دەبەین. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هی ئەوە.

وێنەی سوێدەربێری وەکو کەسێکی گەڕۆکی بێ ئامانج و گاڵتەجاڕ کەرێکی گومانگر، بێگومان بەتەواوی زۆر تەسکبینە. ئەو هەرگیز شۆڕشگێڕ نەبوو، بەلام دوژمنی هەموو دەمارگیرییەك، هەموو ووشکەبڕوایێك بوو، بۆ رێکخستنی جیهان و ئیوتۆپیی گەلێك کە هەموو مرۆڤەکان لەنێو دەزگای تازەو کراسی زۆرلێکردندا[78] بەند دەکات. لە کاتێکدا کە کار دەچێتە سەر ئایدیاو سەرچاوەی دەسەلاتی یاسایی ئەوا بەشێوەیەکی نائاسایی پێویستی بەهیچ نییە: "من بەهەمان کەمی باوەڕم بە کەسێکی هەرە بالاتر وەکو بالاترین ووتارێك هەیە". ئەو واقی وڕمابوو بەرامبەر بەو سۆزەی کە مرۆڤەکان لە بەرامبەر دەسەلاتدا هەیانە. ئەگەر "ئال کاپۆل"[79] لە ولاتە یەککرتووەکانی ئەمریکا ببێ بە سەرەك کۆمار، ئەوا پاش ئەوە ماوەیەکی درێژ ناخایێنێت کە مرۆڤەکان دەستکەن بە پێخۆشحاڵ بوونیان بەرامبەر "شێوازی رووخۆشی دۆستانە، گەرمی وە بگرە کەمێك سادەیی شێوازی کاتۆلیکیانەی، نیگای بە ئاگای بەرامبەر بە هەموو فریوێکی رۆشنبیرانە و چنگ قایمکردن لە عەمەلییەکانی ئەو کێشە ئابووری نیشتمانییە ساختانەی کە هەبوون". ئایا ئاکاری گشتی چ یارمەتییەك دەدات، گەر پیاو نەتوانێت لەو ئاکارەدا وانە بە "کریوگەر"[80] هیتلەر "یك"، "ستالین" یا "مۆسۆلۆنی" خاوەنی دەسەلات بلێتەوەو رازییان بکات کە پێڕەوی بکەن؟ سوێدەربێری چاوی لێ بوو کە سیاسەتمەدارەکان وا هەڵسوکەوت دەکەن "هەروەکو ئەوان نەستەکانیان

لەنێو "ڕۆمانی کەتنکردن"[81] و فیلمی خراپدا هێنابێت، کە ڕێی تێدەچێت کە ئەوان لەنێو ئەوانەوە هێنابێتیان".

هەردەم زاتی ڕاوەستانی لەسەر ڕاکانی خۆی هەبوو، زۆر دوور لەوەی ببێت بە فەیلەسوفی قەرەقوز ئاسایانە، باوەڕی بە توانای شاعیر هەبوو لە گۆڕینی سەردەمی خۆی لەجیاتی سەرشۆڕکردن لە بەرامبەریدا: "ئایا هێزی ئەو هەندەی ویستی بەهێزە، بەو شێوە هێمنیە قەراری دەدا کە کاتژمێری سەردەم پێشوپاش دەکات نەوەکو هی ئەو." لەکاتێکدا ئەو زۆر بە باشی بوو بە ڕۆشنبیرێکی دڵنیاو خۆی بۆ کەمدوویی کردن تەرخان نەکرد. لە مەسەلەی دریفۆس[82]دا لە ڕۆژنامەی "سڤێنسکە داگبلادیت" بە تەنیشت لایەنی ڕەواو ڕاستیەوە وەستا. ئەم تۆفانە "کە شەپۆلەکانی جیاکردەوەو هەر هەموو کەسێکی لە جێگای ڕاستەقینەی خۆیاندا دانا" دە ساڵ دوای ئەوە لە کاتێکدا "کنویت ڤیکسێل"[83] لە دوای کەمپانیایەکی هەڵبەستراو لە "سێڤنسکە داگبلادیت"دا لەبەر کفرکردن سزای بەندکردنی بەسەردا درا. وەکو پرۆتێستە کردن سوێدەربێری گواستیەوە بۆ لای "داگیس نیومێتەر"[84] و هاوکاری خۆشی بەهێرش کردنە سەر پەرەگرافی کفرکردنەوە دەستپێکرد. لە "یارییە جدییەکە"دا "مارکێل" لەبەر هەمان هۆ و لە هەمان کاتدا ڕۆژنامەکەی گۆڕی.

پاشان ڕۆمانێکی نووسی کە، دەیویست لە سایکۆلۆژی ئیرۆتیکانە، بەڵێ لەوانەشە هەر بە تەواوی لە شیعرو فەنتازیاش دوورکەوێتەوە. "شێرنبلوم"ی هەڵسێنگەری مۆسیقا لە کۆتایی کتێبەکەدا وەکو هەواڵنێرێک گەشتێک بە ئەورووپادا دەکات. لەجیاتی خەونی زانست، لێپرسراوی، ویستی بەشداریی کردنێک و لەنێو مێژوودا جێگای خۆی بگرێت. مەیلی خودی سوێدەربێری هەر لە شەڕی جیهانی یەکەمەوە یاسای دەسەڵاتی ڕەخنەی ئایینی بوو، دوو لایەن بوو کە ئەو لە بەدەستهێنانی دەستخۆشکەری لێکردندا دژایەتی کرا. لەگەڵ ئەوەشدا کە هەر لە ***1914*** چاوی لە داخوازی کردنی ئەڵمانیا بوو بۆ دەسەڵات، لە شانۆنامەی "کاتی چارەنووس" باس لە خەباتی تراژیدی هیومانیزم دەکات لە دژی ڕەگەزپەرستی و چەکدارکردن، وە لە "ئێوارە مێواندارییەکانی سەر قونسول"[85]دا، بێجگە لەگەڵ قەشەکەدا، لەگەڵ ڕاستڕەواندا لە "ئێیف-پاپۆر"[86]دا گاڵتە دەکات. لەوێدا "بو بێرگمان"ی هاوڕێی لەگەڵ تراژیدیای خودی بووندا تووش بووە، سوێدەربێری چاوی لەو هەڕەشەی مەرگ لێکردنەی ئەو هەڵسوکەوتە ئاشکرایەی کە کڵێسا، خێزان، شۆڤێنیزم، دەیکرد کردەوەی ڕۆمانتیکی بوو.

لە سییەکاندا سەرلەنوێ دژی هەمان دەسەڵات کە دەیویست دریفوس بهاڕێ خەباتی دەکرد، وە ئەو وەکو زولا داوای لە ویژدانە نووستووەکانی جیهان دەکرد. چونکە نادادوەری و خراپەکاری لە ڕادەبەدەر گەورە بووبوو، لەلای سوێدەربێری ئارەزووی کردارێکی پەرەدۆکساڵ لەخەو ڕابوو بوو. لەلای ئەو درۆی سیاسی و زۆرداری وەکو گوناهێکی سەختتر بوو لە ئارەزوکردنی ژنی کەسێکی کە. هەرگیز دیموکراتی نابێت بە شتێکی بێگومان هەتاوەکو باوەڕ نەکەیت کە "جێگای ئاواتە کە خەڵک خۆی هەڵقورتێنێت لە خودی کاروبارەکانی خۆی". دیکتاتۆر هەردەم نەشیاوە: "ئەو مرۆڤە هێشتا لە دایک نەبووە کە لە توانایدا بێت ماڵداری خێزانێک بە سەد ملیۆن منداڵەوە بکات". ئەو یاسایە دەیخوات کە هەرگیز هاوخولیای چەتەکان نەبێت، هەتاوەکو گەر پیاو ببێت بە قوربانی دەستی ئەوانیش. خۆشباوەڕی شکستی ژیانە: قەرەقۆزەکە جاڕی مرۆڤی خۆی دەدا. خۆ بەدەستەوە دان باوەڕکردن

بوو بەوەی کێشەکە چارەسەر دەکات بەهۆی لەبیری خۆدەرکردنیان کە بوونیان هەیە.

هەر لە بەر ئەمەش سروشتی بوو کە سوێدەربیێری، ئەوکاتە 1939 لایەنگری رۆژنامەی داگیس نیوهێتەر بێت کە لە بارەی نازیسم ناناشکرابوو، نووسینەکانی گواستەوە بۆلای تۆرگنی سێگەشتێت[87] لە رۆژنامەی "ماندلس تیدنینگ"[88]. خەباتی ئەو لە دژی نازیست دوا ساڵی ژیانی کرد بە نائومێدترین و هەروەها بێ گومانترین کات. لە کۆپنهاگنی داگیرکراودا مرد، دڵنیا بوو لەوەی کە نازیسم مانای دوا ژێرکەوتنی شارستانیەتە. بو بیرگمان دەیگێڕاوە کە ئەوکاتەی ئەڵمانییەکان نهێنی نامە ناردنەکانیان لەکار خست رۆژنامە نووسینەکانی نەمان. یالمار سوێدەربیێری نەیدەویست لەسەر شتی بێمانا بنووسێ، وە ئەمەش هەموو کارە نووسراوەکانی دەگرێتەوە. ئەو نەیدەنووسی بۆ ئەوەی ئەفسانە دابهێنێ بەڵکو بۆ ئەوەی بە روونی بدوێت لەسەر پرسیارگەلێك، وە هەر بۆیە کە، لە درێژەپێداندا خودی خۆی سەرنجڕاکێشترە لە کەسە بەرجەستەییەکانی نێو شیعرەکانی.

دەربارەی هزرەکانی یالمار سوێدەربیێری، کارل لاورینی هاوڕێی نووسیوێتی کە ئەوانە وەکو پارەیەکی نازدار کە لە مادەیەکی گرانبەها دروستکراون و شتێك دەڵێن "دەربارەی ئەو سەردەمەی کە ئەوان تیایدا هاتوونەتە کایەوە، لەگەڵ ئەوەشدا گەر بێت و ئەوانە سەودایان پێ نەکرێت". بەڵام جوانی لە هزرەکانی ئەودا ئەوەیە کە ئەوان شتێك دەربارەی سەردەمەکەمان دەڵێن. ئەوانە هەتاوەکو کەسێك بییەوێت لە شەعبەزەی تەماوی و "هوکوس پوکوس"[89]ی رۆحیانەتیدا زەوی بکێڵێت سەودایان پێ دەکرێت.

ئێمە کە ئەمڕۆ ئەو دەخوێنینەوە، پێویستە لە ئەنجامدانی ئەو کارەدا وەکو هونەرمەندێکی لاسایی کەرەوەی هونەرمەندی یا هونەرمەندێکی میزاج سڵ بکەینەوە. ئەو تایبەتمەندیە ئاکارییەکانی کە هی ئەو بوو هەتاوەکو ئەمڕۆش پێویستیەکی تایبەتیە، پرسیارەکانی ئەو، بە وەرگێڕانێکی شتێك نوێتر؛ بەهەمان شێوە هی ئەم سەردەمەیە. ئایا شتێك بوونی هەیە -کە پێی لەسەر ئەوە نا کە دریفوس دەبوایە بیکات- کە لە توانایدا بێت چاکتر خزمەتی وڵاتەکەی بکات بەوەی تاوانێك بخاتە ئەستۆی خۆیەوە؟ ئایا خیانەتی نیشتمانی چییە؟ ئایا سنوری نێوان ژیان و مردن لەکوێوە گوزەر دەکات لە کاتێکدا پرسیار دەچێتە سەر لە باریردنی منداڵ و یارمەتی مردن؟ ئایا رێگە بدرێت بە بەکارهێنانی مرۆڤ لە ئەزموندا؟ ئایا دامەزراوانی میری جارێك لە جاران مافی ئەوەیان هەیە درۆ بکەن لە بۆ خەڵکان یاوەکو درکاندنی زانیاری نهێنی تایبەت یاوەکو سەرپێچی کردن لە هەڵسان بەکارێك کە سەرکردەکان دەیسەپێنن بەسەریدا؟

یالمار سوێدەربیێری کەسایەتیەکی نمونەیی نییە بۆ شیعریەتی تازە. بەڵام ئەو چەندین لاپەڕەی نووسی کە لەوانەیە باشترین پڕ بە پێستی خۆیان بن کە ئێمە لە پەخشانی سویدیدا هەمانە. لەوانەیە کەسانێ کە جوانکاری و کاریگەری زیاتریان هەبێ، بەڵام ژمارەیەکی کەمیان هەندە کارامەن، هەندە پڕ ئەندێشەو چاوتیژییەکی تاڵ. ئەوەندە زۆر ئاسانە کە لەنێو ستیلی ئەودا وەکو سەرکەوتنێك بەسەر نایەکسانێتی ژیان بژێن. ئەو فۆرمەلە بوون بۆ کەسێك دەکات و ئەوەش بەشێوەیەکی ئاشکراترو خۆڕاگرتری دەکات.

یالمار سوێدەربیێری وەکو ژمارەیەکی کەم وایە لە هاوسەردەمانی خۆی -بەڵام نەوەکو بێجوڵەو رامکراو. ئەو شێوەی دەموچاوی خۆی دایەوە.

تەلیسماوییەکی زیاترو پێشتریش پڕ بە پێست لە هەر هەموو کەسێ کە ووشەی سەردەمی کرد بەهی خۆی. بەڵام لە خودی روونی ئەودا شتێ هەیە دوور دەستە کە وەکو سەرمەستییەك وایە. لەو شەفافیەی ئەو پڕژی نەبینراو لە شیعرو مەرامی دەروونی شاردراوەتەوە.

## پەراوێزەکان:

1- "نووسینەکانی یالمار سوێدەربێری" لە سالی 1977- 1978 لەلایەن چاپخانەی "Liber Forlag" لە ستۆکهۆلم بڵاوکراوەتەوە وە "پێر سوێدەربێری" وەکو سەرەتایەك بۆ سەرجەمی کارەکان کە لە نۆ بەرگدایەو لەهەر هەموو بەرگێکیشدا هەمان دەق بڵاوکراوەتەوە.

2- "per Wastberg" لە سالی 1933 لە ستۆکهۆلم لە دایك بووە، ئەندامی ئەکادیمای سویدییە، لەنێوان سالانی 1976- 1982 سەرۆکی بەشی کلتوری رۆژنامەی "داگیز نیومێتەر" بوو، رۆماننووسەو هاوکات وەك شارەزایەك لە ئەدەبی ئەفریقی و ناسێنەری نووسەرانی ئەفریقایە لە زمانی سویدیدا.

3- "Hjalmar Bergman": "1883-1931" یەکێکە لە رۆمان نووس و شانۆنامە نووسە بەناوبانگەکانی زمانی سویدی و هاورێیەکی یالمار سوێدەربێری بوو.

4- "Den allvarsamma leken": دوا رۆمانی یالمار سوێدەربێرییە، لە سالی 1912دا بڵاوبوەتەوە.

5- "کریستینا لاڤرانس دۆتەر" "Kristin Lavransdotter": رۆمانێکی بەناوبانگی نووسەری نەرویجی "سیگرید ئوندسێت" "Sigrid Undset"ـە، لە سالی 1920- 1922دا بە سێ بەش بڵاو بوەتەوە. ئەم نووسەرە لە سالی 1924دا خەڵاتی نۆبلی وەرگرتوە، لە سالی 1941دا بەنێو سوێددا هەڵهات و نەرویجی لەلایەن ئەڵمانیای نازییەوە داگیر کراوی بەجێهێشت و بوو بە پەنامەندە لە ئەمریکاو دژی نازیست وەستا. ئەم ژنە نووسەرە خۆی و بەرهەمەکانی گەورەترین رێزی لێ دەگیرێت لەلایەن خەڵکی نەرویجەوە.

6- "Anna Karenina": رۆمانی "لیف تۆلستۆی"یە. کە لە سالی 1875دا نووسراوە.

7- "Tristin och Isolde": رۆمانێکە لە سەردەمی چاخی نێوەڕاستەوە هاتووە، وە تاوەکو ئێستاش کەس نازانێ لە بناغەوە لە کوێوە هاتووە. دواجار نووسەری فەرەنسی "Joseph Bedier" جوسێف بێدیێر بە شێوەیەکی تازە دووبارە نووسیویێتەوە، وە ئەو دەقەش بەزۆری دەخوێندرێتەوە.

8- "Fredrik Book": "1883-1961" لە سالانی 1920- 1924دا باوەڕنامەی پرۆفیسۆری لە مێژووی ئەدەبدا وەرگرتووە. لە سالی 1922 بوو بە ئەندامی ئەکادیمای سویدی. یەکێکە لە گەورەترین ناو و چەکبەدەستانی رەخنەی ئەدەبی سویدی لە سەرەتای سەدەی بیستەمدا، بەلام لە سالی 1940دا لە نووسینەکانی پارێزکاری لە سیاسەتی ئەلمانیا دەکردو تێگەیشتنی لە سیاسەتی نازیست ئاشکرا کرد. دوای ئەوە نێوی و جێگای ئەدەبیشی لەگەڵ نازیستدا ون بوو، بەلام ئێستاکە کارەکانی وەکو کاری ئەدەبی رێزی لێدەگیرێت. سوێدەربێری لە چەند بەرهەمێکیدا بۆ نموونەی گاڵتەجاڕییانە بەکاریهێناوە. بەرهەمێکی زۆری هەیە لە پۆرتێتی کەسانێکی کلاسیکی سویدی و چەندین لێکۆڵینەوەی ئیستاتیکی هەیە.

9- "Roda rummet": رۆمانی نووسەری سویدی "ئاوگوست سترێنبێری"یە کە لە سالی 1879دا نووسراوە، بە یەکێ لە بەنرخترین بەرهەمی دادەنرێت؛ لەوێدا وێنەیەکی زۆر بەرجەستەی شاری ستۆکهۆلمی کردووە.

10- "Gosta Berlings saga": یەکێکە لە شا رۆمانەکانی "سێلما لاگەرلوێف" کە لە سالی 1891 نووسراوە.

11- "Drottningens juvelsmycke": ڕۆمانێکی نووسەری بەناوبانگی سویدی "کارل یوناس ئالمکڤیست"ە، کە لە ساڵی 1834دا بڵاوبوەتەوە. چوارینە ڕۆمانی ئێڤید یۆنسون کە لە ساڵانی 1934-1937 بڵاوی کردۆتەوە. ئەم ڕۆمان نووسە لە ساڵی 1900 لە باکوری سوید لەدایك بووەو لە ساڵی 1976 لە ستۆکهۆلم کۆچی دوایی کردووە. لە ساڵی 1957 بوو بە ئەندامی ئەکادیمیای سویدی، لە ساڵی 1974دا خەڵاتی نۆبلی بەشکرد لەگەڵ "هاری مارتینسۆن"دا. یەکێکە لە ناسراوترین ڕۆمان نووسی سویدی.

13- "Slussen" ئاوبارەیەکە وا لە ناوەڕاستی شاری ستۆکهۆلمدا لە دوو ئاستی جیاوازی ئاودا بەلەمی پێ ئاودیو دەکرێت.

14- "Valhalavagen": شەقامێکی نێو شاری ستۆکهۆلمە.

15- "Anglais"" ئوتێلك بووە لە ستۆکهۆلم بەو ناوەوە، لە تەنیشت "ستورەپلان"ەوە بوو وە لەو سەردەمەدا لە دەوروبەری کۆتایی ئەو سەدەیەدا شوێنێکی دڵگیر بوو لەلایەن نووسەرانەوە بۆ یەکتری بینین.

16- "Rydberg"" ئوتێلی ریودبێری بە تەنیشت ساحەی گۆستاف ئادۆلفدا بوو.

17- "Kungstredgard" باخچەیەک لە چەقی شاری ستۆکهۆلم.

18- "Alle": جادەیەکە دار بە ئەمبەر و ئەوبەریەوە ڕوێنرابێت.

19- "Jakobs Kyrka": کڵێسایەکە لە شاری ستۆکهۆلم.

20 "Malmskillnadcgatan": جادەیەکە لە چەقی شاری ستۆکهۆڵم، نێوی بە جادەی قەحبەکان زڕاوە.

21- "Gunnar Ekelof": لە ساڵی 1907 لە ستۆکهۆلم لە دایك بووەو لە ساڵی 1968 کۆچی دوایی کردووە. لە ساڵی 1958 بوو بە ئەندامی ئەکادیمیی سویدی. یەکێکە لە شاعیرە هەرە ناسراوەکانی زمانی سویدی.

22- "Gropen" ئەم جێگایە وا بۆی دەچم کە بارێك بووە لە نێو گراند ئوتێلدا، بەڵام بۆ دڵنیایی بە تەلەفون لەگەڵ ئەو ئوتێلەدا قسەم کرد، وە ئەوان بەتەواوی نەیاندەزانی، وە ڕێگەشی تێدەچێت وەکو بە تەلەفون لەگەڵ " " قسەم کرد کە ئەو ناوە نێوێك بووە لە لایەن مەعمیلەکان کە هەردەم لەوێدا دادەنیشن و ئەو نازناوەیان بۆ دروست کردبێت.

23- "Grand": ئوتێلی گراند، کە لە نێوەڕاستی شارە.

24- "Djurgarden": دورگەیەکە لەنێوەڕاستی شاری ستۆکهۆلم و نێوی بە باغی ئاڵ دەرکردووە.

25- "Calle Cederstrom": پێشەنگی لرێکەوانییە لە هەموو سویددا.

26- "Lagerlund": بێشەی داری غار.

27- "Historietter": یەکەمین کۆمەڵە چیرۆکی یالمار سوێدەربێرییە کە لە ساڵی 1898دا بڵاوی کردوەتەوەو پێکهاتووە لە بیست (چیرۆکۆکە)، ئەم نارەشی بۆیەکە ناوە چونکە زیاتر دەیویست پەخشانە شیعر بنووسی، وە لەجیاتی "لقصوصە" ئەو وشەیەی بەکارهێناوە. وە لاسایی کردنەوەیەکیش دەبینرێ لە پەخشانە شیعرییەکانی بۆدلێردا لە کتێبی "پەخشانە شیعر" بەڵام ئەوانەی سوێدەربێری کەمێك درێژترن.

28- "Par Lagerkvist": "1891-1974" یەکێکە لە ناوە هەرە گەورەکانی ئەدەبی سویدی و خاوەنی چەندین شاکاری وەکو ڕۆمانی "جەلاد-1933"، "کوللە-1944"، "باراباس-1950" "سیبیلان-1956" و ستینەی "حاجییەکە- 1960 تا 964". لاگەرکڤیست کۆمەڵێ زۆر شیعرو چیرۆکی هەیە. لە ساڵی 1940دا بووە بە ئەندامی ئەکادیمیای سویدی و لە ساڵی 1951دا خەڵاتی نۆبلی وەرگرتووە.

29- "سەرگوزشتە بەدەکان" "Onda Sagor": کۆمەڵە چیرۆکێکی لاگەرکڤیستە.

30- "Lars Gyllensten": لە ساڵی 1921 لە ستۆکهۆلم لەدایك بووە. یەکێکە لە بەناوبانگترین رۆماننوسانی سویدی و خاوەنی گەلێك رۆمانە. ئەندامی ئەکادیمیای سویدییە.

31- "Willy Kyrkund": لە ساڵی 1921 لە هێلسینگفۆرشی فینلاند لە خێزانێکی سویدی فینلاندی لەدایك بووە. یەکێکە لە نووسەرە هەرە بەناوبانگەکانی زمانی سویدیی. کۆمەڵێك رۆمان و چیرۆکی نووسییەوە. وە بە زۆری تێماکانی بێدەسەلاتی مرۆڤ و کەنارکراوە، بەشێوەیەکی فەلسەفی دەنووسێت.

32- "Aftonstjarnan": "ئەستێرەی ئێوارە" کاروان کوژە": ئێوی شانۆگەرییەکی سوێدەریێرییە.

33- "Karlavagen": شەقامێکە لە شاری ستۆکهۆلم.

34- "Bo Bergman: 1869- 1967 یەکێکە لە شاعیرە بەناوبانگەکانی سوید، لە ساڵی 1925دا بوو بە ئەندامی ئەکادیمیای سوید. هاورێی یالمار سوێدەریێری بوو، نامە گۆڕینەوەکانی نێوانیان بەشێوەی کتێب لە ساڵی 1969دا بڵاوبووەتەوە.

35- "Norra Latin" قوتابخانەیەکی ناسراوە لە ستۆکهۆلم وە تاوەکو ئەمڕۆش تیایدا دەخوێندرێت.

36- "Martin Brick": ئێوی دووەم رۆمانی یالمار سوێدەریێری پاڵەوانی رۆمانەکەیەتی کە لە ساڵی 1901دا بڵاوی کردووەتەوە.

37- "Oskar Levertin": "1862-1906" پرۆفیسۆر بوو لە مێژووی ئەدەب و یەکێکە لە رەخنەگرە گەورەکانی مێژووی رەخنەگری سویدو شاعیرێکی بەرزی سویدییە. لە شیعرەکانیدا زیاتر لەنێو ئاینی جولەکەو مەسیحیدا ئەندێشەکانی دەهێنا.

38- "Acheron": رووبارێکە کەوتووەتە باکوری یۆنانەوە.

39- "Norrstrom": دورگەیەکە لە ناوەڕاستی شاری ستۆکهۆلمدا.

40- "Verner von Heidenstam": "1859-1940" لە ساڵی 1912دا بووە بە ئەندامی ئەکادیمیای سویدی و لە ساڵی 1916 خەڵاتی وەرگرتووە. خاوەنی چەندین بەرهەمی شیعری، رۆمان، چیرۆك و ووتاری بەنرخە.

41- "Hans Alienus": ئێوی رۆمانێك و پاڵەوانی سەرەکی هایدنستامە کە لە ساڵی 1892دا بڵاوبووەتەوە.

42- "پێچەپێدەرەکان" "Labyrinter" متاهە.

43- "Arvid Stjarnblom": پاڵەوانی رۆمانێکی سوێدەریێرییە.

44- "Svenska Dagbladet": رۆژنامەیەکی سویدیی شاری ستۆکهۆلمە، لە ساڵی 1884دا ژمارەی یەکەمی دەرچووە و هەتاوەکو ئەمڕۆش بەردەوامە لە دەرچوون.

45- "Selma Lagerlof": "1858-1940" لە ساڵی 1909دا خەڵاتی نۆبلی وەرگرتووە، وە لە ساڵی 1914دا بووە بە ئەندامی ئەکادیمیای سویدی.

46- "Doktor Glas": سێیەم رۆمانی سوێدەریێرییە و لە ساڵی 1905دا بڵاوکراوەتەوە.

47- "Herman Bang": "1847-1912" چیرۆك نووس و رۆمان نووس بووە.

48- "J.P.Jacobsen": لە ساڵی 1847 لە تیستێدی دانیمارك لە دایك بووە لەوێدا لە ساڵی 1885دا کۆچی دوایی کردووە. رۆمان نووسێکی ناتورالیستەو کارێکی زۆری کردووە لە لێکۆڵینەوە دەربارەی بۆتانیك.

49- "Guy de Maupssant": لە ساڵی 1850 لە نورماندیای فەرەنسی لەدایك بووەو لە ساڵی 1893 کۆچی دوایی کردووە. چیرۆك نووس و رۆمانووسێکی بەناوبانگە و لە دواسالانی ژیانی پەیرەوی ناتورالیزمیەکانی دەکرد.

50- "ئاناتۆل فرانس" "Anatole Frans": "1844- 1924" رۆمان نووسێکی فەرەنسیە، لە ساڵی 1896ـەوە ئەندامی ئەکادیمیای فەرەنسی بوو، ساڵی 1921 خەلاتی نۆبلی پێدرا. بەشێك لە بەرهەمەکانی لەلایەن یالمار سوێدەربێرییەوە کراون بە سویدی

51- "Arne Garborg": "1851-1924" شاعیرو رۆماننووسێکی بەناوبانگی نەرویجیە، بە "ترسناکترین نووسەری نەرویج"ی ساڵەکانی 1880 ناودەبرا. داستانی دراماتیکی "Haugtussa"ی نووسی کە هەموو نەرویجییەك خۆشیان دەوێت و هیچ کەسێکی دیکە لێی تێناگات. یەکێکە لەو نووسەرانەی کە لەبەر هۆی نووسینەکانی لە کاری میری دەرکرا.

52- "Carl Larsson": یەکێکە لە گەورەترین شێوەکاری سویدیو جیهانی.

53- "مێنسکا: مرۆ": ئەو وشەیە وەکو کورتکردنەوەی مرۆڤ بۆ مرۆیە.

54- "ئارتۆن: هەژدە": ئەم وشەیە وەکو کورتکردنەوەی هەشتدە بۆ هەژدە.

55- "Doktor Markel": پاڵەوانێکی سەرەکی رۆمانی "دکتۆر گلاس"ـە.

56- "Henrik Rissler": یەکێکە لە پاڵەوانەکانی رۆمانی "دکتۆر گلاس".

57- "TomasWerber": یەکێکە لە پاڵەوانەکانی رۆمانی "گومڕایی".

58- "لاوێتی مارتین بیرك" "Martin Birks ungdom" 1903 رۆمان.

59- "Werther": نێوی پاڵەوانی سەرەکی رۆمانی "ئێزتێرسی لاو" "Die Leiden des jungen Werthers"ی گۆتەی شاعیری ئەڵمانیە، کە لە ئەورووپادا نێوی دەرکردبوو.

60- "Oblomov": ئەوەی راست بێت نازانم پاڵەوانی کام رۆمانی کام نووسەری رووسییە.

61- "Leopod Bloom": پاڵەوانی رۆمانی ئۆدیسۆس "Odysseus"ی جێمس جۆیس "James Joyce"ـە.

62- "Gregorius": نازناوی قەشەیە کە مێردی هێلگا گریگۆریسە لە رۆمانی "دکتۆر گلاس".

63- "Helga Gregorius": ژنە پاڵەوانی رۆمانی "دکتۆر گلاس".

64- "Don Juan": نێوی کەسێکی بەرجەستەکراوەو خەریکی شەواڵ پلیت و لاکوتی بووە.

65- "Klas recke": ژنە پاڵەوانی رۆمانی "دکتۆر گلاس".

66- "میدسۆمەر دانس" "سەمای چلەی هاوین": ئاهەنگێکی سەما کردنە بە دەوری دارێکی بەگوڵ رازاوەوە، بە بۆنەی ئاهەنگی چلەی هاوین کە پلەی گەرما لە خۆشترین پلەیدایە.

67- مەتەر: حریض.

68- "Erland Jansson": یەکێکە لە پاڵەوانەکانی شانۆنامەی "پەرترویدا".

69- "Gertrud": نێوی شانۆنامەیەکی یالمار سوێدەربێرییەو هاوکات پاڵەوانەکەشی نێوی پەرترویدە.

70- "Dagmar": یەکێکە لە پاڵەوانەکانی رۆمانی "یاریە جدییەکە".

71- "Lydia": یەکێکە لە پاڵەوانەکانی رۆمانی "یارییە جدییەکە".

72- "Knut Jansson": رەخنەگرێکی سویدیە و لە بەرهەمێکدا لە ساڵی 1960 لەسەر سوێدەربێری نووسیوێتی.

73- "لاکوتیکردن": شەواڵ پلیتی لابەلا لەگەڵ کەسانی کەدا لەکاتێکدا ئەو ژنە یا ئەو پیاوە هاوسەری خۆی هەبێت. وە بۆ نێوی ئەو کارەش "لاکوت"ـە و نێوی کارەکەش "لاکوتی"ـە.

74- "Marta von Platen": ئافرەتێکە سوێدەربێری عاشقی بووبوو.

75- "Marta Breehm": یەکێکە لە پاڵەوانەکانی ڕۆمانی "ڕێ ونکردن".

76- "کۆنفیرمە کەرەکان": ڕێورەسمێکــی ئــایینی مەسیحیە کە منداڵــی هەرزەکار لــە تەمەنێکی تایبــەتدا دەنێردرێن بۆ کڵێسائێك و لەگــەڵ هاوتەمەنــەکانی خۆیاندا بە ئـایینی مەسـیحی ئاشـنایان دەکــەن. وە دوای ئــەو ماوەیە ئاهــەنگی مەسیحی بوونێکــی تــەواویان بــۆ ساز دەکرێت.

77- "سەگی دۆمەلان": ئــەو سەگانەیە کە فــێری دۆزینەوەی دۆمەلانیان کردوون.

78- "کراســی زۆرلێکــردن": جــۆرە کراســێکی فەقیانــەدارە بــۆ بــەندکردنی نەخۆشــانی دەروونـــی بەکاردەهێنرێت.

79- "Al Capone": سەرۆکی مافیای ئــەمریکا بوو.

80- "Kreuger": یەکێکە لــە هاودەســەلاتدارانی نازی ئەڵمانیا.

81- "ڕۆمانی کەتنکردن": روایة اجرامیة.

82- "Alfred Dreyfus": ئەفســەرێکی پــالای فەرەنسی گەلێك دەوڵەمەند بوو وە لــە ڕەگــەزدا جولەکە بوو: لە 15ی ئۆکتۆبەری 1894 دەستبەسەر کرا لەژێر تــاوانی خیانــەت کــردن بەرامبــەر بــە وڵات وە جاسوســی کردن بۆ ئەڵمانیا، وە پاشان سزای دوورخرانەوە درا هەتا مردن بۆ دورگەی شەیتان لە گویانای فەرەنسی. لە ساڵی 1895 لــە هــەموو پلەیــەکی ســوپایی داگرتــرا. لــە 12 تــەموزی ساڵی 1906دا ســزاکەی لەســەر لادرا بــەهۆی ئاشکرابوونی ناڕاســتی تاوانەکــەی: لــە پــاش خــەباتی چەندین کەسایەتی بەرزو ڕۆشنبیرانی وەکو زۆلا "Emile Zola" و ئانــاتۆل فرانــس "Anatole Frans" لــە بەرامبــەر ڕەگەزپەرســتی و فێــڵ و درۆ لـــە دادگـــای فەرەنسیدا.

83- "Knut Wicksell": ڕۆژنامەنووســـێکی ناسراوە لــە ساڵەکانی 1880 و 1890 لە ڕۆژنامــەکاندا لەسەر بابــەتی ئــازادی ســێکس و ڕەخنــە لــە ئــایین دەینووسی وە کەسێکی گەلێك عیلمانی بوو وە کاریگەری هــەبوو بەســـــەر نووســــەرانێکی زۆرەوە لەوانـــە سوێدەربێریش. لە ناوەڕاستی نۆڤەمبەری 1908دا سزای دوو مانگ بەندکردنی بەسەرا درا. وە ئەمەش وای کرد کە سوێدەربێری لە گەلێك جێگا لە بەرهەمەکانیدا ئەو هەواڵە بگرێنجێنێتە نێو بەرهەمەکانیدا.

84- "Dagensnyheter": ڕۆژنامەیەکی سویدیی شاری ستۆکهۆلکە/ لــە ساڵی 1864دا ژمــارەی یەکــەمی دەرچووەو هەتاوەکو ئەمڕۆش بەردەوامە لە دەرچووندا.

84- "erotik": شتی سێکسی.

85- "سەرقونسڵ": ســەرۆکی قونســولیەتی وڵاتێکــە لە قونسلیەتدا.

86- "F. Batsraseri": نێــوی چــیرۆکێکی سوێدەربێرییە.

87- "Torgny Segerstedt": خـــاوەنی ڕۆژنامەکە بوو وە خەباتێکی زۆری کرد بۆ ناساندنی دیوی ناوەوەی نازیسم و خراپەکاریەکانیان. یالمار سوێدەربێری تا لە نامەبڕینیان کرد بەرهەمی بۆ ئەم ڕۆژنامەیە دەنارد.

88- "Handelstidningen": ڕۆژنامەکـــــەی تۆرگنی کە لە یێتۆتێبۆری دەردەچوو.

89- "hokus- Pokus": دوو وشــەیە لــەکاتی سیحرکردندا بەکاردەهێنرێت.

## "سەگێکی بێ خاوەن"

### نووسینی: ئوللێ هۆلمبێری[1]

"پیاوێك مرد، وە ئەوکاتــەی ئــەو مردبــوو، کــەس خزمەتی سەگە ڕەشــەکەی نــەکرد". ئەمە ســەرەتای کورتــە چــیرۆکی "ســەگێکی بێخــاوەن"ی یالمـــار سوێدەربێرییە. بە پێی ئــەوەی کــە ســوێدەربێری لــە تێبینــی بــۆ نووســینەکانی خــۆی گێڕاویەتــەوە، لــە سەرەتای ساڵی 1890دا نووسراوە، وە خراوەتە نێــو

"بەسەرهاتۆکەکان ***1898***". ماوە لە دوای ماوە لەنێو ئەنتۆلۆگییەکاندا دەبینرا وە لەبەر ئەو هۆیە چەند ساڵێك بەر لە مەرگی لە گفتوگۆیەکی کورتدا روون کردنەوەیەکی دا وە ئەمەش روونکردنەوەکەیە: "ئەو بەسەرهاتۆکەیە هەردەم خەڵکی گەلێك خۆشیان ویستووە، چونکە ئەوان لەو باوەڕەدان کە ئەوە باس لە سەگێك دەکات".

کەواتە سەگێکی بێخاوەن باس لە سەگێك ناکات. باشە بە شێوەیەکی "قووڵ" باس لەچی دەکات؟ گەر پیاو وشەی مرۆڤ لەجیاتی سەگ دابنێ ئەوا کارەکە روونتر نابێت، چونکە سوێدەربێری کە لەسەر کۆمەڵگا-و کێشەی پێکەوە ژیان تێڕوانینێکی زیاتر نزیك بە لیبراڵی هەبوو؟ بەبێ گومان ئەوەی نەدەبینی کە هەر هەموو مرۆڤێك پێویستی بە گەورەیەك هەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا پیاو گۆڕانکارییەکی زیاتریش بکات لە پایەکانەوەو بیکا بە خوای گەورە یاوەکو یەکسەر بیکات بە ئەی خواکەمان، ئەوجا لەوانەیە پیاو لە مەبەستی شیعرەکە نزیکتر ببێتەوە. سوێدەربێری لە کورتە هۆزێکدا لە "پەشێوی دڵدا" بەم شێوەیە رادەردەبڕێ:

"مرۆڤ خوا بەکاردێنێ بۆ ئەوەی خۆی پێ برازێنێتەوە: بهێڵە با وا بکەن! بۆ ئەوەی خۆی لە پایەیەکی باڵاتر لە نەگبەتەکان، کە هیچ گەورەکەیان نییە جێگیر بکات: بهێڵە با وا بکەن! ئەوان دەڵێن: "من لە خزمەتدام لەلای گەورەیەکی مەزن؛ تۆ خزمەتکاری بۆ کێ دەکەی؟ هیچ کەس؟ بەستەزبان، تۆ بەبێ شوێن ڕێگا دەبڕیت.

ئێ باشە کەواتە مرۆڤەکان سەگن؟ چونکی نابینی سەگ بەم جۆرەیە: "پیاو دەبێت گەورەیەکی هەبێت".

چاوەزاری سەگ بەدوای گەورەکەیداو مرۆڤییش بەدوای خوایەکدا بەپێی ئەوەی لەم کتێبەی ***1909***دا چکێك دەبێت بە قەشمەرجار کراو. هەندە لە "سەگێکی بێخاوەنە" نا. "مرۆڤ بۆ سەگ بێکۆتاییە، چاودێرییەکی خوایانەیە"، لەوێدا بەو شێوەیە هاتووە. "گەورەیەکەو دەبێ گوێڕایەڵی بێت، شوێنی بکەوێت و جێی متمانەی بێت: هەروەك وتمان، مانای ژیانی سەگێتی ئاوەهایە". سەگەکە ئەو کاتەی خاوەنەکەی فیکەیەك لێدەدا هەموو شتێك لەبیر دەکات. "ئەو سەگە خاوەنەکەی مرد، بێئەوەی بزانێ چۆن و لەکوێ نێژراوە، پرسەی درێژخایەنی بۆ دانا".؟ بەڵام تا لە کۆتاییدا ئەو لە بیردەکات، هەرچەندە بۆی دەکرا باش بژی، نووست، دزی کرد، خواردی و لەگەڵ سەگەکانی تردا بەسەرهاتی خۆشەویستی هەبوو، شەڕو یاری کرد. رۆژێك گوێی لە فیکەیەك بوو بەنێو هەواکەدا وای لێ کرد کە وریا بێتەوە. فیکەکە جارێکی کە هات. بیرەوەرییەکە لەلای ئەو رابوو. "ئەوە خاوەنەکەی ئەو بوو کە فیکەی دەکێشا، ئیجا ئەو پێویستە دوای بکەوێت! کە بۆ جاری سێهەم فیکەکە لێدراوە، بەهەمان درێژی و تیژی، ئێ باشە ئەو لە کوێدایە؟ بەچی لایەکدا؟ چۆن من لە خاوەنەکەم جیاکراومەتەوە؟ وەکەی ئەمە روویداوە، دوێنێ یاخود پێرێ، یاخود لەوانەیە پێش تاوێك بەر لە ئێستا؟ ئێ باشە خاوەنەکەم شێوەی چۆن بوو، وە چ جۆرە بۆنێکی هەبوو، وە باشە ئەو لە کوێیە، ئەو لە کوێیە؟ سەگەکە دەگەڕێ و دەگەڕێ بەڵام ئەوەی ئەو بەدوایدا دەگەڕێت نادۆزرێتەوە. "ئەوجا لە چوارڕیانێك دانیشت و کەللە کوڵنەکەی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوەو قرووسکانی".

سوێدەربێری بەسەرهاتەکەی بەم وشانە تەواو دەکات:

"ئایا تۆ سەگی لە بیرکراوی، بێخاوەنیی لەو جۆرەت بینیوە، گوێی لێ بووە، لە کاتێکدا سەری بەرەو ئاسمان بەرزکردبێتەوەو بقرووسکێنێو بقرووسکێنێ؟ سەگەکانی تریش لەسەرخۆ لەو ناوەدا

کلکیان لەناو گەڵیاندایە؛ تێخۆ ئەوانە نە دەتوانن دڵی بدەنەوەو نە دەشتوانن یارمەتی بدەن".

ئەو سەگە قروسکە کەرە لە جێگەیەکی کەدا لەلای سوێدەربێری هەیەو لەوێدا راستەوخۆ لەو پەیوەندیەدایە لەگەڵ ئایین دا. ئەویش لەو شیعرە ریتمدارە هاینە[2] ئاساما خولیایانەی "*langfredag*" = "هەینی درێژ"[3]ەدایە. کە هێمای بۆ کراوە کە شیعرێکی سەردەمی لاوێتییە:

سەگێ دانیشتووەو دەلورێنێ
لەبەر دەروازەی کڵێسای یەعقوب
لورەکەی لەگەڵ تونێکی خەماوی
تەلیلەی هەوەسدا تێکەڵ دەبێ.

کەڕەبەفر دەبارێ و بارانیش دەبارێ
و باکەش خەریکی راوکردنە
تا خوڕکێکی تەنها
بۆ پێشەوە لەگەڵ ئاستی ئاوازی تەلیلە لاکەلاکێتی.

گریە و زاری ئەو تەلیلە شەموەت مێنەرە هێمنە
گلەیی دەکات لە دەستی خەم و لێقەومان
لەنێو کڵێسەی سەرخۆشدا خۆی دەترنجێنێتە دەرەوە،
خۆی دەترنجێنێتە نێو قاوەخانەیەکی چۆڵەوە.

وە ئەوەش هەندە خەماوی و جاڕس کەرە،
وە کەس ناوێرێ شادمان بێت،
وە پیرێژنەکان دانیشتوون لەنێو کڵێساکەدا
و بەڕیز دەگرین و دەلوشکێنن.

گومانی تیا نییە ئەوان لەسەر کەسێك دەگرین
بەسەر پەیکەری کەسێکی لاوازی سنگ و زگ بریندار کراودا
یەکێکە کە بێ رەنگەو خوێناوی
و بە خاچێکەوە هەڵواسراوە.

شاعیر لە شیعرەکەیدا ئەو هەینییە درێژە ماخولیاییە باراناوییە دەگوازرێتەوە بۆ "پیرێژنەکان" بەڵام ئەوەیان هی خودی خۆیەتی. ماخولیای مرۆڤ خۆی لەگەڵ سەگ و مەڕومالات تێکەڵ دەکات هەروەها لوشکە لوشکەکان دەبێ بە جۆرێك لە دەربڕین بۆ لوشکە لوشکی مرۆڤەکانیش. ئەوەش لە "سەگێکی بێخاون"دا بەهەمان شێوەیە.

لە بەرایی ژیانیەوە یالمار سوێدەربێری بێخوا بوو. بۆ ئەو ئەوە بێ خوایانەی کە ئەو سەر بەوان بوو بێخوایی بەهەمان شێوەی وەکو ئەو ئەوە لاوانەی سەردەمانێك دوای ئەوان کە شتێکی روون و بێگومان و بێکێشەیە کاری نەدەکرد. ئەو خوایەی کە ئەوان رەتیان دەکردەوەو باوەڕیان پێ نەبوو بە شێوەیەك لە شێوەکانی نابەرابەری، بوو بە شتێکی راستەقینە. هەموو ئەو مرۆڤانەی لە دەستەی باڵای ئەدیباندا ئەوەی دەزانی و بە بیری دەهاتەوە ئەوەی زەردەشتی نیچە هاواری سەیر پێهاتنی باش گفتوگۆکەی بۆ دەکرد لەگەڵ گۆشەگیرەکاندا لە دارستانەکاندا: "*Sollte es denn moglich sein! Dieser alte Heilige hat in seinem Walde noch Nichts davon gehort, dass Gott todt ist!*" ئەگەر ئەوە راست بێت کە "سەگێکی بێخاوەن" بەگشتی کەم یا زیاد، "باس" لە مرۆڤێکی بێ خوا بکات، ئیتر یالمار سوێدەربێری هەمان تێگەیشتنی وەکو زەراتۆسترای نیچەی هەیە لەسەر بوونی خوا، بەڵام هەمان شادمانی و هێمنی وەکو ئەوی نییە.

ئایا سوێدەربێری هەر لەوکاتەوە کە "سەگێکی بێخاوەن"ی نووسی مەبەستی ئەوەبوو کە ئەو وەکو لە بارەی سەگێکەوە تەماشا نەکرێت، یاوەکو ئەوە شتێکە کە ئەو دواتر، کارەکەی خۆی راڤە کردووە، بیری لێ کردووەتەوە؟ ئەوەی دواییان رێی تێدەچێت، هەروەها ئەوەی پێشتریانیش. هەر لە گووتاری ئیبسندا لە "ئورد و بیلد"[4] 1893 لەسەر ئەو هزرە رێککەوتووە کە کارێکی ئەدەبی دەکرێت بە رووکەشی دەربارەی بابەتێك بێت بەڵام لە راستیشدا کارەکە مانایەکی کەی هەبێت. ئەو لەوێدا دەنووسێت کە ئەوە دەبێتە هۆی "بۆچوونێکی دووچاری وە بۆ کاری هونەریش لە پایە داگرتن" کە گەر بێتو وەستای بینا دروستکردن سولنێس دەربارەی وەستای بینا دروستکردنێك ئاوەها و ئاوەها بێت یاوەکو "لە دەشتە بەرفراوانەکە" دەربارەی کوڕی گوندییەك بێت کە بۆ نێو دارستان هەڵدێت. ئەوە بێگومان بەهەمان شێوە دووچاربوون نییە کە بەخەیاڵیدا بیهێنێ کە "سەگێکی بێخاوەن دەربارەی سەگێکە، ئێ بەڵام بەپێی قسەی یالمار سوێدەربێری خۆی ئەو بەسەرهاتە باس لەوە ناکات.


سەرچاوەکان:

*1-Olle Holmberg: Skratt och allvari svensk litteratur: Studier fran fyra arhundrade. Bonniers, Aldusbockerna 1963, sid. 190 -121.*

*2-Ake Runnquist: litterara tidskrifter 1920-1960; Bonniers, 1963, sid. 97.*


پەراوێز:

*1- "Olle Holmberg" ئوللێ هۆلمبێری: لە ماوەی سالانی 1937–1958دا پرۆفیسۆر بوو لە بارەی ئەدەبەوە لە دانیشگای "لوند" چەندین کاری گەورەی لەسەر "س.ج.ل. المکئنیست"، "ڤیکتۆر ریودبێر"، "ئێریك یوهان ستاگنەلیوس" و "بیۆگرافی لە بارەی "کارل گوستاف ئەف لیۆپۆلد" نووسیووە، لەوانە تا ئێستا چوار بەرگی لێ دەرچووە وە هەروەها پێشەکیەکی بۆ هەڵبژاردەی بەرهەمەکانی سوێدەربێری کە لە دوو بەرگدایە نووسیووە.*

*2- "Heinrich Heine" = هێنریش هاینە (1797–1856) شاعیرو نووسەرێکی بەرەگەز جولەکەی ئەڵمانییە، دکتۆرای لە یاسا هێناوەو لە دوا سالانی ژیانی لە فەرەنسا ژیاوە.*

*3- "Langfredag" "هەینی درێژ": دوا رۆژی هەینیە لە پێش هاتنی پۆسکدا، رۆژێکی گرنگە لە ئایینی مەسیحیدا، ئەو رۆژی هەینییە یە کە مەسیحی تیا لە خاچ درا. ئەم شیعرەی یالمار سوێدەربێری لە سالی 1892دا بڵاوبووەتەوە.*

*4- "Ord & Bild": گۆڤارێکی کلتووری سویدییە لە سالی 1892دا ژمارەی یەکەمی دەرچووە وە هەتاوەکو ئەمڕۆش بەردەوامە لە دەرچوون.*

## سەگێکی بێخاوەن

**(1894)**

پیاوێك مرد، دوای مردنی کەسێك خزمەتی سەگە رەشەکەی نەکرد. سەگەکە بۆ ماوەیەکی زۆر خەفەتی بۆ خواردو دڵیشی پڕبوو لە رق. خۆی نەدا بەسەر گۆڕی کابرای خاوەنیدا بۆ ئەوەی لەسەر گۆڕەکەی بمرێ. لەوانەیە لەبەرئەوە بووبێت کە سەگەکە نەیدەزانی کابرا لە کوێیە، یان لەوانەیە لە بناغەدا لەبەرئەوە بووبێت کە سەگەکە، لاو و شادمان، کە هێشتا خۆی وەها دەهاتە پێش چاو کە هەندێ ماف و رەوای لەگەڵ بووندا یەکلا بکاتەوە.

سەگ دوو جۆرە. سەگێك کە خاوەنی هەیەو سەگێك کە کەسی نییە. لە روکاری دەرەوە، جیاوازی

گەورە نابینرێت. سەگی بێخاوەن دەکرێ بەقەد سەگێکی تر قەڵەو بێ، زۆربەی جار قەڵەوتریش، نەخێر، جیاوازییەکە کەوتووە بە لایەکی تردا. بەلای سەگەوە، مرۆڤ ئەو دەسەڵاتە باڵاو بێکۆتاییەیە. گەورەیەکەو دەبێ گوێڕایەڵی بێت، شوێنی بکەوێت و جێی متمانەی بێت: هەروەك وتمان، مانای ژیانی سەگێتی ئاوەهایە. بێگومان هەموو دەقیقەیەکی رۆژان خاوەنەکەی لە خەیاڵدا نییە، وە هەردەم پێ بەدوای پێ شوێنی کابرای خاوەنی ناکەوێت، نەخێر، زۆربەی جار لەو دەوروبەرە سەربەخۆ رادەکات بە روخسارێکی بازاڕیکردن ئاساوە بنی سووچی خانووەکان دەکات و پەیوەندی لەگەڵ سەگەکانی هاوبرای خۆی دەبەستێ و ئەگەر بێتیش بە دەستیەوە ئەوا ئیسقانێك بۆ خۆی دەکرۆژێت و خەمی گەلێ شتی تریش دەخوات؛ بەلام لەهەمان کاتدا ئەگەر خاوەنەکەی فیکەی بۆ لێدا، هەر هەموو ئەم شتانە، خێراتر لە بەقاڵێك لە پەرستگا بە قامچی راوبنرێت لە مێشکی سەگانەی دەردەچێ؛ چونکە ئەو دەزانێ، کە ئەوەیان لە ناچاریدایە. سەر سووچی خانووەکان و ئێسقان و هەڤاڵەکانی لەبیر دەکات و زۆر بەپەلە بۆلای خاوەنەکەی دەگەڕێتەوە.

ئەو سەگە خاوەنەکەی مرد، بێئەوەی بزانێ چۆن و لەکوێ نێژراو؟ پرسەی درێژخایەنی بۆ دانا؛ بەلام لەگەڵ تێپەڕبوونی رۆژگاردا، هیچ شتێکی وا رووی نەدا کە وای لێ بکات خاوەنەکەی وەبیرچێتەوە. ئیتر سەگەکە ئەوی لەبیر کرد. لەو شەقامەی ماڵی کابرای خاوەنی لێ بوو، لەوە بەدوا بۆنی شوێنەواری کابرای خاوەنی نەدەکرد. ئەوکاتەی کە لەگەڵ هەڤاڵێکیدا لەسەر چیمەنی تەختە زەمینێك یەکتریان دەگەوزاند زۆر جار وا روویدەدا کە فیکەیەك بەنێو هەواکەدا رێگای دەبڕی و لەهەمان کاتدا هەڤاڵەکەی وەکو بایەك ون دەبوو. ئیتجا گوێیەکانی قووت دەکردەوە. بەلام هیچ فیکەیەك بە فیکەی خاوەنەکەی ئەوی نەدەکرد. ئیتر ئەویش کابرای لەبیرکردو لەوەش زیاتر شتی تری لەبیر کرد: لەبیری چووبوو کە جارێك لە جاران خاوەنێکی هەبوبێت. لەبیری چووبوو کە کاتێك لە کاتەکان سەردەمی ئەو بووبێت، ئەو کاتە وای بۆ نەدەچوو کە دەشێت سەگێك بەبێ خاوەنەکەی بتوانێ زیندەگی بکات، ئەو وای لێهات کە پیاو بڵێ سەگێکە کە رۆژانێکی چاکی پێشتر بردۆتە سەر. لەگەڵ ئەوەشدا لە مانایەکی ناوەکی لە رووکەشدا باش هاتە پێش چاو. ئەو ژیانێکی لەو بابەتە ژیا کە سەگێك تیای دەژی: جار ناجارێك ژەمێك خواردنی لە بازاڕەکە دەدزی و تێهەڵدانی دەخوارد. بەسەرهاتی خۆشەویستیشی هەبوو، وە لەکاتێکدا کە ماندوو دەبوو دەیویست بخەوێ خۆی دەدا بەعەردا. دۆست و دوژمنی بۆ خۆی پەیداکرد. رۆژێکیان وا روویدەدا کە سەگێکی تری تێروپڕی دارکاری کرد کە لەخۆی بێ هێزتر بوو، وە رۆژی وا هەبوو کە خۆی تێروپڕ دارکاری دەکرا لەلایەن یەکێکی بەهێزترەوە. بەیانیان، کاتێکی زۆر، پیاو دەیتوانی بیبینێ بە شەقامی ماڵی خاوەنەکەیدا بەرەو ژوور رابکات، کە لەوێدا راهاتبوو زۆربەی کات بباتە سەر. بەرەوپێش رایدەکرد بەشێوەیەك دەموچاوی وا پیشان دەدا کە کارێکی گرنگی بەدەستەوەیە تا جێبەجێی بکات؛ هەر بەدەم رێوە بۆنی ئەو سەگە دەکات کە بەتەنیشتیدا تێدەپەڕێ بەبێ ئەوەی ببێتە ئاشنای؛ پاش ئەوە خێراییەکەی زیاد دەکات، یەکسەر دادەنیشێ و بەخێراییەکی پڕ توانـاوە بناگوێی خۆی دەخورێنێ. پاش ئەوە یەکسەر بەتاو هەڵدەستێتە سەرپێ و لەمبەری شەقامەکە دەفڕێ بۆ ئەوبەری شەقامەکە بۆ ئەوەی راوی پشیلەیەکی سوور بکات تا دەیکات بە کونی ژێرزەمینێکدا، پاش ئەوە بە هێنانەوەی بیری بازاڕی کردن بە رێگاکەی خۆیدا بەردەوام دەبێ و لە سووچێکدا ون دەبێ.

ئاوەها ڕۆژان بەسەردەچوون، وە سالان بەخێرایی بەدوای یەکتردا تێدەپەڕین، ئەو پیر دەبوو بەبێ ئەوەی خۆی هەستی پێ بکات.

ئێوارەیەکی تەڕو ساردو هەوراوی بوو، تاو نا تاوێك لێزمەی بارانێك دای دەکرد. سەگە پیرەکە، سەرتاپای ئەو ڕۆژە لە خواری شاردا لە گەڕانێکی بێ ئامانجدا بوو؛ زۆر لەسەرخۆ بە شەقامەکەدا بەرەو ژوور سەردەکەوت، کەمێك بۆی دەشەلی؛ یەك دوو جار ئێستێکی کرد و پێستە ڕەشەکەی خۆی تەکاند، کە بە تێپەڕبوونی سالدا دەوروپشتی سەروملی ماشوبرنجی تەلّخی کردبوو. بەپێی ڕاهاتنی پێشینەی ڕەوتی دەکرد و هێشتا بەرەو لای ڕاستی زیاتر مشەمشی دەکرد، وەك بەلای چەپدا؛ پاشان هەروا لە خۆڕایی سەری کرد بە دەروازەیەکدا، ئەوجا کە هاتە دەرەوە، سەگێکی تری هاودەم بوو. لە چرکە ساتی دوای ئەوەدا سەگێکی سێهەم پەیدابوو. سەگەکان گەنج و گالتەچی بوون و دەیانویست گالتەی پێ بکەن و پێی ڕابوێرن؛ بەلام ئەو لە میزاجێکی خراپدا بوو؛ وە لە هەمان کاتدا شەستەباران بوو. ئەوکاتە فیکەیەك بەنێو هەواکەدا ڕێگای قاشکرد، فیکەیەکی درێژو تیژ. سەگە پیرەکە، سەیری هەردوو سەگە لاوەکەی کرد، بەلام ئەوان گوێیان بە فیکەکە نەدا؛ ئەوە هیچ یەکێ لە خاوەنەکانی ئەوان نەبوو کە فیکەی لێدا. ئەوجا سەگە پیرە بێ خاوەنەکە گوێکانی قووت کردەوە ؛ خۆی سەیر هاتە پێش چاو. فیکەیەکی ترو سەگە پیرەکە بە ناداڵنیاییەوە غاریدا بەرەو یەکێ لەو لایانە، پاشان بەرەو لایەکی تر. ئەوە خاوەنەکەی ئەو بوو کە فیکەی دەکێشا، ئێجا ئەو پێویستە دوای بکەوێت! کە بۆ جاری سێهەم فیکەکە لێدرایەوە. بەهەمان درێژو تیژی. ئێ باشە ئەو لەکوێدایە؟ بەچی لایەکدا؟ چۆن من لە خاوەنەکەم جیاکراومەتەوە؟ وە کەی ئەمە ڕوویداوە، دوێنێ یاخود پێری، یاخود لەوانەیە پێش تاوێك بەر لە ئێستا؟ ئێ باشە خاوەنەکەم شێوەی چۆن بوو، وە چ جۆرە بۆنێکی هەبوو، وە باشە ئەو لە کوێیە، ئەو لە کوێیە؟ ئەو بەو ناوەدا ڕایدەکردو بۆنی هەموو ئەو کەسانەی دەکرد کە لەو ناوەدا تێدەپەڕین، بەلام هیچ یەکێکیان خاوەنەکەی ئەو نەبوون، وە هیچ کەسێکیشیان نایانەوێت ببن بە خاوەنی. دوای ئەوەی پێچێکی بەرەو دوا کردەوە لە شەقامەکەدا بەرەو خوار شۆڕبووەوە؛ لەسەر سووچەکەیدا ئێستێکی کردو سەیرێکی چواردەوری خۆی کرد. کابرای خاوەنی لەوێ نەبوو. ئەوجا بە غاردان بەرەو دوا شەقامەکەی گرتەبەر؛ پیسی لێ دەتکا، وە بارانەکەش بە پێستەکەیدا دەچۆڕایە خوارەوە. لە هەموو سووچێکدا ئێستێکی دەکرد بەلام خاوەنەکەی لە هیچ جێیەك نەبوو. ئەوجا لە چوارڕیانێك دانیشت و کەللە کولکنەکەی بەرەو ئاسمان بەرزکردەوەو قرووسکانی.

ئایا تۆ سەگی لەبیرکراوی، بێخاوەنی لەو جۆرەت بینیوە، گوێی لێ بووە، لە کاتێکدا سەری بەرەو ئاسمان بەرزکردبێتەوەو بقرووسکێنێ، بقرووسکێنێ؟ سەگەکانی تریش لەسەرخۆ لەو ناوەدا کلکیان لەناو گەلّیاندایە، ئێخۆ ئەرانە نە دەتوانن دلّی بدەنەوەو نە دەشتوانن یارمەتی بدەن.

## فەرووەکە

**(1897)**

ئەو سالّە زستانەکەی سارد بوو. مرۆڤەکان لە سەرماندا دەچوونە ناو یەك و بچووك دەبوونەوە، تەنها ئەوانە نەبێت کە جلی لە فەروو دروستکراویان هەبوو.

ریکارتی سەردانوەری هەرێم[1] فەروویەکی گەورەی هەبوو، لەگەلّ ئەوەی کە فەرووەکەی بەتەواوی پێویستییەك بوو لە پێویستییەکانی کارەکەی، چونکە ئەو لە دەزگایەکی زۆر تازەدا

بەڕێوەبەری جێبەجێکەر بوو. کەچی هاوڕێی دێرینی دکتۆر "مێنگ" هیچ فەروویەکی نەبوو؛ لە جیاتی ئەوە ژنێکی جوان و سێ زارۆکی هەبوو. دکتۆر مێنك لەڕواڵواز و کەمڕەنگ بوو. هەندێك مرۆڤ هەن کە ژن دەهێنن قەڵەو دەبن، هی تریش هەن کە لەڕواڵواز دەبن. دکتۆر مینگ لەڕ بوو؛ وە ئیتر کات بوو بە شەوی یەلدا[2].

—ئەمساڵ، من ساڵێکی خراپم هەبوو، دکتۆر مینك کاتێك ئەمەی لەبەرخۆیەوە وت لە کاتژمێری سێی ئێوارەی یەڵدادا، بە تەواوی لەکاتی ئاوابوونی خۆردا، لەو ساتەدا کە بەڕێوەبوو بۆ لای هاوڕێی دێرینەی "جۆن ریکات" بۆ ئەوەی پارەی لێ قەرزبکات.

—ئەمساڵ، من ساڵێکی خراپم هەبوو، تەندروستیم لە لەقیندایە، بۆ ئەوەی نەڵێم داڕماوە. بەڵام بەلایەکی تردا زۆربەی زۆری نەخۆشەکانی کە من تیماریان دەکەم بەرەو چاك بوونەوە دەچن؛ من ئێستا ئاخر زۆر بە دەگمەن دەیانبینم. ڕێی تێدەچێت کە من، بەم نزیکانە بمرم. ژنەکەشم هەروەها هەمان باوەڕی هەیە، من ئەوەم تێدا بەدی کردووە. ئەوەیان ئەگەر وا بێت بەدڵی من دەبێت، ئەگەر بێت و ئەوە پێش کۆتایی مانگی کانوونی دووەم ڕوویدات دەبێ ئەوسا ئەو قستە نەگریسەی تەئمینی ژیان بدرێتەوە.

ئەو کاتەی ئەو لە بیرکردنەوەکانیدا گەیشتبووە ئەو خاڵە، خۆی لە سووچی شەقامی ریێرینگ و شەقامی هامن بینییەوە. ئەوکاتە دەیویست لە چوارڕیانەکە تێپەڕێت بۆ ئەوەی پاشان بە شەقامی ریێریندا بەرەو خوار بێتەوە، پێی لە ڕچە[3] ڕێیەکی لووسی تاخوڕك[4] هەڵخزاو هەڵکەوت و بەدەما کەوت، وە لە هەمان کاتدا تا خورکە فایتوونێك[5] بە خێراییەکی زۆرەوە هات. فایتوونچی[6]یەکە جنێوی دەداو ئەسپەکەش وەك هەستێکی زگماك بەرەو لایەك پێچی کردەوە، بەڵام دکتۆر مێنك لەلایەکەوە پاڵێکی پێوەنرا، لەگەڵ ئەوەشدا بورغوییەك یاوەکو بزمارێك یان شتێکی لەو بابەتە لە پاڵتۆکەی گیربوو. وە شەبەقێکی گەورەی تێکەوت. خەڵکەکە لە دەوروپشتی کۆبوونەوە. پۆلیسێك یارمەتیدا تا خستیەوە سەر قاچەکانی، کیژۆڵەیەك بەفرەکەی لە جلەکانی تەکاند. کەیبانوویەکی بەساڵاچوو بەسەر لەقاندنەوە بە دەوروپشتی پاڵتۆ دڕاوەکەی دکتۆر مێنکدا سووڕایەوە بەشێوەیەکی وەها کە هەروەك بڵێی دەخوازێت هەر لەو جێگەیەدا بۆی چاك بکاتەوە گەر بیتوانیبایە. کوڕە شازادەیەك لەوانەی ماڵی پاشا، کە بە ڕێکەوت بەوێدا تێپەڕیبوو، کڵاوەکەی ئەوی هەڵگرتەوەو خستیە سەری دکتۆر مێنکەوە، ئیتر دووبارە هەموو شتێ چاکبووەوە جگە لە پاڵتۆکەی.

—شەیتان بەنەحلەت بێ، ئەوە تۆ چیت لێقەوماوە. گوستاف، سەرداوەر ریکارت وتی. لەو کاتەدا کە مێنك هاتبوو بۆ سەرەوە بۆ لای لە مەکتەبەکەی.

مێنك وتی: بەڵێ، من بووم بەژێر تاخوڕکە فایتونێکەوە.

—ئا، ئەوە بە تەواوی لەتۆ دەوەشێتەوە. ئەمەی وت و هاوڕێیانە دەستیکرد بە پێکەنین. بەڵام خۆ تۆ بەو شێوەیە ناتوانی بگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە. زۆرم پێ خۆشە گەر فەروەکەم لێ قەرزبکەی، ئەوجا ئداڵێك دەنێرم بۆ ماڵەوە بەدوای پاڵتۆکەمدا.

دکتۆر مێنك وتی: سوپاس. پاش ئەوەی ئەو سەد کرۆنەی کە پێویستی بوو لێی قەرزکرد. دوابەدوای ئەوە وتی:

—ئیتر بەخێرهاتنت دەکەم بۆ نانی ئێوارە.

ڕێکارت سەڵتە زەلامێك بوو کە هەمیشە شەوانی یەڵدای لە ماڵی مێنکدا دەبردەسەر.

* * *

هێنك، له رێگای چوونه ماڵەوەیدا لە میزاجێكی باشتری وادا بوو كه له مێژ بوو بەخۆیەوە نەیبینیبوو. خۆی بە خۆی وت: ئەوە بەهۆی فەروەكەوەیە، گەر بهاتایه و من ژێر بوومایە، ئەوا ماوەیەكی زۆر پێش ئێستا دەمتوانی بە قست فەرووییەكم بۆ خۆم پەیدابكردبایە. ئەوا ئەوە باوەڕ بەخۆ كردنمی فراوان دەكردەوەو لەبەرچاوی خەڵكیش بەرزی دەكردمەوە. پیاو ناتوانێ هەندە پارەی كەم بدات بە دكتۆرێ كە لە تۆی فەروودایە هەروەك بە دكتۆرێك كە لە تۆی پاڵتۆیەكی ئاسایی و كۆندایە كە دووگمەكانی داڕزاون. بە راستی ئا ئەمەیان ناخۆشە، كە من پێشتر بیرم لەمە نەكردۆتەوە، ئێستاش كات درەنگە.

تاوێك بەنێو كونگس ترێدگۆردندا هاتووچۆی كرد، ئەوكاتە دونیا تاریك بووبوو، سەرلەنوێ بەفر دەستی كردبووەوە بە بارین. وە ئەو ناسیاوانەی كە رووبەڕووی دەبوونەوە نەیاندەناسیەوە.

بەردەوام بوو لە قسەكردن لەگەڵ خۆیدا: ئێ باشە، تۆ بڵێی كێ ئەوە دەزانێت، گەر بێت و كردنی ئەو كارە درەنگ بێت؟ خۆ من تا ئێستاكەش پیر نەبووم. وە لەوانەشە من بەهەڵەدا چوویم لە پرسیاری تەندروستیمدا. من هەندەی رێوییەكی چكۆنەی نێو دارستان هەژارم. هەرچەندە رێكارتیش تا پێش ماوەیەك هەروا بوو. لەم ماوەیەی دواییدا، ژنەكەم ساردو نانەجیب بووە بەرامبەرم. بێگومان دووبارە منی خۆشدەوێتەوە ئەگەر بێتو پارەی زیاتر بەدەستبهێنم و فەرووش لەبەر بكەم. من وابزانم كە ئەو حەزی زیاتر لە جۆن كردووە، لەدوای ئەوەی كە ئەو فەروویەكی بۆ خۆی پەیداكرد، وەك ئەوەی پێشتر كردبووی، لە راستیدا ژنەكەم كەمێك ئارەزووی لەو كردبوو لەوكاتەوە كە كیژێكی منالكار بوو؛ بەلام ئەو هەرگیز داوای داخوازیكردنی ئەمی نەكرد، بەڵكو بەو و بە هەموو مرۆڤەكانی تری وتبوو كە ئەو هەرگیز ناوێرێت ژن بهێنێت ئەگەر پارەی ساڵانەی لە دە هەزار كەمتر بێت. بەلام من وێرام هێلینیش كچە هەژارێك بوو كە بەشادمانیەوە دەیویست شوو بكات. من لەو باوەڕەدا نیم كە ئێللین بە شێوەیەك منی خۆش بووێت كە من بتوانم فریوی بدەم ئەگەر ئەوەم بوویستبایە، بەلام من ئەوەم نەدەویست. چۆن دەمتوانی خەون بە خۆشەویستییەك ببینم لەو جۆرە. من هەر كاری لەو بابەتەم نەكردووە بەتایبەتی لەپاش ئەوەی كە شانزدە ساڵان بووم و بۆ یەكەمجار فاوستم بە ئۆپێرا بینی لەگەڵ ئارنۆڵدسۆندا. من لەوە دڵنیام كە ئەو سەردەمەی كە تازە گواستبوومەوە، منی خۆشدەویست. پیاو لە شتی ئاوادا بەهەڵەدا ناچێت. ئێ باشە بۆچی ئەو ناتوانێ بۆ جارێكی تر ئەوە دووپات بكاتەوە؟ لە ماوەی سەرەتای سەردەمی ژن و مێردایەتیماندا هەردەم قسەی ناشرینی بە جۆن دەووت، هەر ئەوەندەی كە چاویان بەیەكتری بكەوتبایە. بەلام ئیتر ئەو كۆمپانیاكەی دامەزراند و جارجارەش دەیبردین بۆ شانۆ و فەروویەكیشی بۆ خۆی پەیداكرد. وە دوای ئەوە بێگومان، ژنەكەم لەگەڵ تێپەڕبوونی كاتدا وتەی ناشیرینی دەوت و منیش پێی ماندوو بووم.

هێشتا هێنك، لە پێش نانی ئێوارێ، هەندێ ئیشوكاری مابوو كە جێبەجێی بكات. كاتژمێر گەیشتبووە پێنج و نیو، ئەوجا بە باری دیارییەكی زۆرەوە هاتەوە بۆ ماڵەوە، هەستی بە داهێزرانێكی زۆر دەكرد لە شانی چەپیدا، دەنا هیچ شتێك نەبوو ئەو رووداوە بچووكەی پێش نیوەڕۆی بەبیربهێنێتەوە، جگە لە فەرووەكە.

دكتۆر هێنك لەبەرخۆیەوە وتی: ئەوە هەر زۆر خۆش دەبێت لە كاتێكدا ببینم ژنەكەم چی دەكات كە بە فەروویەكەوە بمبینێت.

دالانەکە بە تەواوی تاریك بوو وە چراکەی هەرگیز هەڵنەدەکرا جگە لەو ساتانەی کە بەخێرهاتنی میوان دەکرا. ئێستا لە سالۆنەکەوە گوێم لێی دەبێت. دکتۆر هێنك بیری دەکردەوە. ئەو هێندە بە سانایی ڕێ دەکات، هەروەك باڵندەیەکی چکۆلانە. ئەوە چەند سەیرە کە هێشتا دڵم بە کوڵ دەگری لە هەر کاتێکدا کە لە ژوورەکەی تەنیشتمەوە گوێم لە هەنگاوەکانی دەبێت.

دکتۆر هێنك راستیکرد کە ژنەکەی چاوەڕوانی دەکردو پێشوازییەکی شایانە و خۆشەویستانەی پێدەدا کە ببینیایە ئەم فەرووی لەبەردایە. جیا لە جاران کە ژنەکەی پێی راهاتبوو، بەدزییەوە لە سووچی تاریکی دالانەکەوە خۆی نووساند بە مێردەکەیەوەو هەردوو باڵی لکاند بە ملییەوەو ماچێکی گەرم و گوڕی کرد. پاشان سەری سماندە نێو یەخەی فەرووە گەرمەکەی و چرپاندی:

–گوستاف هێشتا لە ماڵەوە نییە.

–بەرەوەلا. دکتۆر هێنك بەدەنگێکی چکێك شەکاوەوە، لەوکاتەدا کە بە هەردوو دەستی دەستبازی لەگەڵ قژی ژنەکەیدا دەکرد.

–بەرەوەلا. ئەو لە ماڵەوەیە.

*

لە ژووری کارکردنەکەی دکتۆر هێنك زۆپایەکی گەورە داگیرسابوو، ویسکی و ئاویش لەسەر مێزەکە هەبوو. سەرداوەر ریکارت خۆی بە درێژی راکشاندبوو لەنێو قەنەفەیەکی لێن[7] لە چەرم گیراودا و چرووتی دەکیشا. دکتۆر هێنك لە گۆشەی قەنەفەیەکدا بەگرمۆڵەیی دانیشتبوو. کە خاتوو هێنك و منداڵەکان خەریکی داگیرساندنی دارکاژی یەلدا[8] بوون، دەرگای نێوان ژوورەکەی ئەمان و هۆڵەکە کراوەبوو.

نان خواردنی ئێوارەیان گەلێك بێدەنگ بوو، تەنیا منداڵەکان دەیان جریواند و لەگەڵ یەکتردا قسەیان دەکردو دڵیان خۆش بوو.

–تۆ هیچ قسە ناکەیت، کوڕی باش! ریکات وتی. لەوانەیە تۆ دانیشتبیت و خەمی پاڵتۆ دڕاوەکەت بخۆیت؟

هێنك وەڵامی دایەوە: نەخێر، بەڵکو خەمی فەرووەکەمە.

بۆ ماوەیەی چەند دەقیقەیەك بێدەنگ بوو بەرلەوەی لە قسەکردن بەردەوام بێت.

–هەروەها بیر لە شتێکی تریش دەکەمەوە. دانیشتووم و وا بیر دەکەمەوە کە ئەمە دوا یەلدایە پێکەوە جەژن بکەین. من خۆم دکتۆرم و دەشزانم کە رۆژی زۆرم نەماوە، من بێ چەندوچوون ئەوە دەزانم. بۆیەکە دەمەوێت سوپاست بکەم بۆ هەموو ئەو دۆستایەتیەت کە لەم دواییەدا بەرامبەر بە من و ژنەکەم نیشانت داوە.

–ئاە، تۆ بەهەڵەدا چوویت. ریچارد منگاندی و ڕووی لێ وەرچەرخاند.

هێنك وەڵامیدایەوە: نەخێر، من بەهەڵەدا نەچووم، وە هەروەها دەمەوێت سوپاسی ئەوەت بکەم کە فەرووەکەی خۆت بە قەرز پێدام. ئەو فەرووە کە دوا چرکەی بەختیاری بۆ پەیداکردم کە من لە ژیانمدا هەستم پێکردبێت.

پەراوێز:

1– "Haradshovding": سەرداوەری هەرێم: نازناوێکی سویدی زۆر کۆنە، بەو کەسانە دەوترا کە سەرۆکایەتی دادگای هەرێمێکی سەر بە شارەوانی بکەن.

2– "Julafton": شەوی یەلدا: ئەو شەوەیە کە عیسا لە دایك بووە. لێرەدا تێبینییەکم هەیە لە بەکارهێنانی ئەم وشەیەدا و ئەوپەڕی سەری نەوازش دادەنێم بۆ ئەوانەی ئەو وشەیان بەکارهێناوە لە فەرهەنگەکانیانداو لە نووسینەکانیاندا. بەلام درێژترین شەوی ساڵ دەکەوێتە رۆژی بیستویەکەمی کانوونی یەکەمەوەو شەوی یەلداش دەکەوێتە رۆژی

بیستوچوارەمی مانگی کانوونی یەکەمەوە، بۆیەکە ئاکرێت بۆ هەمان مەبەست بەکاربهێنرێت، وە لەو باوەڕەشدا نیم کە نالی شاعیر مەبەستی لە دیاری یەلْدا نەبووبێت کە لە شیعری "شەوی یەلْدا"دا دەڵێت "خەلاتی وەسلی تۆی مەنظورە ئەمشەو" وا تێناگەم مەبەست لە بەکارهێنانی ئەم شەوە لە درێژی شەودا بێت بەڵکو لە وێناکردنی شەوی یەلْدا و ناردنی نوری خوا بەشێوەی عیسای پێغەمبەر بووە بە دیاری بۆ ئادەمیزادان، چاوەڕوانی ئەویش چاوەڕوانی گەیشتنی حەبیبەی دەزگیرانی بووە لەو شەوە پیرۆزەدا. بۆ تێبینیش تەماشای شیعری "شەوی یەلْدایە، یا دەیجووره ئەمشەو"ی نالی بکەن کە مامۆستایان چی دەفەرموون: (شەوی یەلْدا: وشەیەکی سەریانییە واتە لە دایك بوون، درێژترین شەوی ساڵە کە دوا شەوی مانگی پایزە. بۆیە وا ناونراوە چونکە حەزرەتی عیسا لەو شەوەدا لەدایك بووە.(لاپەڕە: 388) ساڵی: 1976 بەغداد، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد. "دیوانی نالی: مەلا عبدالکریمی مدرس و فاتیح عبدالکریم و محمد مەلا کەریم"). وە هەر لەسەر هەمان وشە کورد دەتوانێت بۆ وشەگەلێك بۆ ئەم بابەتە دابتاشێت لەسەر ئەو وشەیە: یەلْدا: جەژنی لەدایك بوونی عیسا، شەوی یەلْدا: ئەو شەوەیە عیسا لە دایك بووە، رۆژی یەلْدا: رۆژی جەژنی لەدایك بوونی عیسا؛ رۆژی دووەمی جەژنی لەدایك بوونی عیسا؛ دارکاژی یەلْدا: ئەو دارکاژەیە کە بە بۆنەی ئەم جەژنەوە دەڕازێنرێتەوە؛ باوە یەلْدا: کە پێشتر لە زمانی فارسییەوە وشەی "باباتوێل" وەرگیراوە، وە لە راستیدا کورد وشەی باوەو پیر بەکاردەهێنێت بۆ کەسێکی پیرۆز نەوەکو بابا، وە گەر ئێمە بمانەوێت ئەوا دەتوانین هەر لە هەمان وشە ئەو نێوەش دادەڕێژین؛ جەژنی یەلْدا: هەر هەموو ئەو مەراسیم و رۆژانەی یەلْدا. یەلْدا گێڕان: ئاهەنگ گێڕانی جەژنی یەلْدا؛ دیاری یەلْدا، یاوەکو: خەلاتی یەلْدا، یا یەلْدانە: ئەو دیارییە کە لە شەوی یەلْدادا دەدرێ بە کەسێك؛ خواردنی یەلْدا: ئەو خواردنانەی کە لە جەژنی یەلْدادا دەخورێت.. هەتا دوایی.

3- "Spar": رچە: بەو رێگایە دەگوترێت کە یاریکەرانی وەرزشی بەفر لەسەری دەڕۆن؛ مێلی ئاسنی کە شەمەندەفەری بەسەردا دەڕوات کە ئێمە بە مێلی ئاسنی نێویمان بردووە، وە لێرەدا تاخوڕکی فایتوون لەسەری دەڕوات.

4- "Slade": تاخوڕك: عەرەبانەی بێ پێچکەی سەر بەفر.

5- "droskslade": تاخوڕکە فایتوونێك: هەمان عەرەبانەیە کە لە هاویندا لەلای ئێمە ئەسپ رایدەکێشێت و کاری تاکسێتی دەکات و پێچکەی هەیە؛ بەڵام ئەم بێ پێچکەیە و لە زستاندا هەمان کار دەکات. فایتوون: عەرەبانەی سواری دوای وڵاخ، وەکو فایتوون لێ دەخورێت.

6- فایتوونچی: ئەو کەسەی تاکسی بەکاردەهێنرێت.

7- "Lanstol": قەنەفەیەکی تاکە نەفەری کە لە تەختی پاشایانە بکات.

8- "Julgran": ئەو دارکاژەیە کە لە شەوی یەلْدادا دەیڕازێننەوە و دیارییەکان لەژێر سایەیدا دادەنرێت.

## پاداشتی خراپە

**(1897)**

ئەمە سەرگوزشتەی کیژۆڵەیەك و دەرمانسازێکە بە ئێلەکێکی سپییەوە.

کیژەکە لاو و باریکەڵانە بوو، بژنی کاژستان و خەلەنگ[1]ی لێدەهات. پێستی بە تیشکی هەتاو برونزی ببوو، کەمێك پەڵ پەڵ دیاربوو. کیژۆڵەکە ئاوەها بوو کاتێ من ناسیم. بەڵام دەرمانسازەکە هەر دەرمانسازێکی ئاسایی بوو. رۆژانی یەکشەممان ئێلەکێکی سپی لەبەردابوو. وە ئەمەش رۆژی یەکشەممەیەك روویدا. لە لادێیەکدا، لە جێگایەکدا هێندە دوور لە جیهان، کە هیچ کەسێك لەو دەوروبەرە تێنەدەگەیشت لە ئێلەکی سپی لەبەرکردن

بە ڕۆژانی یەکشەممەوان جگە لە دەرمانسازەکە نەبێت.

تەماشاکە ! شتەکە بەو شێوەیە ڕوویدا. کە بەیانییەکی ڕۆژی یەکشەممە تەق تەق لە دەرگاکەم درا. منیش کردمەوەو. دەرمانسازەکە ئا لەوێدا بە ئێلەکێکی سپییەوە لە دەرەوە ڕاوەستابوو، چەند جارێك سووژدەی برد. ئەو زۆر بە ئەدەب و زۆریش شەرمن بوو.

وتی: من زۆر بەخۆکەمزانییەوە داوای لێبوردنت لێدەکەم. بەڵام ئێریکاخان دوێنێ لەگەڵ خوشکەکانیدا لێرە بوون، لە کاتێکدا کەندیدات[2] کە لێرە نەبوو. ئێریکا ڕۆشت و کتێبی شیعرەکانی خۆی بۆ بەجێهێشتین بۆ ئەوەی من و کاندیدات شتێکی بۆ بنووسین، ئەویش ئەمەتا، بەڵام من بە هیچ جۆرێك نازانم چی لەنێودا بنووسم، دەکرێ کەندیدات بتوانێ..؟

وە چەند جارێکی تر دووبارە سووژدەی بردەوە.

من بە دۆستانەوە وەڵامم دایەوە: ئێمە پێکەوە بیر لە شتێك دەکەینەوە.

ئیتر من کتێبەکەم لێ وەرگرت و بۆ بەشی خۆم وەرگێڕانێکی *"Du bist wie eine blume"*[3]م نووسی کە خۆم وەرمگێڕابوو وە هەمیشە بۆ ئەو مەبەستە بەکاریدەهێنم. پاش ئەوە دەستمکردە گەڕان بەنێو لاپەڕەکانمدا، بۆ ئەوەی کە ئەگەر ڕێی تێدەچێت ببینم کە من هەندێ کۆپلە شیعری کۆنی سەردەمی قوتابخانەم هەبێت، کە دەکرا جێگای خۆی بگرێت بۆ دەرمانسازەکە. تا لە کۆتاییدا ئەم شیعرە خراپەی خوارەوەم دۆزیەوە:

تۆ سەرکێشکە بۆ مزرەکانم دێنێت.
یاد دەکەم یادەوەرییەکەم خواردنە.
کاتێ تۆ دێیت، من تەنیام
—من ئەمشەو خەونم پێتەوە بینی.

شان بەشانی یەکترەوە پێکەوە ڕۆیشتین
بۆ پێشەوە، بە ڕێگای خۆرئاوا بووندا.
لە برژانگەکانتدا
دڵۆپێك فرمێسك، یەك چرووسکانەوە یەکگرتوو.

گۆنام ماچکرد، وە لەنێو چاوەکانتدا
پاشماوەی فرمێسکەکانتم بە ماچ لابرد،
بەڵام لێوە سوورەکانی تۆم
لەهەر هەموویان زیاتر ماچکرد.

پیاو هەردەم خەونی خۆش نابینێت !
—بەڵام من خەونەکەم لەدەست دەرچوو.
سەعاتە دوورو درێژەکانی ئەو شەوە
بە ماندووێتی و بێزاری بەشەوارە کەوتم.

گۆنا نەرم و نۆڵەکانت
بە بێدەنگی، بەنیگاکانم کەوتمە دەستبازیکردن
لە گەڵیاندا،
وە لێوە سوورەکانت،
کە هەرگیز ماچم نەکردبوون.

ئەو شیعرەم پێشانی دەرمانسازەکە داو ڕێگەم پێدا بۆ ئەوەی بەکاری بهێنێ، دووجار بە سەرنج ڕاکێشانێکی زۆرەوە سەرتاپای خوێندەوەو لە تامەزرۆیدا سوور بووەوە.

بە دڵێکی ڕاستگۆیانەوە لێی پرسیم:

—ئایا کەندیدات، بە ڕاستی خۆی ئەوەی نووسیووە؟

—بەڵێ، بەداخەوە.

ئەو بۆ ڕێگەپێدان و بەکارهێنانی ئەو شیعرە، زۆر بەگەرمییەوە سوپاسی کردم، ئەوجا لە ژوورەکە چووە دەرەوە. من لەو باوەڕەدا بووم کە

هەردووکمان هەستێکی وامان لەلا دروستبوو کە هەر بەیەکجاری وشەی ڕێزی ناونان بەلاوە بنێین.

*

بۆ ئێوارە، دایك و باوکی کیژۆڵە، بانگێشکردنێکی بچووکی کردین بۆ ماڵەوە، کەسانێکی مەرزەکاری لێبوو. شەربەتی گێلاسمان خواردەوە، لە هەیوانێك بەمارچێوە[4] دەورە درابوو.

دانیشتبووم و تەماشای ئەو کچە لاوەم دەکرد.

نەخێر، ئەو بەخۆی نەدەکرد. چاوەکانی لەباری ئاسایی گەورەتر و نیگەرانتر بوون، دەمی سوورتر بوو. وە نەیدەتوانی لەسەر کورسییەك ئۆقرە بگرێت.

کچەکە جارجارە بەدزییەوە تەماشای دەکردم، بەڵام بە زۆری تەماشای دەرمانسازەکەی دەکرد کە ئەو شەوە هەر لە کەڵەشێرێك دەچوو.

کاتێ "پونش" هاتە پێشەوە، ئێمە وشەی ڕێزمان بەلاوە نا.

*

ئێمەی لاو دەچووینە سەر مێرگەکان بۆ ئەوەی یاری بکەین. ئەڵقەمان فڕێدەداو و یاری ترمان دەکرد. لەو ماوەیەدا خۆر کەم کەم دەچووە خوارەوە بۆ پشت گردەکان و دونیاش لێڵ دەبوو.

ئێمە ئەڵقەکان و شیرەکانمان لەسەریەك لەسەر زەوییەکە کەڵەکە کرد. ئەو کاتە بەچەند گروپێك راوەستابووین و دەمانچرپاند و پێدەکەنین، بەڵام کاتێ خۆرئاوابوو، کیژۆڵەکە هات بۆ لام و قۆڵی گرتم و بردمییە ئەولاوە بۆ پشت کادانێکەوە.

کیژۆڵەکە وتی: تۆ پێویستە وەڵامی پرسیارێکم بدەیتەوە. ئایا دەرمانسازەکە بە راستی خۆی بەیتە شیعرەکانی خۆی نووسیووە؟ ·

لەکاتی قسەکردندا بەتەواوی دەنگی کەوتە لەرزین و هەوڵیدا تەماشای لایەکی تر بکات.

من وتم: بەڵێ، دوێنێ شەو نووسی، من گوێم لێبوو کە هەموو شەوەکە، لە ژوورەکەیدا دەهات و دەچوو.

هەر لەگەڵ وتنی ئەم قسەیەدا، هەستم بە چزەیەك کرد لەناو دڵمدا لەبەرئەوەی بینیم، کیژۆڵەکە کە وەك منداڵ لەدڵدا شیرین و جوان بوو. گوناه بوو بەو شێوەیە فریوی بدەیت.

–کێ چووزانێ، لەوانەیە ئا ئەمە گوناه بێت، کە لە کتێبی ئاسمانی دەربارەی نووسرابێت، کە ئەم گوناهە لێخشبوونی نییە.

*

خۆرئاوابوونەکە زیادیکرد کردی بە شەو، ئەستێرەیەك لە نێوان دارستانە تازەکە داگیرسابوو، لەوێدا ئێمە دوو دوو دەڕۆیشتین.

بەڵام من تەنیا بووم.

بەتەواوی بە بیرمدا نایەت، ئەو ئێوارەیە چ ڕێگایەکم گرتەبەر. خۆم لەوانی تر جیاکردەوەو بۆ نێو قووڵایی دارستانەکە ڕۆیشتم.

لە قووڵایی نێو دارستانەکە، لەنێو دارکاژەکاندا، دار بێتولا[6]یەکم بەدیکرد، قەدەکەی سپی دەدرەوشایەوە. بە تەنیشت قەدی ئەو دارەوە دوو مرۆڤی لاو وەستابوون و ماچی یەکتریان دەکرد. من بینیم کە یەکێك لەوانە، کیژۆڵەکە بوو کە بۆنی کاژستان و خلینجی لێدەهات. ئەوەکەی تر دەرمانسازەکە بوو بە قەدە سپییەکەی داربێتولاکەوەو ماچیدەکرد.

بەڵام کە کوڕەکە فریای سێیەمین ماچی کەوت، من لێیان دورکەوتمەوەو ئەشکی تاڵم ڕشت.

**پەراوێز:**

1- *"ljung"*: نیمچە دەوەنێکە کە بە لاتینی پێی دەوترێت *"Calluna vulgaris"*.

*2- "Kandidat": ناوزەد کراو بۆ پایەیەک یا کارێک یاوەکو پلەیەکی خوێندن.*

*3- کۆپلە شیعرێکی "هاینە"ی شاعیری ئەلمانییە لەنێو شیعری "Buch der Lieder"دا.*

*4- "Humlerankor": تەرزی مارچێوە.*

*"Humle": ڕووەکێکی بالابەرزو خۆپێچکەرە بە شتی کەوە، هەردەم بەلای ڕاستەوە خۆی دەچەمێنێتەوە. بە لاتینی پێی دەڵێن: "Humlus Lupuls".*

*5- "bojork": دارێکە کە لە سویددا پێنج جۆری هەیە، وە بە لاتینی پێی دەوترێت "Betulaceae".*

## نەباران

**(1897)**

دووبارە پایزەو ڕۆژانی تاریك، خۆیش لە تاریکترین گۆشەی گەردووندا خۆی دەشارێتەوە. بۆ ئەوەی هیچ کەسێ لەم کاتانەی دواییدا نەتوانێ ئەوە ببینێت کە چەندە بێرەنگ و بەساڵاچووەو ڕەق و تەق بووە. بەڵام لە هەمان کاتدا کە "با"یەکە لە درزی پەنجەرەکانەوە دەیگڵاند و بارانیش بە مەرزیبەکاندا خوڕەی دەکردو سەگێکیش لە خوارەوە لەسەر شەقامەکە، لەبەر دەروازەیەکی داخراودا دەقروسکایەوە. وە پێش ئەوەی یەکەم ئاگری پایز لە موغەیری[1] کڵێسەکەماندا گڵکۆی دامرکێتەوە، دەمەوێت سەرگوزشتەیەکتان دەربارەی نەباران بۆ بگێڕمەوە.

وە ئێستا گوێبگرن:

ئەو خوایە چاکە، پێش ماوەیەك بەر لە ئێستا، لە بەرامبەر خراپەی مرۆڤەکان بێزار بووبوو. جا بڕیاریدا کە سزایان بدات بەوەی کە هەندەی تر خراپیان بکات. لە هەمووی لە پێشتر، لە گەورەیی خۆیدا دەیویست لە لافاوێکی نوێی وەکو لافاوی نوح سەرلەبەریان بخنکێنێت. ئەو ئەوەی لە یاد نەکردبوو کە بینینی ئەو کارە چەند دڵخۆشکەر بوو، ئەو کاتەی کە هەموو گیانلەبەران لەنێو لافاوێکدا تیاچوون. بەڵام ئەفسووس، کە ئەو جارێکیان لە ساتێکی پڕ سۆزدا پەیمانی بەنوح دا کە هەرگیز شتی وا نەکاتەوە.

ئەو ڕۆژێکیان بە شەیتانی وت: گوێبگرە، هاوڕێم! بێگومان تۆ کەسێکی پیرۆز نیت، بەڵام هەندێ جار بۆچوونی چاکت هەیە، وە پیاو دەتوانێ ڕات لەگەڵدا بگۆڕێتەوە. مرۆڤەکان خراپن و ناشیانەوێت خۆیان چاك بکەن. ئارام گرتنی من کە بێ کۆتاییە، وا ئێستا کۆتایی هات. وە من بڕیارمداوە کە سزایان بدەم بەوەی کە لەوە خراپتریان بکەم. وە لە ڕاستیدا من هیوادارم، کە ئەوان ئەوکاتە یەکتری و تەنانەت خودی خۆشیان لەناوبەرن. من وای بۆ دەچم، کە هەروەکو لە بەرژەوەندی هەردوولامانە - دەنا بەتەواوی لەیەك جیاوازین- بەڵام ئا لەمەدا بۆ یەکەمجار خاڵی بەریەککەوتن بدۆزینەوە؛ چی ڕێنماییەکت هەیە بمکەیت؟

شەیتان لە ئەندێشەکردندا قەپی لە کلکی خۆی دەگرت، لە کۆتاییدا وەڵامیداوە:

-گەورەم، زانایی تۆ بە هەمان قەبارە گەورەیە هەروەك چاکەت، ئەژمار ئەوە نیشاندەدات، کە زۆربەی ژمارەی تاوانەکان لە پایزدا ڕوود ەدەن. ئەو کاتە ڕۆژەکان تاریکن و ئاسمانیش لێڵ و هەوریش لە دووتۆی باران و تەمومژدا بە ڕاکشاوی پێچراوەتەوە.

ئەو خودایە چاکە ماوەیەکی درێژ بیری لەم وشانە کردەوە، لە کۆتاییدا وتی:

-من تێدەگەم، ئامۆژگارییەکەی تۆ باشە، بە قسەت دەکەم، تۆ خەڵاتی بەنرخت هەیە، هاوڕێم، بەڵام دەبوایە تۆ چاکتر ئەوانەت بەکاربهێنایە.

شەیتان زەردەخەنەیەکی هاتێ و کلکی بۆ لەقاند، چونکە پیاهەڵدانی خوا کاری تێکردبوو، پاشان بە شەلەشەل گەڕایەوە بۆ ماڵەوە.

بەڵام ئەو خوایە چاکە بە خودی خۆی وت:

–لەمەولا هەردەم دەبێ نمە باران ببارێت، هەور هەرگیز لانەچێت، لەمەودوا خۆر هەرگیز هەڵنەیەت، هەردەم دەبێ تاریک نووتەك و لێڵ تا دوایی رۆژەکان.

وە ئەمەش وابوو.

چەتر دروستکەرەکان و خاوەنی فابیرکەی گالۆشەکان، لە سەرەتادا کۆڵێ دڵیان خۆش بوو، بەلام زۆری نەخایاند، کە سەرسوڕمان لە دەورووبەری لێوەکانیان رەقەوە بوو. شادمانەکان بەوە دلگران بوون. دلگرانەکانیش شێت بوون و بە ریزی درێژ خۆیان دەدا بە داردا یان کۆدەبوونەوە بۆ ئەوەی زیکر دابەستن. وە لەمەودوا ئیتر کەس ئیشی نەدەکرد، بەمە پێویستییەکانیان زیاد دەبوو. تاوانەکان لە رێژەیەکی سەرگێژکەردا لەبن نەدەهاتن. بەندیخانەکان لە رادەبەدەر پڕبووبوون. شێتخانەکان تەنها بەشی ئەوانەی دەکرد کە ژیر بوون. ژمارەی زیندووەکان لە کەمبووندا بوو، وە خانووەکانیان بە جێهڵراوی مابوونەوە. سزای هەڵواسینیان دەسەپاند بەسەر خۆکوشتوواندا. هیچ شتێك یارمەتی نەدەدان.

مرۆڤایەتی، ئەوە لە دوای ئەوە خەونی دەبینی و بەسەر بەهارێکی هەتاهەتاییدا شیعری هەڵدەدا، ئێستا وا لە دوا کاتەکانیدا بەرەو رووی پاییزێکی هەتاهەتایی دەڕوات.

رۆژ لەو دوای رۆژ هەرەس و وێرانکردنەکان دەهاتە پێشەوە. ناوچە دووردەستەکان بوون بە شوێنەواری کۆن، شارەکان کاول بوون. سەگەکان لە بازاڕەکاندا کۆدەبوونەوەو دەیانقروسکاند. بەلام بە چەپەرەکاندا پیاوێکی پیرو شەل رێی دەکرد و ماڵ بە ماڵ دەڕۆیشت و جاخێکی بە کۆڵەوە بوو رۆحەکانی کۆدەکردەوە. وە هەموو ئێوارەیەك بە توورەکەیەکی پڕەوە دەچووەوە بۆ ماڵەوە.

بەلام ئێوارەیەکیان بە شەلەشەل نەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، لە جیاتی ئەوە بۆ دەروازەی وڵاتی ئاسمان راستەوراست رۆشت و بەرامبەر تەخت و تاراجی خوای چاك. ئالەوێدا راوەستاو کڕنووشی بردو وتی:

–گەورەم! تۆ لەم ماوەیەی دواییدا چوویتەتە ساڵەوە، ئێمە هەردووکمان چووینەتە ساڵەوە. هەر لەبەر ئەوەشە کە وای لێهاتووە کە بێزارییین. ئای گەورەم! ئەوە رێنماییەکی خراپ بوو کە من دام بە تۆ. ئەو گوناهانەی کە لەلای من گرنگن، جاریەجارێك پێویستیان بە چکێك خۆرە، بۆ ئەوەی دڵیان بکرێتەوە. سەیری ئێرە بکە، تۆ منت کرد بە پەڕۆشێ کۆکەرەوەیەکی بێ کەڵك.

لە دوای ئەو وشانە یەکسەر توورەکە پیسەکەی بەگوڕێکەوە بەرەو پێپلیکانەکانی تەخت و تاراج تووڕدا، پەتی توورەکەکەی پچڕاو رۆحەکان بەباڵ لێهاتوویی هاتنە دەرەوە، ئەوان رەش نەبووبوون بەلکو بۆر.

شەیتان وتی:

–ئەمانە رۆحی درا مرۆڤەکانن؛ گەورەم! من بە تۆیان دەبەخشم. بەلام چاك ئاگات لە خۆت بێ بەوەی گەر بێت و بۆ خۆت بەکاریان بهێنیت بۆ مەبەستی مێنانەکایەی جیهانێکی نوێ تر.

*

"با"یەکە لە درزی پەنجەرەکانەوە دەیگڤاند و بارانیش بە مەرزیبەکاندا خووڕەی دەکرد. ئێستا سەرگوزشتەکە کۆتایی هات. ئەوەی کە لەمە تێگەیشتووە. دەتوانێ دڵی خۆی بەوە خۆشبکات کە بەیانی ئاو و هەوایەکی خۆش دەبێت.

**پەراوێز:**

*1–موغەیری: ژوورای لەنێو دیوار دروستکراو.*

## کوشتن

**(1897)**

ئەوە نووسراوە: تۆ نابێ بە مەبەست بکوژیت.

ئێمە بە دڵنیاییەوە دەزانین کە زۆر جار کوشتن شتێکی ناچارییە. بەڵام رەنگە هێشتا شتێك لەو قسە کۆنەدا هەبێت. سەرەڕای چەند چینێك لە تۆز، کە باری هەمیشەیی جەنگ لە ماوەی تێپەڕبوونی ساڵەکاندا پێڕاگەیشتووە کە بەسەر ویژدانماندا بنیشێتەوە، بەڵام هێشتا هەندێ جار ئەوە روودەدات کە هەست بە تەزێك بکەم، ئەو کاتانەی بیر لە هەندێ لەو کوشتنانە دەکەمەوە کە من پێی هەستاوم. من هەموویانم بە بیردا نایەت و هەندێکی تریشیان کە هەستدەکەم پێویستیەك بوون، لەبەرئەوە لە بارەی ئەوانەوە هەست بە هیچ پەشیمانییەك ناکەم.

بەڵام لە ناو ئەوانەدا کە لەبەر بەدی کوشتوومن یاخود بێ زەوق، لە پێش هەموویانەوە باڵندەیەکی چکۆلانە بوو، جاڵجاڵۆکەیەك و رێوییەکم بەبیردا دێتەوە.

*

زۆربەی منالان دڵڕەقن. ئەو کاتەی کە منداڵ بووم، هەستان و دانیشتنم لەگەڵ کوڕێکی منداڵکارەدا بوو کە لە من دڵڕەقتر بوو. هەر ئەو بوو کە بە دار لاستیك فێری بەرد هاویشتنی کردم. ئەو کاتەی کە پشووی هاوین هات، هەموو رۆژێ بە خۆمان و دارلاستیکەوە دەچووینە ناو دارستان، نەماندەتوانی باڵندەیەکی چکۆلانە ببینین، کە بەسەر چڵە دارێکەوە نیشتبێتەوە و بجریوێنێ، بەڵکو یەکسەر بەردێکمان دەخستە بەر ناوکەفی دارلاستیکەکەوەو تێمان دەگرت. بەڵام بەردەکە بە نزیکیش بەلایدا نەدەچوو. باڵندەکان هەروەکو هەموو گیانلەبەرەکانی تر فێری ئەوە بووبوون کە لە مرۆڤ خۆیان بپارێزن. وە ئێمە هاکا فریای نیشانگرتنەوە نەدەکەوتین کە باڵندەکە پێشتر لەنێو شینایییەکەدا ون دەبوو. وە ئەم بێبەختییە بەردەوامەش لە رادە بەدەر دڵڕەقتری کردین، تا وای لێهات کوشتنی باڵندەیەکی چکۆلانە بۆ ئێمە هەروەکو مەسەلەی شەرەف تەماشادەکرا، بەهەر شێوەیەك بێ دەبوایە روویدات.

ئەوەش رۆژێ روویدا –لەنێو دارستان نەبوو، بەڵکو لە سووچێکی باخچەکەدا بوو، کە بەشێك بوو لەو پارچە زەوییەی کە هی ئێمە بوو– ئێمە لەنێو دەوەنێکدا چاومان بە بێچووە باڵندەیەك کەوت، کە هێشتا فێری فڕین نەبووبوو، بەڵکو تەنیا دەیتوانی لە چڵێکەوە بۆ چڵێکی تر خۆی هەڵبدات. ئێمە بەبێ ئەوەی بۆ چرکەیەکیش بیربکەینەوە، ئەوەندەی پێمانکرا دزەمان کردە نزیکییەوەو بە بەردی دارلاستیکەکان تێمان تەقاند. بێچووە باڵندەکە کەوتە سەر زەوی؛ بەڵام ئەو هێشتا بەتەواوی گیانی دەرنەچووبوو، بەڵکو لەنێو سەوزەگیاکەدا بە دەنووکی داچەقیووەوە کەوتبوو. لەناو دەنووکیدا ئەو زمانە چکۆلانەیەی دەجووڵاندەوە. چاوەکانیشی هێشتا دەژیان. بە سەرلێشێواوی راوەستابووین. لە شەرمانا هەردووکمان وەکو تەماتە سووربووبووینەوەو تەماشای یەکتریمان دەکرد. چی بکەین؟ ئایا ئەم بکوژین؟ وە پاشان چی لە چۆلەکەیەکی چکۆلانەی مردوو بکەین؟

هاوڕێکەم وتی:

–هاکا بۆ خۆی گیانی دەرچوو.

من وەڵامم دایەوە:

–بەڵێ، ئەو ناتوانێ زیاتر بژی.

ئێمە هەستمانکرد، کە هیچ یەکێ لە ئێمە ئیتر نەیدەوێرا دەستی لێوە بدات.

خۆرەکە جارێ نەچووبووە نێو هەورەکانەوە، باڵندەکانیش لەناو دارستانەکەدا دەیانخوێند. بەڵام ئێمە بۆ دوور دوور رۆیشتین بەبێ ئەوەی تەماشای

یەکتری بکەین. وە ئێمە هەرگیزاو هەرگیز لە پاش ئەوە لە سووچی ئەو باخچەیەدا یاریمان نەکردەوە.

*

بۆچی جاڵجاڵۆکەکەم کوشت؟ ئەوەیان دڵڕەقی نەبوو، دژەکردارێکی تەواو بوو، چونکە ئەو ترساندمی. ئەوەیان لە هامبۆرگ روویدا. لە ژووری ئوتێلێکدا بەتەنیا دانیشتبووم و کتێبم دەخوێندەوە. رووناکییە کارەباییەکە بە سپێتی و ساردییەکەوە بەردەبووە سەر لاپەڕە سپییەکانی نێو کتێبەکەم. هەموو گڵۆپە خڕەکانی ژوورەکەم هەڵکردبوو. دەورووپشتم بێدەنگ بوو. هیچ دەنگێك لە هیچ شوێنێکەوە نەدەهات جگە لە کاتژمێرە پەندۆڵدارەکە نەبێ کە بەسەر مووغەیرییەکەدا دەیچرکاند، هەروەها دەنگی لاپەڕە کتێبەکە کە هەڵمدەدانەوە. ئەو ئێوارەیە، ئێوارەیەکی تەمومژاوی بوو. هەرچی هەڵمی پیسی شارەکە بوو خۆیان دەخزانە نێو ژوورەکەمەو دەمڕوانییە: ئەو ئالستەر[1]ە مردوو و چۆڵ و هۆڵەی نێو تەمومژەکە، مەشخەڵە گازییەکانی سەر پردی لۆمباردبردویك[2]..

لەپڕ هەستم بە شتێك کرد، کە خۆی دەدا بەسەر دەستمدا. ئەوە جاڵجاڵۆکەیەکی گەلێك گەورە بوو،کولکن و قەڵەو، کە بەسەر دەستمدا دەخزا بۆ ناو کتێبەکەی کە دەمخوێندەوە. کاتێ زانی کە من لێی ورددەبمەوە، دەستیکرد بە راکردن. لەسەر کورسییەکەم بەرزبوومەوەو کتێبەکەم تووڕدا، لە ترساندا رەنگم زەرد بوو. بەڵام جاڵجاڵۆکەکە پێشتر فریای ئەوە کەوتبوو کە بە یەکێ لە قاچەکانمدا هەڵکشێتە سەرەوەو دابەزێتە خوارەوە بۆ سەر زەوییەکە. هەروەك گڵۆلە بەنێك بەخێراییەکی زۆرەوە بەنێو ژوورەکەدا غل ببووەوە، هەروەکو بڵێی ئاگر بە قاچەکانی دواوەی کەوتبێت. من پێویستە ئەو بکوژم. من ئەوەم بە مافی رەواو ئاسایی خۆم زانی.

کتێبەکەم لەسەر زەوییەکە هەڵگرتەوەو کێشام بە سەریدا و فلیقاندمەوە.

ئەوە چییە، ئایا هیچ دەسەڵاتێکی کۆنینەی ئاسمانی نییە کە رێگەی ئەوە بدات، کە مرۆڤ هەرگیز بۆی نەبێت کە جاڵجاڵۆکەیەك بکوژێت؟

نەموێرا دەست بدەمەوە لە کتێبەکەو دوای ئەوە هەرگیزاو هەرگیز ئەو کتێبەم نەخوێندەوە.

پێویستە من کەسێك ببینم.. بەرەو دەرگاکە چووم و زەنگم بۆ خزمەتچییەکە لێدا.

ئەوجا ئەو هات و من بەسەرسوڕمانەوە تەماشایم کرد، پێش ئەوەی خۆم ئامادەی شتێك بکەم:

—هەندێ ویسکیم بۆ پەیدا بکە.

*

رێوییەکەم کوشت، چونکە تفەنگێکم بەدەستەوە بوو، ئەوکاتەی کە بەرەو رووی بوومەوە. بێ چەندو چوون ئەوە هاتە پێش چاوم کە دەبێت رێوییەك بکوژم گەر لە دارستاندا هاتە سەر رێگام و منیش تفەنگم بەدەستەوە بێ.

ئەوە لە وەرزی زستاندا بوو. هەموو رۆژێ بەفر دەباری و دەچوومە نێو دارستانەکە، بە تفەنگێکی خراپ و کۆنەوە، لەگەڵ پویدل[3]ە رەشەکەمدا کە ناوی گوستاف بوو. من راوم نەدەکرد. بەڵکو نیشانەم لە بەری دار کاژەکان دەگرت بۆ کات بەسەربردنی خۆم و دڵی گوستافیش خۆش بکەم، ئەو لەگەڵ هەر تەقەیەکدا هەڵدەبەزییەوە بە کەیفی تەقەکان دەوەڕی، تەقەکە نەیدەترساند، چونکە ئەو هێشتا فێری ئەوە نەبووبوو کە تفەنگ ئامرازێکی کوشندەیە.

رۆژێکیان، کاتێ دونیا تاریك بوو، بەرەو رووی رێوییەکی چکۆلانە بوومەوە. رێوییەکە وەك بڵێی بۆ شت کڕین لەنێو ئاواییەکە بوو، وە ئێستا لەگەڵ مریشکێکی چینچیناوی بەبەر شەویلگەیدا دەچووەوە

بۆ ماڵەوە. من، خۆم لە پشتی دارێکەوە شاردبووەوە، ئەویش بەبێ ئەوەی بمبینێ بە راکردن بەلامدا تێپەڕی. میلم لێهێنایەوە یەك و نیشانەم لێگرتەوەو تەقاندم. بۆچی؟ ئیتر ئاوا.

رێوییەکە هێشتا چەند هەنگاوێك بەرەوپێش هەر رایدەکرد بەشێوەیەك وەك ئەوەی هیچ شتێك روونەدابێ. پاش ئەوە یەکسەر لەپڕ لە جێگەی خۆیدا راوەستاو مریشکەکەی لێکەوتەخوارەوە. بە دەنگێکی لاوازی، قوێڕەیەکی ترسێنراوی لێهات و لەناو بەفرەکەدا خۆی درێژکردو مرد. گوستاف، پویدلە رەشەکەم، کە هێشتا تا رادەیەك توتك بوو، تاسەیەکی شێتانەوە بەرەو لای تەکانیداو، بە شادمانترین وەڕینەوە، وە بە گاڵتەکردنەوە بە یەکێ لە گوێیەکانی رێوییەکەدا مشەی کرد. بەڵام لەو چرکەساتەی دوای ئەوەدا یەکسەر تێگەیشت کە ئەو گیانلەبەرە نامۆیە مردووە. نیگایەکی پڕ لە شەرم و پرسیارێکی لە بن نەهاتوو لە چاوە رەشە بریقاوەکانیەوە دەهات. لە کۆتاییدا بە کلکی شۆڕەوە دزەی کردە تەنیشتمەوە و لەسەرەخۆ دەنووزایەوە.

رێوییەکەم بە کەوتوویی لەوێ بەجێهێشت و چوومەوە ماڵەوە، چونکە سەرمام بوو.

بۆ رۆژی دوایی بەهەمان توولەڕێدا رۆشتم، چونکە ئەوە خۆشەویسترین رێگای من بوو بە دەم فیکە لێدانێکی نەرمەوە، بۆ پێشەوە بەهەمان تولە رێگادا رێگام دەبڕی، وە بە هیچ شێوەیەك بیرم لە رووداوی رۆژی رابردوو نەدەکردەوە. یەکسەر راچڵەکیم و لەجێگای خۆم راوەستام. لەسەر زەوییەکەی بەردەممدا، رێوییەکی مردوو کەوتووە، قەلەڕەشکەکان دەنووکیان گیرکردووە لە چاوە پڕ خوێناوییەکەی، ئەمدیو ئەودیویان کردبوو.

بۆ ساتێك راوەستام و دەمڕوانییە رێوییەکە، لەو کاتەدا گوێم لە دەنگی دوو لقەدار بوو کە "با"یەکە دەیکێشان بەیەکتریدا.

بەخۆم گوت:

–رێوییەکی زیندوو جوانترە لە رێوییەکی مردوو.

پاش ئەوە بە شوێن رێگایەکی تردا دەگەڕام.

**پەراوێز:**

*1– "Alster" ئوتێلێکە لە شاری هامبۆرگ و دەڕوانێتە سەر پردی "Lombardbrucke".*

*2– "Lombardbrucke": پردێکە لەنێو شاری هامبۆرگدا.*

*3– "Pudel": جۆرێکە لە جۆرەکانی سەگ، تووکەکەی گڵەو لە بنەڕەتیشدا سەگێکی ئاوییە بەڵام لەبەرئەوەی تووکەکەی دەئاڵۆسکێ، نایەڵن بچێتە نێو ئاو. تووکی قەڵەم دەکەن بەشێوەیەك کە لە پێشبڕکێی جوانی سەگدا زۆر پێشچاو دەکەون و سەگێکی پێشچاون.*

## ماچەکە

**(1903)**

جارێك لە جاران کیژۆڵەیەك و کوڕێکی زۆر لاو هەبوو. هەردووکیان لەسەر بەردێك لە تەنیشت نیوە دوورگەیەکی چکۆلانە دانیشتبوون. کە لەنێو دەریاچەکە دەرپەڕیبووە دەرەوە. وە شەپۆلەکان هەتا بەرپێی ئەوان شڵپ و هوڕیان دەکرد. ئەوان بەبێ دەنگی دانیشتبوون. هەریەکە و لە هزری خۆیدا و تەماشای ئاوابوونی خۆریان دەکرد.

کوڕەکە بیری لەوە دەکردەوە کە زۆر بەشادمانییەوە دەیەوێت ماچی کچەکە بکات. لەکاتێکدا زۆر بە مەبەستەوە سەیری دەمی کیژۆلکەی دەکرد. بێگومان ئەو گەلێ کیژی جوانتری لەو کیژۆڵەیە بینیووە، وە لە راستیشدا ئەو دڵی بە کیژێکی ترەوە بوو. بەڵام ئەو کیژە ئەوە هەرگیز بۆی نییە ماچی بکات. چونکە ئەو دەگمەنەو

ئەستێرەیەکەو "*Die sterne, die begehitman nicht*"[1].

کیژۆڵەکە بیری دەکردەوە، کە ئەو زۆر بە شادمانییەوە دەیەوێت کوڕەکە ماچێکی بکات بۆ ئەوەی بواری ئەوەی بۆ بڕەخسێت کە بە راستی خۆی لێ تووڕە بکات و ئەوەی پێ نیشان بدات کە چەند بەقووڵی بێزی لێدەکاتەوە. ئەوجا هەستێتە سەرپێ و تەنوورەکەی بتالێنێ بەخۆیدا و نیگایەکی وەك سەهۆڵ ساردی تێ بگرێت و بەجێیبهێڵێت، رێك و هێمن بێ پەلەکردن.

بەڵام بۆ ئەوەی کوڕەکە نەزانێ کە ئەم چۆن بیری کردووەتەوە، بە هێمنی و لەسەرخۆ وتی:

–باوەڕت هەیە کە ژیانێکی تر هەبێ لەدوای ئەم ژیانە؟

کوڕەکە بیری کردەوە، کە ماچ کردنی کیژۆڵەکە ساناتر دەبێ ئەگەر بە بەڵێ وەڵامی بداتەوە. بەڵام ئەو بەتەواوی بیری نەکەوتەوە کە لە ساتێکی تردا چۆن وەڵامی پرسیاری وای دەدایەوە. وە زۆر لەوە دەترسا کە بکەوێتە نێوان دوو دژە رادەربڕینەوە. بۆیە بە قووڵی سەیرێکی چاوەکانی کچەکەی کرد و وتی:

–کاتی وا هەیە کە بەڵێ باوەڕم وایە.

ئەو وەڵامە لە رادەبەدەر خۆشیدا بە کچەکە، بۆیە وات بیری کردەوە کە هەرچەند بێ حەزی لە قژێتی و هەروەها نێوچاوانی بەڵام ئەوە حەیفە کە لووتی ناشرینە، وە هەروەها هیچ پایەیەکی نییە، تەنها قوتابییەکەو شتێکی دێوانەیی دەخوێنێ، ئەو زاوایەکی وا نییە کە کیژەکە بیەوێت دەستەخوشکەکانی پێ تووڕە بکات.

کوڕەکە بیری دەکردەوە: کە ئێستا بە دڵنیاییەوە دەتوانم ماچی بکەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە رادە بەدەر دەترسا ئەو هەرگیز لەمەوپێش هیچ کیژی خێزانێکی خانەدانی ماچ نەکردووەو تۆ بڵێی ئەوە شتێکی ترسناك بێت. باوکی کیژەکە، تۆزێك لەولای ئەوانەوە، لەسەر بەڕەیەك نووستبوو. وە ئەو سەرۆکی شارەوانی شارەکە بوو.

کیژەکە بیری دەکردەوە، کە لەوانەیە، ئەگەر ئەو ماچی کردم، ئەوا شەقازللەیەکی لێ بدەم.

دیسان بیری کردەوە: بۆچی ماچم ناکات" ئایا من ناشرین و قێزەوەرم؟

کیژەکە خۆی بۆ پێشەوە چەماندەوە بۆ سەر ئاوەکە بۆ ئەوەی خۆی بداتە بەری، بەڵام وێنەکەی ئەو لەنێو شڵپ و هۆڕی شەپۆلەکاندا تێکشکا.

کیژەکە بەردەوام بوو لە بیرکردنەوە: من بیر لەوە دەکەمەوە دەبێ هەست بەچی بکەم کاتێك ئەو ماچم دەکات. لە راستیدا کیژەکە یەك جار ماچ کراوە، ئەوەش لەلایەن ئەفسەرێکی نمرە یەك بوو لە پاش ئاهەنگێکی سەما، لە ئوتێلێکی شارەکەدا. بەڵام ئەفسەرەکە هێندە بۆنی ناخۆش بوو بە پونش[2] و سیگار. وە ئەوە بێگومان کەمێك نازی دابووە کچەکە چونکە ئەو هەرچۆنێ بێ ئەفسەر بوو. بەڵام دەنا ئەو ماچە بەلای کچەکەوە شتێکی وا نەبوو کە باس بکرێت چونکە کچەکە دوایی رقی زۆر لێ بوو لەبەرئەوەی کە ئەفسەرەکە داوای دەستی نەکردو بەجۆرێك لە جۆرەکان گوێی بەم زۆر نەدا.

لەو کاتەدا کە ئەوان ئاوها دانیشتبوون و هەریەکە لە هزری خۆیدا، خۆر ئاوابوو، دونیاش لێڵ.

کوڕەکە بیری دەکردەوە: لەبەر ئەوەی هێشتا ئەو بە دانیشتنانەوە بە تەنیشتییەوە ماوەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا خۆرئاوا بووەو دونیا تاریك داهاتووە، ئیتر خۆ لەوانەیە وا روویدات کە کچەکە هێندە دژایەتی نەبێ بەرامبەر بەوەی من ماچێکی بکەم.

کوڕەکە زۆر لەسەرخۆ قۆڵی خستە سەر ملی کچەکە.

ئـا ئەمـە بـەهیچ جۆرێـك كچەكـە بـیری لێ نـەكردبووەوە، وە ئـەو لـەو بـاوەڕەدا بـوو كـە بـەبێ چەندو چوّن كوڕەكـە هـەر مـاچێكی بكـات وە ئیـتر ئەویش شەقازللەیەكی لێبدات و وەكـو كچە پاشـایەك ڕێگەی خۆی بگرێتەبەر ئـەوا ئێستا ئیـتر ئـەو نازانێ چی بكات؛ بێگومان دەیویست خۆی لێ تووڕە بكـات، بەڵام لە هەمان كاتدا نەیدەویست ماچەكـە لەدەستی خۆی بدات. بۆیە بەتەواوی سڕبوو.

ئەوجا كوڕەكە ماچێكی كرد.

كچەكـە زۆر سـەیرتر هەسـتی بـە ماچەكـە كـرد لەوەی لە پێشدا لە باوەڕیدا بوو. هەستی كرد كە بـێ ڕەنگ و مات بووە. وە ئەوە هەر بـە تـەواوی ئـەوەی لەبیركرد كـە دەبوایـە شـەقازللەیەكی لێبدات چونكـە ئـەو تەنـها قوتابییـەك بـوو كـە شـتێكی دێوانـەی دەخوێند.

بەڵام كوڕەكە بیری لـە شـوێنێكی تـر دەكـردەوە كە لە كتێبێكدا لەلایـەن دكتۆرێكـی ئـاین پـەروەرەوە دەربارەی "ژیانی ڕەگـەزی ئـافرەت" لـەوێدا ئـەوە نووسراوە: "پیاو پارێزگاری خۆی دەكات بۆ ئـەوەی ژن و مێردایەتی شەرعی لەژێر دەسـەڵاتی شـەهوەت ڕزگـاری بـێ". وە بـیری لـەوە دەكـردەوە كـە دەبـێ ئەوە گەلێ سەخت بـێ خۆتـی لێ بپـارێزی، لەوكاتـەی كە تەنها ماچێك لەم كاتەدا بتوانێت ئەوەندە كاریگەر بێ.

*

كاتێك مانگ هەڵهات، هێشتا ئەوان دانیشـتبوون و ماچی یەكتریان دەكرد.

كیژەكە بە چرپە بە كوڕەكەی وت:

—مـن هـەر لــە یەكــەم یەكتربینینــەوە تــۆم خۆشویست.

كوڕەكەش وەڵامی دایەوە:

—لەلایەن منەوە، جگە لە تۆ هەرگیز كەسێكی تر نەبووە لەم جیهانەدا.

**پەراوێز:**

*1–كۆپلە شیعرێكی "گۆتـە" شـاعیری ئەلمانییـە، لەنێو شیعری "Trost in Tranen" كە دەڵێت: "پیاو داخوازی ئەسـتێرەكان ناكات/ پیاو شادمان دەبێت لە بەرامبەر جوانیاندا".*

*2– "Punsch" جۆرە خواردنەوەیەكی كهولییـە، پێشتر لــە هـەندێ موناسـەبەی تایبـەتدا دەخـوراوەو هەروەها لە قاوەخانەكاندا بەزۆری دەخورانەوە.*

## زەخرەفەی گۆڕستان

## (1924)

جارێكیان چەند ساڵێك بەر لـە ئێستا –ئـەوە لـە گەرمـەی شـەڕدا بــوو– لەگـەڵ هێنینـگ بێرگـەر[1] درەنگە وەختێكی ڕۆژێكی پایز بـوو بە گۆڕستانێكی كۆپینهاگندا ڕێمان دەكرد. سەد سـاڵ بـەر لـە ئێستا ئەم گۆڕستانە كـەوتبووە نێو لادێیەكەی پەتییـەوە، گـەلێك دوور لـە دەرەوەی حەسـارەكان و كێڵـەكانی شاردا، ئێستا ئەوە وەكو واحەیەكی گەورە لەوێدایـە، سـەوزو ئـارام، لــە نێوەنـدی ئـاپوورەی گـەڕەكێكی شــارێكی گــەورەدا، لــەنێو كۆگــا و جەمــەلۆنی كرێكاراندا.

ئێمـە لەسـەرەخۆ لـە نێوان ئـەو چنـارە بـەرز و باریكانەی ئەلی[2]یەكی بێكۆتاییدا ڕێمـان دەكـرد. تـاو ناتــاوێك رادەوەســتاین و نــاو و نوســراوی ســەر كێلەكانمان دەخوێندەوە.

باسی جەنگمان دەكـرد. هێنینـگ بێرگـەر ئـاواتی سەركەوتنی بـۆ ئەڵمانییـەكان دەخواسـت، مـن لـەوە دەترسام، وە هیچ ئاواتێكم نەدەخواست. وە ئیتر لـە كۆتاییدا وای لێهات كەمێك كەمدو بین.

هێنینگ بەدەست هێمای کێلێکی کرد کە کەمێك لەلاوەی ڕێگاکە بوو و وتی:

—سەیرکە، سەیرکە ج. پ. ژاکوپسین[3]. بەڵام لەوانەیە ئەو ڕاستەقینەکە نەبێت.

—نەخێر، ئەوە بێگومان ئەو نییە، بێگومان ئەو ئێستا لە تیستاد[4] نێژراوە، تا لەوێ ئەو لەدایکبووەو لەوێش مردووە. وە بە ڕاستی لەگەڵ ئەوەشدا تا ئەم گۆڕە بەلای کەمەوە، سەدساڵێك دەبێت، ئێخۆ پیاو دەتوانێ ئەوە ببینێ.

—بەڵێ بێگومان. باشە ئەوە ▪ وێنەیەکی بەرجەستەیە؟ ئەو وێنەیە سەردەمی تورفالدسین[5] وەبیردا دەهێنێ.

وێنەی کوڕە قارەمانێکی لاری ڕووتوقوت بوو بە تاسکلاوێك و شمشێرو پێستی بەرانی بەسەرشانەوە بوو.

—ژەیسۆن[6] بە بەرگە پێستیە زێڕینەکەیەوە.

—باشە، کەواتە بێگومان کەولکەنێك لەوێدا نێژراوە.

نووسراوەکەی سەریمان خوێندەوە. ئەوە گۆڕی کەولکەنێکە.

بەردەوام بووین لە ڕۆشتن و لە پێش گۆڕێکی تردا ڕاوەستاین، هەروەها ئەو گۆڕەش زیاد لەسەد ساڵ زیاتر دەبوو. بەردێکی بەرز بەوێنەیەکی بەرجەستەی مردووەکە بەسەریەوە —پرۆفیسۆری بەیتەری— وە لە خوارەوەی وێنە بەرجەستەکەدا وێنەیەکی بەرجەستەی گەورەی دیانای ئیفیسی[7] بە بیست مەمکەوە. ئێجگار سەیرە کە لە گۆڕستانێکی فەلەدا لە پڕا ڕووبەڕووی سیمبولی زاوزێکردن بیتەوە کە جارێکیان هەندە زۆر سەرلێشێوانی لە ئیفیسوس[8] پەیداکردبوو. بێرگەر پرسی:

—ئەرێ بە ڕاستی ئەمە دەبێ چۆن چۆنی هاتبێتە ئێرە؟

—ئا، ئەوە بڵێ! دیانای مەزنی ئیفیسی، بەڵام بێگومان لە بارەی خزمەت کردنەکانی بە زانستی بەیتەری بە ڕاستی هەندە باش بۆم ڕوون نەبووەتەوە.

—چونکە ئەو خواوەندی ڕاوشکار بوو و هەروەها ئەوە بێگومان خواوەندی سەگە بزێوەکانیش بووە، "بێرگەر وا بۆی دەچوو" ئا لەوێدا لەوانەیە ڕوونکردنەوەمان هەبێت! بەڵام تەماشای کابرای نێو مەدالیەکە بکە؟

—ئایا دەتوانی بڵێی بەکێ دەکات؟

هیچ لێکچوونێکم بە کەسێکی کەی کە دەمناسی نەدەبینی.

—ئێخۆ ئەوە بوێك[9]ە، "ئەو وتی". ئایا تۆ ناتوانی ئەوە ببینی؟

هەرچەندە لە توانامدا بوو کردم بۆ ئەوەی لێکچوون لە نێوان ئەو پرۆفیسۆری بەیتەرییە حەفتا ساڵەیەو ئەو دوسێنت[10]ە لێهاتووە لاوە بوێك بەدی بکەم، بەڵام ئەوە نەکرا.

—ئەوجا تۆ هەرگیز ناتوانی بەهەمان شێوە وەکو من لەیەك چوون ببینی، "ئەو منگاندنی" تاریك و هەوراوی هەروەك پایزی دەوروپشتی ئێمە.

(من دەمزانی کە هەر جارێك کە دەهاتە سەر بیرکردنەوە لە بوێك قومی ساول[11]ی بەسەرا دەکرا. ئەوە بەوە دەستی پێکرد کە بوێك، کە پێشتر تا ڕادەیەك بە باشی لەسەر کتێبەکانی ئەمی دە وسی، لە پڕدا گیانی لەبەر ڕۆمانێکیدا برد، کە بێرگەر ئومێدێکی زۆری پێوە گرێدابوو. هەرچۆنێك بێت گەلێك درەنگ بڵاوبووبووەوە، کە بوێك لەبەر پەلەی یەڵدا[12]دا نەیتوانیبوو تا کۆتاییەکەی بخوێنێتەوە بەڵکو تەنها هەندێك لاپەڕەکانی ئەمدیو و ئەودیو کردبوو، کۆتاییەکەی بۆ خۆی هەڵیهێنابوو —بەڵام شێتانە هەڵی هێنابوو!— وە پاش ئەوە کتێبەکەی بەتوندی لەسەر بناغەی ئەو کۆتاییە بێسەروبەرو هیچ

ویووچەیەیدا رەتکردبووەوە، کەوا ئەو بە خودی خۆی هەڵی هێنابوو. وە پاشان لەبەر خاتری ئەو ئاکامەی بە هەمان تۆن بەردەوام بوو، لە کاتێکدا لەسەر بێرگەری دەنووسی).

لە پڕێکدا ئەو لە ناوەوە تەقییەوە:

–لەگەڵ ئەوەشدا لە راستیدا ئەوە هەڵەی تۆیە!

–"من پرسیارم کرد" چی؟

–کە بوێك بە من دەوەڕێ . ئەوە هەڵەی تۆیە! تۆ دەبوایە هەرگیز هێرشت نەکردایەتە سەری! پاش ئەوەی تۆ هێرشت بردە سەر بوێك، منی شەیتانی بەستەزمان هەرگیز هەڵسەنگاندنێکی تا رادەیەك باشم لە سفێنسکە داگبلادیت[13] ـەوە بۆ نایەت! هەرگیز! ئەوە وەکو رۆژی روون ئاشکرایە: ئێخۆ تۆ هیچ نانووسی، ئیتر ئەو ناتوانێ هیچت لێ بکات، ئەوجا ئەو لەجیاتی ئەوە ماڵی هاوڕێکانت کاولدەکات. ئەوان دەبێت نرخی تێچووی شەڕەکەت بدەن، وە ئەوەش نرخێکی بەرچاو دەبێت، باوەڕت هەبێت. لە راستیدا دەبووایە من فاکتوورەیەکم[14] بۆ تۆ بناردایە!

–"من وتم" تکایە مێنینگ، ئەوە مەکە. ئەوە بە راستی وێرانم دەکات.

–ئەوە بە راستی هەقی خۆیەتی کە تۆ وات بەسەربێت. ئەوە نەعمەتێکی خراپ نییە کە بۆ خۆت پێکت هێناوە! پەلاماری رەخنەگرێك بدەیت! کەسیش نا رەخنەگرێك بێت لە سفێنسکە داگبلادیت! پیاو دەگاتە ئەو باوەڕەی کە تۆ بە راستی ژیر نەبیت!

–من ناوێرم گازندەی ئەوە بکەم کە تۆ بە تەواوی بەهەڵەدا چوویت، بەڵام خۆ مرۆڤ ناتوانێ بیر لە هەموو شتێك بکاتەوە. وە من بیرم لەوە نەکردووەتەوە، کاتێك پێش چەند ساڵێك بەر لە ئێستا هەندێ گاڵتەم لەگەڵ دوسێنت لوێکدا[15] کردووە، کە من بۆ ئەو کارە پێویستیم بەوە هەبێت داوای لێبوردنی لێ بکەم..

–نەخێر، بەڵام ئیتر دەبا بەس بێت! وە ئایا تۆ دەزانی من ئێستا چی دەکەم؟ ئا، من ئەوەت پێ دەڵێم: دەڕۆمە ماڵەوەو دەربارەی تۆ چیرۆك دەنووسم، یا تەنزێك یاوەکو هەرچییەك بێت، وە وات دادەگرم کە قرچە لە گرێکانی قامکەکانتەوە بێت، وە ئەوەش دەنێرم بۆ سفێنسکە داگبلادیت! باشە ئەوکاتە دەیبینین، ئەگەرەکو من هەمیسان جارێکی دی هەڵسەنگاندنێکی رووداوم لەو رۆژنامەیەدا دەستناکەوێت!

– "من وەڵامم داوە" ئەوە لەوانەیە بیرێکی باش بێت. بە راستی ئەوە بیرێکە، لەگەڵ ئەوەشدا من زۆر بە شادمانییەوە یارمەتیت دەدەم. بەو شێوەیە دەتوانین ئا ئەو شتە جێبەجێ بکەین بەبێ ئەوەی پێویستی بەوە بێت کە تۆ فاکتۆرەیەك بۆ من بنێریت.

–بێگومان! هەرگیز خەوم بە شتێکی ترەوە نەبینوە! ئێمە دەبێ ئەوشەیتانە بخەڵەتێنین!

باران دەستی بە بارین کردبوو، لە سەرەتادا وەشتە بارانێك، کە ئێمە بە ئاستەم هەستمان پێکردبوو، بەڵام لەپڕدا کردی بە لێزمەباران. بڕیاری ئەوەمان دا کە پەنا بەرینە بەر دەروازەی کاپێل[16] ی گۆڕستانەکە؛ دەرگاکان خرابوونە سەرلا. ئەوکاتە لەوێدا ناشتنی مردوویەك بەڕێوەبووە؛ مەراسیمەکە تازە بە سرودێکی ئاینی و ژەندنی ئۆرێل[17] دەستی پێکردبوو. لە دیوی ناوەوەی دەرگاکە برایەکی کارگەی گۆڕستانەکە راوەستابوو، کە هەریەکەو دانەیەك لاپەڕەی کۆپیکراوی بۆ دریژکردین کە لەسەری نێوی مردووەکە لەنێو چوارچێوەیەکی رەشداو لەگەڵ دەقی ئەو سرودانەی کە دەبێت

بخوێندرێنەوە، نوسرابوو. لەسەر تەختێکی چۆڵ لە نزیك دەرگاکەوە دانیشتین. من ناوی مردووەکەم خوێندەوە. ئێڤا مارتا کریستینا ئویتەر کڤیست. ئاشکرایە ئێوێکی سودیدییە وە هەروەها لەنێو تاجە گوڵینەکانی سەر دارەمەیتەکە دانەیەك هەبوو بە قردێلەی شین و زەرد[18]. ئەو دارەمەیتە ساکارە، ئەو تاجەگوڵینە هەرزانبایانە، ئەو ژمارە کەمە میوانی ئاشنایە، هەمووی ئەوە رووندەکەنەوە کە ئەوە بوونەوەرێکی هێمن بووە کە ئالێرەدا کۆتایی خۆی دۆزیوەتەوە. هەروەها ئەوە لە دووانی قەشەکەش هەستی پێدەکرا وەك باسی کرا: کەسێکی متەوازع، ژیانێکی سارد، ئەمەکداری لە بچوترین شێوەدا..

دووانی قەشەکە کورت بوو، بەڵام کۆپلەی سرودەکان زۆر و درێژ بوون، لە پێش و پاشی دووانەکەدا. هەر هەمووی رەنگە دەوروبەری نیو سەعات کاتی خایاندبێت، لێزمە بارانەکە خۆشیکرد، وە کاتێك کریستینایان بۆ دەرەوە هەلگرد لەژێر سرودی بێلایەنی جوانی "*Dejlig er Jorden, Praetig er Guds Himmel, skon er Sjaelenes Pilgrimsgang*"[19]، خۆرێکی رەنگ بردوو گورزە تیشکی دەدایە ژوورەوە بۆ ژێر پۆپەی دارە رووتەوەبوو و گەڵا زەردەکانی گۆڕستانەکە. وە لە گۆنای هێنینگەوە جووتێ فرمێسکی گەورە بەربوونە خوارەوە. ئەو بە پیاوێکی پیری وت وەکو داوای لێبوردنی لیّ بکات، کە بە تەنیشتمانەوە تەپەتەپی بوو:

—من هەر کاتێك کە گوێم لەو سرودە دەبێت هەردەم دڵم پڕدەبێت.

(بێگومان ئێمە لەگەڵ ئەوانی کەدا بە دوای دارمەیتەکە کەوتین تا سەر گۆڕەکە).

کابراکە بە دانیمارکی وەڵامی داوە :

—بەڵێ، ئەوە هەروەها سرودێکی جوانە. بەڵام من دەتوانم گوێم لەوە بێت کە ئێوەی بەڕێز بە سویدی قسەدەکەن؟ یانی کەواتە ئێوە لەوبەرەوە هاتوونەتە ئەمبەر بۆ ناشتنی ئویتەرکڤیست[20]ی پیرەژن؟ ئەوە بەراستی بەسۆزی و دۆستایەتیە لەلایەن ئێوەوە! کەواتا هەروەها ئێوەش چەند وشەیەك لەسەر گۆڕەکەیدا دەڵێن؟

—هێنینگ بێرگەر چکێك شەرم دایگرت و ووتی:

من باوەڕ ناکەم کە زانم تێدا بێت. من خۆمم بۆ ئەوە ئامادە نەکردوە.

—هیچ قەیدی نییە، "دانیمارکیە رووخۆشە کورتەباڵاکە وتی"، بێگومان هەردەم دەتوانی شتێك بڵێیت! ئەوە زۆر بەتاڵ و دەست نەرۆییە، لە کاتێکدا هیچ کەسێك شتێك بەدیار گۆڕەکەتەرە نەڵێت. وە وا دەرناکەوێت کەسێکی تر ئەوە بکات.

ئەوکاتە لەسەر گۆڕەکە راوەستابووین، قەشەکە لەژێر رسوماتی ئاساییەوە سێ دەمە بە فرماڵ تومی هەڵداوە سەر دارە مەیتەکە، بەهەمان شێوە هەروەك لە سوید دوعاکانی خوێندەوە. کابرا کورتەباڵاکە شانێکی لابەلای بە هێنینگ بێرگەردا کێشاو وتی:

—ئێستا، ئێستا دەبێت تۆ قسە بکەیت.

من هەروەك لەسەر دەرزی راوەستابووم. هێنینگ بێرگەر بەراستی بەسەری پەتی چووە بەرەوە بۆ سەر تەپۆلکە خۆڵەکەی تەنیشت گۆڕەکەوە. نیگاکانی داگرتە سەر دارەمەیتەکەی خوارەوە، دووبارە سەری بڵندکردەوەو تەماشای گواستەوە سەر کۆمەڵە کۆبووەوەکە. بەو شێوەیەی کە ئەو لەو سەرە راوەستابوو. بە —وەکو لە پۆرترێتی "هێرمان ڤیدێلێس"— پرێلات[21]ێکی بەشایەن و بەڕێزی دەکرد.

ئەوکەوتە دوان و وتی:

—ئێڤا مارتا کریستینا! سێ ناوت پێدراوە لەو مەراسیمی ئێوتانە[22] پیرۆزەدا، لەکاتێکا بیر لە ئێڤا

دەکەمـەوە، لـەلای خۆمـەوە لاوێتییـەکی شـکۆفەدار دەبینم. بەڵام ئـەوە دەمێکـە بەسـەرچووە و ژاکـاوە، وە ئێڤا مردووە. ئارامی بۆ دەخـوازم. کـاتێك بـیر لـە مەرتە دەکەمەوە، هەموو ژیانی پـڕ لـە رەنجكێشـانت دەبینـم. تـۆ کـارت کـردووەو خـەمی گـەلێك شـتت خواردووە، لە کۆتـاییدا مـاندوو بوویـت و چوویـت بـۆ پشوودان. هەروەها مەرتەش مردووە.

بەڵام کریستینا نـەمردووە! "مـن دەزانم کـە ئـەو دەژی! وەك فۆرمێك کریستینا تۆ رۆیشتوویتەتە نێـو ژیانی جاویدانی، کریسـتینا! وە ئێمـە، کـە مێشـتاکە پێویستە ماوەیەکی کەم لەم دۆڵی سـێبەری مەرگـەدا بگەڕێین، ئێمە پێت ناڵێین خوات لەگەڵ، بەڵکو ئێمـە دەڵێین: بۆ یەککگەیشتنێکی کە!

بـە چـاوانێکی تـەڕو دەسـت گوشـینێکی گـەرم وتـاربێژ پاداشـت کـرا، کـاتێك ئـەو هاتــە خـوارەوە. قەشـەکە سوپاسـی کـرد بـە پەسـەند کردنێکـی هەمکارانـە بـۆ ئـەو سـیمبولییە جوانانـەی ئـەو ترنجانبوویە نێو ئەو سێ ناوەوە. کـە بەلای زۆربـەی خەڵکەوە مەندە ناوێکی رۆژانەن..

وە هـەتاوەکو منیـش، کۆنـە گوناهبـارێك، کـەمێ دڵم پڕبوو.

**پەراوێز:**

*1- "Hening Berger": یەکێکـە لـە دۆسـتە نزیکەکانی سوێدەربێری و یەکێکیشـە لـە چیرۆکنووس و رۆماننووسە بەناوبانگەکان زمانی سویدی.*

*2- "Alle": ئـەو جادەیـە کـە دار بـە ئەمبـەرو ئەوبەریدا نێژرابێت.*

*3- "J.P. Jacobsen": نووسـەرێکی بـەناوبانگی دانیمارکییە..*

*4- "Thistad": شـارێکە لـە دانیمـارك کـە "ج.پ. ژاکوبسین"ی تیا لەدایك بووە.*

*5- "Bertil Thorvaldsen": "1768-1844" پەیکەرتاشێکی بەناوبانگی دانیمارکیـە کـە پەیکـەرەکانی لەسەر بابەتی ئاینی مەسیحی کـردووە، بـەڵام ئێستا زۆر کەم کەس نێوی دەناسێتەوە.*

*6- "Jason": لە "کرداری نێرراون"دا باسـی لێـوە دەکرێت کە میوانداری پۆلس و سـیلای لـەماڵی خۆیـدا لـە شاری تەسالۆنیکیدا کـردووە لـەکاتێکدا ئـەوان خـەریکی بڵاوکردنــەوەی ئــاینی مەســیحی بــوون لــەوێکاندا. (تەماشای بەشی حەڤدەی کرداری نێرراوان بکە).*

*7- "Efesiska Diana": خواوەنـدی راوشـکاریە، کە لەلای رۆمـەکاندا بـە ئـارتیمیس نـاوبراوە، کـە ئـەویش کچی زیۆس و لێتۆیە و خوشکی ئەپۆلۆیە، کە لـە بناغـەدا دەگەڕێتـەوە بـۆ خواوەندەکـانی رۆژهـەڵات، کــە وەك خواوەنـدی دەسـەڵاتدار بەسـەر گیانلەبـەران و زاوزێ و خواوەندی دایکـی کچێتـی دادەنرێـت. کـە بـە خواوەنـدی دایك ناودەبرێت. لە شاری کیوبیلە لە ئاسیای ناوەڕاسـتدا شوێنەواری ئـەو پەرستگایەی ئـەو مـاوە. وە بـە بۆنـەی ئەوە کە عەشقی چوبووە سەر ئاتیسـی شـوان بـەڵام ئـەو خیانەتی لێکرد. بۆیەکە ئەو ئاتیسی ناچار بـە خەسـاندن کرد، وە لەو رۆژەشەوە هـەموو ساڵێك لـەو شـاخەی کـە پەرستگاکەی لێ بـوو گایـەك دەکـرا بـە قوربـانی و رێگـە دەدرا خوێنەکەی بڕژێت.*

*8- "Efesus": شـارێك بـوو کـەوتبووە رۆژئـاوای ئێستای وڵاتی تورکیا.*

*9- "Fredrik Book": "1883-1961" یەکێکە لە پێشەنگانی رەخنەگرتن لـە زمـانی سـویدیدا، خـاوەنی چـەندین کـاری بەنرخـە کـە تـاوەکو ئـەمڕۆش جێـی سوودوەرگرتنە، لە ساڵانی شەڕی جیهانی دووەمـەدا بـە ئاشـکرا رەزامـەندی خـۆی بەرامبـەر بـە هیتلـەر دەربـڕی. دووبەرەکییەك هەبوو لە نێوان ئـەو و سـوێدەربێریدا، وە سوێدەربێری لە چەند جێیەکدا لـە کارەکـانی وەکـو تـەنز نێوی دەهێنێت.*

10-"docent": یاردەدەری مامۆستای دانشگا، محاضر لە دانشگادا.

11-"Saul": ساولوس (پاولوس) کەسایەتیەکی بەرزە لەنێو دینی فەلەدا کە بەدوای مەسیحی پێغەمبەردا کەوتبوو بۆ ئەوەی دەستگیری بکات. ئیتر ڕۆژێکیان لە بیاباندا مەسیح بەشێوەی روناکیەك خۆی پیشان دەدات و پێی دەڵێت: "ساول ساول، بۆچی شوێنم دەکەویت؟" یالمار سوێدەربێری ئەم ئایەتەی بەکارهێناوە بۆ لێنەبوونەوەی کەسێك بەشوێن کەسێکی کەدا، وە لەم چیرۆکەشدا فرێدریك بوێك بەو ساولەی بەدوای مەسیحەوە بوو بۆ دەستگیرکردنی و هێنینگ بێرگەریش بووە بە..

12-"Jul": جەژنی لەدایك بوونی عیسا پێغەمبەر.

13-"Svenskadagbladet": ڕۆژنامەیەکی ڕۆژانەی سویدیە کە تاوەکو ئەمڕۆش بەردەوامە لە دەرچوون.

14-فاکتورە: لیستی حیسابات.

15-"Look": لێرەدا ئەوگۆڕانەی پیتی "ب" بۆ "ل" مانای ووشەکە لە زمانی سویدییەوە لەناوی کەسەوە دەگۆڕێت بۆ "پیاز" وە ئەمەش یەکێکە لەو تەنزو گاڵتە پێکردنەکانی سوێدەربێری بە کەسایەتی بوێکی ڕەخنەگر.

16-"Kapell": کلێسای بێ خاچ: کلێسای چکۆلانە.

17-ئۆرگێل "orgelspel": ئۆرگ: ئامێرێکی مۆسیقیە لەگەڵ کلێساکەدا دروستدەکرێت.

18-"قردێلەی شین و زەرد: هێمایە بۆ ئاڵای سوید کە پێکهاتوە لە دوو ڕەنگی شین و زەرد.

19-"Dejlig er Jorden, Praetig er Guds Himmel, skon er Sjaelenes Pilgrimsgang": ئەمە ڕستەیەکە لە تەلیلەی ئاینی مەسیحیدا دەخوێندرێتەوە.

20-"Ytterquist": نازناوی خانەوادەی کریستینای مردوو بوو.

21-"Prelat" پایەیەکی بەرزە لە قەشەی نێو کلێسای کاتۆلیکیدا.

22-"dop": ئەو مەراسیمەیە کە بە ئامادەبوونی کەسوکاری منداڵ و قەشەیەك نێو لە منداڵەکە دەنرێت، وە لە هەمان کاتدا ژن و پیاوێك دەکرێن بە "کریف" بۆ فێرکردنی ئاینی مەسیحی و ئەرکەکانی. (پێویستە وشەی "کریف" شیبکەینەوە، چونکە ئەم وشەیەم لە ئایینی یەزیدی قەرزکردووە، وە ئەوان لە مەراسیمی "کریفمن"دا، کە ئەو کاتەیە کە منداڵیان سوونەت دەکەن، لە باوەشی "کریف"ێك دایدەنێن، کە هەمان ئەرکی وەکو می مەسیحیانی هەیە، بەڵام لەلایەن هەڵبژاردنی کەسێك بۆ "کریف" لە ئایینی مەسیحیدا نزیکترین کەس هەڵدەبژێرن، وە زۆربەی جار براو خوشك و ئامۆزا دەبێت؛ کەچی لەلایەن یەزیدییەکان نابێت لەهەمان خێڵ بێت چونکە بەپێی شەرحی ئایینی یەزیدی ژن و ژنخوازی لەنێوان ئەو دوو خێزانەدا نادروستە، وە ئەمەش کێشەی ژن هێنان و شووکردن لەبۆ منداڵەکە دروستدەکات، وە زۆرجار ناچار دەبن کەسێك هەڵبژێرن کە ئایینێکی کەی هەبێت وە ئەمەش بەپێی ڕێورەسمی ئایینیان کارێکی دروستە.

## سێبەرەکە

(1898)

من نازانم ژیانم خۆش دەوێت یاوەکو قینم لێیەتی؛ بەڵام بە هەر هەموو ویست و خواستێکمەوە خۆم پیا هەڵواسیوە. من نامەوێت بمرم. نەخێر من نامەوێت بمرم: نە ئەمڕۆ و نە سبەینێش، نە ئەمساڵ و نەساڵی داهاتووش.

لەسەر هەر هەموو ئەمانەشەوە جارێك لە جاران پێش چەندین ساڵ بەر لە ئێستا خەوێکم بینی، وای لێکرم کە ئاواتی ئەوە بخوازم کە من هەرگیز لەدایك نەبوومایە.

*

بەتەنهایی و بە بێدەنگی بە شەقامێکی چۆڵ لە خەڵك ڕێم دەکرد. ئەو ڕۆژە ڕۆژێکی پێش وەختی تواندنەوەی بەفرو هاتنی بەهار بوو، دلۆپی چۆڕاوی سەربنەکان لەبەر خۆرەکە دەدرەوشانەوە، لە شەقامەکان گۆلاوی سافیان دروستدەکرد، کە شین ڕەنگیان دەداوە، وە لەبەر ئاسمانێکی بێ ڕەنگی بەهارە لەسەر دوکەڵکێشی سەربانەکان، سەربانەکانیش شین ڕووناکیان دەدا. هەوای ئەو بەهارە کە من هەڵم دەکێشا وا بە خەیاڵمدا دەهات کە وەکو مەرهەمێك یا دەرمانێك بێت بەرامبەر ئەو پرسە پەنهانە. کە تا ئەو کاتە تەنانەت لە خەونیشدا ئاخمی ژاراوی دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا هەستم بە جۆرێك نیگەرانی دەکرد. ئایا بە ڕاستی من تەنهام؟ من هەستم دەکرد کەسێك بە تەنیشمەوە لەگەڵ مندا ڕێدەکات، بەلام من بە ڕوونی نەمبینی ئەو کەسە کێیە، چونکە ئەو بەردەوام بوو لەسەر ئەوەی کە نیو هەنگاو بەدوای منەوە بێت؛ ئەوکاتەی جارێکیان خۆم وەرچەرخاند بۆ ئەوەی ببینم، بەتەواوی ئەو کاتە خەریکی لووت سڕین بوو، وە بەو شێوەیە توانی زۆربەی زۆری دەموچاوی بە دەستەسڕەکە بشارێتەوە، کە پاکە بڵاوتری دەکردەوە. ئەوە یەکسەر هات بە مێشکما، کە من بەلای خۆرەتاوەکەی شەقامەکەدا ڕێدەکەم، دەکرێت سێبەرەکەی خۆم بێت، کە بە ڕێگا سپییەکەدا بە شوێنم کەوتووە. بەخۆم تۆزێ هەلامەتی هەوای بەهارەم تووش بووبوو، ئیدی بۆچی ناکرێت کە هەروەها سێبەرەکەشم تووش بووبێت؟

من هەرگیز هێندە هەستم بە تەریقبوونەوە لەبەرامبەر سێبەرەکەمدا نەکردبوو، بەلام ئەو ڕۆژە ئەو چکێك ناڕەحەتی کردبووم. من دەستکێش و جلوبەرگی تازەم لەبەردا بوو: بەلام سێبەرەکەم بۆرو بێڕەنگ بوو و سیمایەکی هەژارانەی دەنواند. باشە بۆچی دەبێ لەو هەموو ڕۆژە تەنها لەو ڕۆژە خۆرەتاوەدا بە شوێنم کەوێت، ئەوجا بەرەو پیری ڕۆیشتم، هەروەك خانمێك خۆشم بوێ و بەرەو پیری بڕۆم؟

ئەو بە پیریمەوە دەهات، و شەوقی دەدایەوە و زەردی دەکرد، بەلام هەروەها شتێك وەکو فرمێسکێك لە چاویدا دەبریسکایەوەو. ئەو خانمە دوو گوڵەباخی لە دەستدا بوو. یەکێکیان سووری کاڵ بوو، لەبەر مەمکی خۆیدا شاردبییەوە.

من پرسیارم لێکرد: "باشە بۆچی ئەو گوڵەباخە سوورەشم پێ نادەیت؟"

وەلامی دامەوەو خەندەی کرد: "مێشتاکە نا". وە ئەوەشم لە خەوەکەمدا بینی، کە خەندەی لێوەکانی هەمان خەندەیە، کە ژنەکانی لیۆناردۆ[1] دەخەننەوە.

من دەمویست قۆڵی بگرم، بەلام ئەو لەجیاتی ئەوە دەستی دەگرتم. وەکو دوو منداڵ دەست لەناو دەست بە جادەکەدا بەرەوخوار ڕۆیشتین. من بەدەست قەستی ڕێگام پێدا بەو لایەمەوە ڕێگا بکات، کە سێبەرەکەمی لێبوو، کە ئەو کابرایە بنێتە ژێر پێڵەقەوەو ئەو کابرایە ون ببێت.

*

بەلام خەون خێراتر لە ڕاستی گۆڕانی بەسەردا دێت.

ئەو شەقامەی کە ئێمە پیایدا دەڕۆیشتین، هەر بە هەمان شێوە بوو وەك تۆزێ بەر لە ئێستا، لە خانووی لەدار دروستکراو بە باخچەیەك لە پشت تەختەی سوورەوە، بەلام ئەوە شتێکی کە بوو، چونکە هیچ بەفرێك نەبوو و هیچ گۆلاوێکی ساف، کە شین ڕەنگیان دەداوە، کات بووبووە بەهارێکی ڕاستەقینە. دار کەڤووتەکان[2] بە تەواوی گوڵەکانیان پشکوتووە، وە دار گێلاسەکەی باخچە چکۆلانەکەی دراوسێکەمان دوگمەی گەورەی پێوە بوو. لە پڕێکدا شتەکان لێڵ بوون؛ دەروازەی خانووە چکۆلەکان بە

ئاستەم وەکو کونێکی رەش بەنێو رۆژانی نادڵنیایی خەوندا دیاربوون، وە کابرایەکی پیر بە مەشخەڵێکەوە کە بەدەستیەوە بوو لەو دەوروبەرەدا دەسوڕایەوە چرایەك لەیرەو چرایەك لەوەرە دادەگیرساند.

لە دەروازەی ماڵەکەی مندا راوەستاین. ئەو خانووە ئەوە بوو، کە من بە منداڵی تیایدا ژیابووم کە لەمێژە نەماوە و هەروەکو شەقامەکەو باخچە چکۆلانەکەو دار گێلاسەکە، لە خۆرئاوا بوونەکەدا وەستابووین، چرپە چرپمان بوو، بە سۆزەوە دەستمان بەدەستی یەکتردا دەهێنا، وە کاتیش لەنێو ماچێکی دەم لەنێو دەمدا ونبوو.

–"ئەی گوڵەباخە سوورەکە؟" من لێم پرسی. "ئایا ئەویان لەوانەیە ژاکابێت؟"

–"نەخێر" ئەو وەڵامی داوە، "هێشتاکە ئەوە نەژاکاوە. سەیری ئێرەکە، ئەوە چەقیوە بە بەر مەمکما و خوێنی لێ هێناوە، وە من کامی ئەوەم کە بیدەم بەتۆ. بەڵام من ناوێرم، نەخێر، من ناوێرم؟".

وە چاوەکانی پڕبووبوون لە فرمێسك، ئەو کاتەی کە ئەو باڵی درێژکردبوو و گوڵەباخەکەی بەرەو رووی ئەو تروسکاییەی کاتی خۆرئاوا بوونەکەدا گرتبوو، من دەستیم بە هەردوو دەستەکانم گرت، و گوڵەباخە سوورەکەشم بەتوندی بەسەر دەمما هێناو ماچێکم کرد.

سەرم سوڕی خوارد، بەرچاوم تاریك بوو، وە هەموو شتێکم لەبیرچوو. بەڵام ئەوکاتەی کە دووبارە هاتمە سەرهۆشی خۆم، وەستابوو، ئەوەی کە خۆشم دەویست، زۆر دوورتر بوو لە منەوە. وەك ئەوەی ئێستاکانێ لێی بوو، رەنگی پێستی بێڕەنگتر بوو، ئەو شتێکی زۆر ئازاراوی لە دەربڕیندا بەدەوری دەمیەوە بوو. دەمویست نزیك ببمەوە، بەڵام ئیتر، ئەوکاتە سێبەرێك خزایە نێوان من و ئەو. سێبەرەکە بۆر و کەم رەنگ بوو، بە نینۆکی هەژاری نیشان کرابوو. دەمویست بەپاڵ لای بدەمە لاوە، بەڵام ئەو لە من بەهێزتر بوو؛ وە لەو ماوەیەی ئێمە لە زۆرانبازیدا بووین، من و سێبەرەکەم، خۆشەویستەکەم تا دەهات بەرەو دوور بۆ نێو تاریك داهاتنی خەون دەخزا وە وەکو نووکی تەمێکی کەمڕەنگ ونبوو..

منیش بەنێو دەروازەکەدا چوومە دەرەوە، و سێبەرەکەش بەدوام کەوت. ئیتر لە دەرەوە لەوە بەدوا بەهار نەبوو، بەڵکو تاریك داهاتنی زستان بوو، بەفری سپی لەژێر ئاسمانێکی تاریك و بۆر تازە داباریبوون وە بەردەوام بەفر لە باریندا بوو. من هیچ ناحەزییەکم لە بەرامبەر سێبەرەکەمدا نەکردبوو، چونکە من پیرو چەماوەو هەموو شتێکم لەبیر چووبۆوە.

**پەراوێزەکان:**

*1–مەبەست لە تابلۆکانی لیۆناردۆ دافینچی ئیتالییە.*

*2–"Lonn": دارە یا دەوەنە وە بە خێزانی ئەم رووەکە دەوترێت "Aceraceae" و لە سویدا پێنج جۆری هەیە.*

## سیگنێ

**( 1921 )**

سیگنێ کیژێکی چکۆلانە بوو، نزیك بە هاوتەمەنی من، بەکراسێکی سووری کاڵ و بە قردێلەیەکی سووری کاڵ بە قژەکەیەوە، قژی قاوەیی، لوولێکی پێچخواردوو، وە ئەو دوو چاوی شینی تۆخی ئەستێرەیی هەبوو لەگەڵ برۆی درێژدا. ئەو بە هیچ جۆرێك لە فریشتەیەکی نەدەکرد. ئەو سەردەمانە هەندە حەزم لە فریشتە نەدەکرد، لەوانەیە بە زۆری لەبەرئەوە بووبێت کە ئەوان هەردەم قژی کاڵیان هەبوو –لەو سەردەمەدا من خۆم قژی کاڵم هەبوو،

هەروەك زۆربەی منداڵانی کە، وە قژی کاڵیش هیچ شتێکی تایبەتمەندی نییە و من وا بۆی دەچووم.

بەڵام من زۆر سیگنێم خۆشدەویست. دەمتوانی سەراپای رۆژەکە بڕۆم و بیر لەو بکەمەوە. بە دەگمەن رووی نەدەدا کە ئەو شتێکی نالەبار نەکات، کە من تاوانبار دەکرام پێی، وە هەندێ جار بەخۆم تاوانەکەم دەخستە ئەستۆی خۆم. ئەمە نەدەبووە هۆی ئەوەی کە کەمتر خۆشم بوێت، بەڵام من تەنها ئاواتی ئەوەم دەخواست کە ئەو نالەباری زیاتر بکات و منیش تاوانەکە بگرمە ئەستۆم. بەڵام ئەوە لە راستیدا چ نالەبارییەك بوو کە ئەو دەیدۆزییەوە؟ لێم گەڕێ با تۆزێ بیری لێبکەمەوە.. ئەو رایدەکردو خۆی لە جێگای وادا دەشاردەوە کە مرۆ بۆی نەبوو لەوێ بێت، جێگای ترسناك کە دەکرا لەوێکانێدا درنج و جنی لێ بێت. جارێکیان بەدڵنیاییەوە بەبیرما دێت کە ئەو قەشمەریاتی پێکردم بۆ ئەوەی گاڵتە بە دەنکە شقارتە بکەم -یاری کردن بە ئاگر، ترسناك ترین و قەدەغەکراو ترین شتێ کە هەن.. باشە ئەو ئاگری ئەنا بە دەوەنێکی کۆن و وشکەوە لە باخچەکەدا؟ بەڵێ بێگومان- وە منیش درامە بەر شویلك لەلایەن دایکمەوە! ئاه، کە سیگنێم خۆشدەویست! وە هەندێ جار وشەی لەو بابەتەی دەوت کە مرۆ بۆی نەبوو بیڵێ. ئەوکاتەی تەز بە گازەرای پشتمەوە دەهاتە خوارێ، بەڵام من تەنها هەر ئاواتم دەخواست کە ئەو بیەوێت دووبارە بیانڵێتەوە و بیانڵێتەوە.

بەتەواوی نازانمماڵیان لەکوێ بوو. لە هەمان خانوودا بوون کە ئێمەی تیا بووین؛ منداڵەکانی تر کە من یاریم لەگەڵدا دەکردن، نەیان دەناسی، بەڵام دەبێت هەر لەسەر هەمان شەقام بووبێت -من لەو باوەڕەدام- لە خانوویەکی چکۆلانە لەنێو پەرژینێکی دارێندا. یاوەکو لەوانەیە لە نێو ژوورێك لەسەریاندا، بەلاری بەسەر شەقامەکەوە، لەگەڵ ئینجانە گوڵ بەسەر قەراغی پەنجەرەیەکەوە دەژیا؟ باشتر وایە هەر ئێستا خۆم بیڵێم ئەو لە هیچ جێگایەکدا نەدەژیا. ئەو تەنیا لەنێو فەنتازیای مندا بوونی هەبوو.

سیگنێ یەکەم داهێنراوی فەنتازیایی من بوو، بەلای کەمەوە یەکەمیانە کە من شتێکم لە یادەوەری ئەو لەبیردا مابێت. من بێگومان شەش حەوت ساڵێك دەبووم؛ وە تا لەو تەمەنەدا (هەروەك ئێ بە راستی هەروەها بە شەست، حەفتا ساڵ تەمەنیش) زۆربەی جار مرۆ بەدەنگی بەرز بیردەکاتەوە. بە کورتی بڵێم، دەرۆیشتم و لەگەڵ خۆمدا قسەم دەکرد ئەو کاتانەی فەنتازیای سیگنێم دەکرد، وە رۆژێکی جوان بێگومان ئەوە روویدا کە دایکم گوێی لێبوو.

دایکم بە باوکمی گوت:

-گوێ لە کوڕەکە بگرە، ئەو رێدەکات و قسە لەگەڵ خۆیدا دەکات!

وە بە منی وت:

-ئەوە چییە دەڕۆیت و قسە لەگەڵ خۆتدا دەکەیت؟ بیر لەچی دەکەیتەوە؟

گەورەکان خوویەکی ئێجگار ترسناکیان هەیە کە پرسیاری دوور لە هەستی پڕ سۆز لە منداڵەکانیان بکەن. رامکرد و خۆم شاردەوە.

رۆژێکی تر هەر هەمان باس -وە رۆژێکی تر هەمیسان دووبارە. شەرم کردن و ئازار چەشتن. گچکە پرسیارێك کە نەدەتوانرا وەڵامیان بدرێتەوە. باوکم پێی وتم: منداڵانێ کە تا چوار، پێنج ساڵی تەمەنیان لەگەڵ خۆیاندا قسەدەکەن، تۆ تەمەنت گەورەیە بۆ ئەو کارە، ئەوەم بۆ روونبووەوە کە ئەوە نەدەکرا بەو شێوەیە بەردەوام بێت؛ شتێك دەبێ بکرێت. ئەوەم بە مێشکا هات کە ئەوە دەنگی "س"ـە کە کارم تێدەکات: سیگنێ و سیگنێ، ئەوە پڕ بە پێستی نییە. ناوی سیگنێم گۆڕی بە نێوی ئیدا. بەو شێوەیە تا رادەیەك سەرکەوتنم بەدەست هێنا کە ئەو کەمێك لێیگەڕێم بۆ خۆی ئازاد بێت،

کەچی ئیدا بە راستی هەرگیز هەمان دەسەڵاتی تەلیسماوی دەستگیر نەبوو بەسەر مندا هەروەك سیگنێ هەیبوو. ڕۆژێك هات و بووین بە ناحەز، ڕۆشتم و شەڕم لەگەڵدا کرد و پێم گوت کچە شێتۆکە، و بێگومان بگرە کە ڕێشی تێدەچێت کە من لێشم دابێت. بێگومان پەشیمان بووم لەوە، بەڵام نەمدەویست داوای لێبوردنی لێ بکەم، ئیتر ئەوە هات کە پێی بڵێم وەل بە. لە هەمان کاتدا خۆم فێری ئەوە کرد کە بە بیدەگی بیربکەمەوە –وە بە تۆزێك ڕەزیلی کردن چەند جارێك نەبێت بەردەوام بووم لە گەڵیدا.

بەڵام ئایا لە ڕاستیدا لەچی جێگایەکدا سیگنێم بەگیر کەوتبوو؟ لە هەمان خانوودا کە ئێمە تیا دەژیاین کچێکی چکۆلانەی لێبوو، کە من هەندێ جار یاریم لەگەڵدا دەکرد. دایکی لە بالێت کاری دەکرد، وە جارێکیان تەنورەیەکی سووری کاڵی بالێتی دایکی لەبەرکردبوو. بەڵام ئەو نە ناوی سیگنێ و نە ئیدا بوو، ئەو چ نالەبارییەکی نەدەکردو دەسەڵاتی تەلیسماوی سیگنێی بەسەر دڵی مندا نەبوو. کەواتا بێگومان دەبێت ئاوەها لە نزیکەی دەووبەری تەمەنی حەوتساڵیدا سیگنێم داهێنابێ. هەروەك ئەلمانییەکە کە وێنەی حوشتری دوو کۆپارە دەکات "aus der Tief meines Bewusstseins"[1].

یانی من پێشتر ئەوەم بەسەردا سەپێندراوە.

پاشان ساڵان وەرچەرخا، و لە ڕاستیدا بۆ یەکەم جار سروشتی ئەدەبیم گەلێك درەنگ بەدەستکەوت. یەکەمین پاڵنەری بەهێز ئەوکاتە لەلایەن یەکێك لە هاوڕێیانی قوتابخانەکەمەوە هات –ئەویش پرۆفیسۆر ئالمکفیست بوو کە ئێستا لە ئینستیوتی کارولینە– لەنێوەندی وانەی زمانی دایکدا لە نیوەی دووەمی ساڵ لە پۆلی شەشدا لە قوتابخانەی نۆڕە لاتین[2]دا زۆر بە ڕوونی هۆڵەندییە باڵگرتووەکە[3]ی فیکتۆر ریودبێری[4] دەخوێندەوە. من لە خۆشیاندا بتوانم شتێکی ئاوەها بنووسم.

هەتاوەکو ئێستاش ئەو سەرکەوتنەم بەدەست نەهێناوە، بەڵام بۆچی پیاو ئاواتی لەدەست بدات.

**پەراوێز:**

*1–مانای "لە قوڵایی ناخی خۆیەوە": ئەم ڕستەیە زۆربەی جار بە ئەڵمانی دەوترێت؛ لە دوایی پێشکەش کردنەکەی هاینەی شاعیر بۆ پێشانگایەك لە "ساڵۆنگ"ی "پاریس" لە ساڵی 1843 دەربارەی تابلۆیەك (یودا چاوی دەکەوێت بە تامارا) لەلایەن هونەرمەندی فەرەنسی "Horace Vernet" کە هونەرمەند وێنەیەکی کۆپیکراوی حوشترێك ڕاستەوخۆ لە سروشتەوە لەسەر تابلۆکە دەنەخشێنێت وە نەخوازەڵا –وەکو هونەرمەندێکی ئەلمانی کە ئەوەی بکردبایە– ئەوەی بێفراندبایە– "aus der Tiefe seines Gemuts". لێرەدا کەمێك دەستکاری کراوە.*

*2–"Norra Latin": قوتابخانەیەکی ناسراوە لە ستۆکهۆلم وە تاوەکو ئەمڕۆش تیایدا دەخوێندرێت.*

*3–"Den flygande hollandaren": داستانێکە بە گەلێك زمان نووسراوەتەوە وە سەرەتاکەشی دەگەڕێتەوە بۆ هێزی دەریایی ئینگلیزی کە گوایە ئاخردا "کەشتیوان"ێکی هۆڵەندی بەناوی "ڤان دێر دێکن" لەسەر کفرکردن سزای هەتا ڕۆژی قیامەت گێژخواردن بوو بەنێو کەناڵی ئینگلیزیدا. لێرەدا هێما بۆ ئەو چامەیە دەکرێت کە بەو نێوەرە لەلایەن فیکتۆر ریودبێرییەوە نووسراوەو لەنێو دیوانە شیعری "شیعرەکان"دا بڵاوکراوەتەوە.*

*3–"Viktor Rydberg": "1828–1835" یەکێکە لە شاعیرە هەرە بەرزەکانی سویدو خاوەنی ڕۆمانی "سینگوالا"یە.*

## هێلکارییەکە

**(1897)**

ڕۆژێکی نیسان پێش چەندین ساڵ بەر ئێستا، لەو سەردەمەدا کە هێشتاکانێ بیرم لە مانای ژیان دەکردەوە، لە پشتە کۆلانێکدا چوومە ژوورەوەی دوکانێکی چرووت فرۆشیەوە بۆ ئەوەی چرووتێک بکڕم. چرووتێکی قاوەیی و گوشەداری "ئێل زێلۆ"م هەڵبژارد. خستمە پاکەتەکەمەوە، پارەکەیم دا و خۆشم ئامادەکرد بۆ ئەوەی بڕۆم. بەلام کوتوپڕ ئەوە هات بە خەیاڵما کە هێلکارییەکی بەدەست کێشراوی بەمەرەکەب، کە من بە ڕێکەوت لە گریفانمدا لەنێو جزدانەکەمدا بوو، پێشانی ئەو کیژە لاوەی بدەم کە لە دوکانەکەدا وەستابوو وە زۆربەی جاریش ڕاهاتبووم کە لەلای ئەویش چرووتەکانم بکڕم، ئەوەم لە هونەرمەندێکی لاوەوە پێدراوە. وە بە حەزی من ئەوە زۆر جوان بوو.

—سەیری ئێرە کە، "من وتم و ئەوەشم بەدەست بۆی درێژکرد"، بۆچوونی تۆ بۆ ئەمە چییە؟

کیژەکە خستیە نێو دەستی بە مەیلێکی فزولییەوە وە ماوەیەکی درێژ و زۆر لە نزیکەوە سەیری کرد. کیژەکە لە گەلێك لاوە ئەمدیو ئەودیوی کرد، وە سیمای ئاڵۆزی هزری ئەوی دەنواند. وە تا کیژەکە لە کۆتاییدا بە نیگایەکی پڕ لە حەزی زانینەوە پرسیاری کرد:

—ئێ، ئەوە چ مانایەك دەبەخشێ؟

—ئەوە چ مانایەکی تایبەت نادات، "من وەلامم داوە". ئەوە تەنها دیمەنێکی سروشتییە. ئەوە زەوییە و ئا ئەوەش ئاسمانە، وە ئا ئەوەش ڕێگایەکە.. ڕێگایەکی ساکار..

—ئا، ئێ خۆی دەبێت من ئەوە ببینم، "کیژەکە مۆڕەیەکی تا ڕادەیەك بە ئاوازێکی نادۆستانەوە کرد"، بەلام من دەمەوێت بزانم مەبەست لەوە چییە.

من بە دۆشداماوی و شەرمەزارییەوە ڕاوەستابووم؛ من هەرگیز نەهاتوومەتە سەر ئەوەی بیری لێ بکەمەوە، کە ئەوە مانایەکی هەبێت. بەلام تێگەیشتنی ئەو جێگیربوو وە جێلەق نەدەبوو؛ ئەوە بۆخۆی جارێکیان وا حاڵی بووبوو کە تابلۆکە جۆرێك بێت لە "گوانی پشیلەیەك؟" دەنا بۆچی من ئەوەم نیشاندابوو؟ تا لە کۆتاییدا ئەوەی بەقەد جامی پەنجەرەکەوە ڕاگرت بۆ ئەوەی کە ئەوە بە شەفاف کات. ڕێی تێدەچێت کە جارێك لە جاران کەسێك جۆرە کاغەزی پاریکردنێکی سەیری پیشاندابێ، کە لەژێر ڕووناکی ئاساییدا کاغەزی دیناری نۆ یاوەکو کاغەزی پاسەوانی ماچە دەبینرا، بەلام کە ئەوکاتەی پیاو بەرامبەر بە ڕووناکی ڕایدەگرێت، شتێکی کەی بێئابڕوانەی پیشاندەدا.

بەلام پشکینینەکانی هیچ دەرئەنجامی نەدا. دووبارە وێنەکەی بۆ گەڕاندمەوە، و منیش خۆم ئامادەکرد بۆ ئەوەی بڕۆم. ئەوجا ئەو کیژە بەستەزمانە بە جارێك زۆر سوورەوە بوو و بە قوڕگی پڕ لە گریانەوە تەقییەوە:

—داوەشێیت، بە ڕاستی زۆرناشیرنە بۆ تۆ هەر ئاوەها بمکەی بە گاڵتەچی. من زۆر چاك دەزانم کە من کچێکی هەژارم، کە توانای ئابووریم نەبوو تا بتوانم ڕۆشنبیری زیاتر بەدەست بهێنم، بەلام تۆ پێویست ناکات لەبەر ئەوە بمکەی بە گاڵتەچی، ناتوانی پێم بڵێی تابلۆکەت چی مانایەك دەیەخشێ؟

چی وەلامێك بدەمەوە؟ زۆر شتم دەدا بۆ ئەوەی پێی بڵێم ئەوە مانای چییە؛ بەلام من ئەوەم پێنەکرا، چونکە ئەوە هیچ مانایەکی نییە.

*

ئا ئەوە چەندین ساڵە بەدوای ئەو ڕووداوە. چرووتی کە دەکێشم و لە دوکانێکی کەش دەیانکڕم، وە ئیتر ئێستا بیر لە مانای ژیان ناکەمەوە؛ بەلام ئەوە لەبەر ئەوە نییە کە من باوەڕم بەخۆم هەیە کە ئەوەم دۆزیوەتەوە.

## خەو بە جاویدانییەوە

(1897)

لە کاتێکدا من مێشتاکە زۆر لاو بووم، بەدڵنیاییەکی تەواو پڕەوە باوەڕم هەبوو، کە من گیانێکی نەمرم هەیە. من ئەوەم بەخەڵاتێکی پیرۆزو بەنرخ دادەنا، وە بۆ ئەمە من خۆشبەخت و سەربەرز بووم.

زۆربەی جار بە خودی خۆم دەوت:

—ئەم ژیانەی من تیایدا دەژیم ژیانێکی لێڵ و سەرلێشێواوە، جارێك دێت کە من لەخەو رادەبم بۆ نێو خەونێکی تر، کە لە راستییەوە نزیکترەو مانایەکی قووڵتری دەبێت لەوەی ئێستا. لەنێو ئەو خەونەوە رادێم بۆ نێو خەونی سێیەم وە پاشان بۆ نێو خەونی چوارەم، و هەر خەونێکی نوێ لە راستییەوە نزیکترە وەك لەوەی پێشوتر. ئەم نزیکبوونەوە لە راستییەوە مانای ژیان دروستدەکات، وە ئەوەش دامێنەرو پڕمانایە.

وە لەبەر خۆشی زانین، کە من لەنێو گیانی نەمریمدا سەرمایەیەکم هەبوو، کە نەدەتوانرا بە قومار بیدۆڕێنم وە نە لەبەر قەرز دەستی بەسەردا دەگیرا، ژیانێکی بێ سەرو بەرم بردە سەر و وەك میرێك دەست بڵاویم کرد لە هەرچییەك کە خاوەنی بووم و هەرچییەکیش کە خاوەنی نەبووم.

بەڵام رۆژێکیان خۆم لەگەڵ هەندێ لە برادەرانی تەیلەکەم لە سالۆنێکی گەورەدا بینییەوە، کە بە ئاڵتوون و رووناکی کارەبایی دەبریسکایەوە، وە لە درزی زەوییەکەیەوە بێنێسك لە بۆگەنکردنەوە بەرزدەبووەوە. دوو کیژی دەموچاو ئارایش کراو و پیرەژنێك بە لۆچی پڕ لە بۆرەکەوە لەوێدا لەسەر سەکۆی دواندندا سەمایان دەکرد، بەدەم دەنگی ئاهەنگی ئۆرکستراوە هاتوهاواری هاندەرانەی پیاوان و زرنگەی شووشەی شکاو. ئێمە تەماشای ئەم ژنانەمان دەکرد، زۆرمان خواردەوەو گفتوگۆمان لەسەر نەمری گیان دەکرد.

یەکی لە هاوڕێکانم، کە لە من بەتەمەنتر بوو وتی:

—ئەوە شێتییە کە باوەڕ بکەی، کە ئەوە بەختیارییە تۆ خاوەنی گیانێکی نەمر بیت. سەرنجی ئەم پیرەژنە بدەن، کە لەوێدا سەمادەکات، و سەرو دەستەکانی دەلەرزێتەوە، کە ئەو یەك چاوترکانێك بێ جووڵە رادەوەستێت. پیاو یەکسەر دەبینێ، کە ئەو بەدو ناشیرینەو بەتەواوی بێ نرخە، وە رۆژ لە دوای رۆژ زیاترو زیاتر خراپتر دەبێ. ئەوە گاڵتەجاڕییەك نییە بیری لێ بکەیتەوە، کە ئەو گیانێکی نەمری هەبێت! بەڵام ئەوە بەتەواوی هەر بە هەمان شێوە لای من و تۆو ئێمە هەر هەموومان رادەوەستێ. دەبێ چی نوکتەیەکی خراپ نەبێت کە جاویدانیمان پێ ببەخشرێت!

من وەڵامم داوە:

—ئەوەی کە لە هەمووی زیاتر ناڕازیم دەکات لەوەی کە تۆ دەیڵێیت، ئەوە ئەوە نییە، کە تۆ نەمری گیان رەت دەکەیتەوە، بەڵام ئەوەی، کە تۆ خۆشییەك دەدۆزیتەوە لەوەی کە ئەوە رەت دەکەیتەوە. مرۆڤ بە منداڵ دەکات، کە لە باخچەیەکدا یاری دەکات بە دیوارێکی بەرز دەورەدراوە. جار لەدوای جار دەروازەیەك لە دیوارەکە دەکرێتەوە، وە یەکێك لە منداڵەکان بە نێو ئەم دەروازەیەدا ون دەبێت. ئەوجا پیاو بەوانی کە دەڵێت، کە ئەوان بردران بۆ باخچەیەکی دیکە، کە گەورەترو جوانترە لەمە: ئەوجا بۆ تاوێك لەژێر بێدەنگیدا گوێدەگرن، وە پاشان ئەوان بەردەوام دەبن لە یاریکردن لەنێو گوڵەکاندا. ئێستاکە گریمان، کە یەکێ لە کوڕەکان لەوانی کە زیاتر برسی زانینە وە هەڵدەگژێت بە دیوارەکەدا بۆ ئەوەی ببینێ،

هەڤالان بۆ کوێ ڕۆیشتن؛ وە کاتێك دووبارە دێتە خوارەوە، چی بینیوە بۆ ئەوانی کەی دەگێڕێتەوە: لە دەرەوەی دەروازەکە دێوێك دانیشتووە، ئەو منداڵانە دەخوات کە دەبڕێنە دەرەوە. وە ئەوان پێویستە بەنۆرە و ڕێکوپێکی بەنێو دەروازەکەدا بڕێن! تۆ ئەو کوڕەیت، تۆ ئەو کوڕەیت، مارتین؛ وە من ئەوە بە قەشمەرییەکی باس نەکراو دەبینم، کە تۆ باسی ئەوە دەکەیت کە باوەڕت وایە کە بینیوتە، پڕ نەبوویتە لە گومانکردن، بەڵکو سەربەرزو شادمانی بە زانینی زیاتری لەوانی کە.

مارتین وەڵامی دامەوە: –گەنجترین کیژ لەنێو ئەو کیژانەدا زۆر جوانە.

یەکێ لە هاوڕێکانم ووتی: –لە ناوچوون ترسناکە، وە هەروەها زۆر ترسناکیشە کە نەتوانی لەناو بچیت.

مارتین بەردەوام بوو لە بیرکردنەوەکەی، و ووتی:

–بەڵێ، پیاو دەبوایە نیوەڕێگایەکی بدۆزیبایەتەوە، وڵاتەکانت لەخۆت قایم بکەیت و بکەویتە ڕێ و پێشنیازێکی گونجاو لەنێوان کات و جاویدانی بدۆزیتەوە. ئەوەی ئەوە دەدۆزێتەوە دەتوانێ ئاینێکی کە بونیات بنێ؛ چونکە ئەو ئەوکاتە دەسەڵاتی خۆی هەیە و باشترین چەشەی ماسیگرتنی هەیە کە هەرگیز هیچ ماسیگرێك خاوەنی نەبووبێت.

ئۆرکسێتەکە بە تەقومورێك کۆتاییان پێهێنا. بریقوباقە ئالتونییەکەی سالۆنەکە بەنێو دەرگاکەوە لاواز دەبووەوە، و لە درزەکانی زەوییەکەوە تا دەهات زیاتر بۆی گەنێك خۆی دەترازاندە سەرەوە.

کۆتاییمان پێ هێناو هەریەکەو بەڕێی خۆیا بڵاوەمان لێکرد. ماوەیەکی درێژ بەرەو پێش و بەرەو دوا بەنێو شەقامەکاندا گێژم دەخوارد، دەچوومە نێو جادەیلێك کە من نەمدەناسینەوە وە کە هەرگیز دواتر دووبارە نەمدینەوە، چارەنووسێکی سەیرو جادەیلێکی چۆڵ، ماڵی چی کەسێلێك وا دەردەکەوێت ڕێگەم بۆ دەکەنەوە بۆ ئەوەی ژوورێکم بۆ ئامادەکەن، بۆ هەر جێیەك هەنگاوەکانم دەئاژووت، وە پاشان دووبارە لە پاشی پشتمەوە کۆتایی پێدەهات. نەمدەزانی خۆم لە کوێدا دەبینمەوە، پێش ئەوەی بە پڕێك لەبەردەم دەروازەکەی خودی خۆمدا وەستابووم، ئەو درابووە سەرلا. بەنێو دەروازەکە چوومە ژوورەوە و بە پێپلیکانەکاندا سەرکەوتم. لەبەر یەکێ لە پەنجەرەکانی پێپلیکانەکەدا راوەستام و تەماشای مانگم کرد، پێشتر سەرنجی ئەوەم نەدابوو کە ئەو شەوە مانگەشەو بوو.

بەڵام من هەرگیز نە پێشتر و نە پاشتر مانگم بەو شێوەیە نەدیبوو. پیاو نەیدەتوانی بڵێ کە ئەو ڕووناك بوو. ئەو خۆڵەمێشی و بێڕەنگ و گەورەیەکی ناسروشتی بوو. ماوەیەکی درێژ راوەستام و چاوم بڕیبووە ئەو مانگە، گەرچی لە رادەبەدەر ماندوو بووم و بۆ نووستن سوێم بووبووەوە.

ماڵم لە نهۆمی سێیەمدا بوو. ئەوکاتەی دوو پێپلیکانە سەرکەوتبووم، سوپاسی خوام کرد، کە تەنها یەك پێپلیکانەم مابوو، بەڵام ئەو کاتەی کە چوومە سەرەوە بۆ ئەو پێپلیکانە، ئەوەم بەبیردا هات، کە بەر هەیوانەکە تاریك نەبوو، کە دەنا هەردەم تاریك بوو، بەڵکو بە کزی ڕووناك بووبووەوە هەروەکو داڵانەکانی دیکە، کە مانگ لەوێدا لە پەنجەرەی پێپلیکانەکانەوە ڕووناکی دەدا. بەڵام تەنها سێ پێپلیکانە هەبوو لەم خانوەدا، جگە لە هەورەبانەکە؛ بۆیەکە بەرهەیوانەکەی سەرووی هەموویان هەردەم تاریك بوو.

–دەرگای هەورەبانەکە کرایەوە، "بەخۆم وت". ڕووناکییەکە لە پێپلیکانەی هەورەبانەکەوە دێت. ئەوە ناپارێزگاری کردنە لەلایەن خزمەتکارانەوە کە

دەرگای هەورەبانەکە بەکراوەیی بەجێبێڵن، خۆ دز دەتوانێ بێتە سەرەوە بۆ هەورەبانەکە. بەڵام هیچ دەرگایەکی هەورەبان لەوێدا نەبوو. لەوێدا تەنها پێپلیکانەیەکی ئاسایی هەبوو، هەروەك ئەو پێپلیکانەکانی دیکە.

کەواتە من بەهەڵە ژماردبوومن؛ من هێشتاکە پێپلیکانەیەکم مابوو.

بەڵام ئەوکاتەی هاتبوومەوە سەرەوەی ئەو پێپلیکانەیەو لەبەر هەیوانەکە راوەستابووم، دەبێ زات بدەمە بەر خۆم بۆ ئەوەی بە بەرزی هناوار نەکەم. چونکە تەنانەت ئەم بەرهەیوانەش رووناك بوو، وە نەخوازەڵا لەوێشدا دەرگای هەورەبانێك کراوە بوو، بەڵام پێپلیکانەیەکی نوێ دەچوو بۆ باڵا هەروەك ئەوەی ئێستاکانێ، وە لە پەنجەرەی پێپلیکانەکەوە مانگ رووناکی دەداوە ژوورەوە، وە مانگەکە خۆڵەمێشی و بێ درەخشانەوەو ناسروشتیانە گەورە بوو.

بە پێپلیکانەکاندا بۆ سەرەوە تەکانم دا، لەوە زیاتر بیرم بۆ نەدەهات. بەلارەلار چوومە سەرەوە بۆ مەم یەکێکی کە، و مەم یەکێکی کە؛ لەوە بەدوا ئەوانەم نەدەژمارد.

دەمویست هاوار بکەم، دەمویست تا ئەو خانووە جادولێکراوە بێدار بکەمەوە وە مرۆڤ لە دەوروپشتی خۆم ببینم؛ بەڵام گەرووم بە بەن دەمی دوورابووەوە.

لەپڕدا کەوتمە نێو بیری ئەوەی کە بەخوێندنەوەی ناوەکانی سەر تەختەناوی دەرگاکان بگەڕێم. باشە دەبێ چی مرۆڤێك بن کە توانیویانە لەم هەڵواسراوانەی بابلدا بژین؟ رووناکی مانگەکە کزبوو، گرم دا بە دەنکە شقارتەیەك و بەتەواوی بەقەد تەختەیەکی مسینی سەردەرگایەك راگرت.

لەوێدا نێوی یەکێ لە هاوڕێکانم خوێندەوە، کە مردبوو.

ئەوکاتە زمانم بەربوو و هاوارم کرد:

-هاوار! هاوار! هاوار!

*

ئەو هاوارە بوو بە رزگاریکەرم، چونکە ئەوە لەو خەوە زۆر ترسناکەی دەربارەی جاویدانی بێداری کردمەوە.

## تاجشە کرۆکەکە(1)

(1897)

جارێکیان هاوڕێیەکی تازەم پەیداکرد.

رۆژێکیان لە یەکێ لە چێشتخانە هاوینییەکاندا پێکەوە نانی نیوەڕۆمان خوارد. من هەزێکی گەلێك زۆر کەمم بۆ خواردن هەیە، جۆری خواردنەوەکانم ناکەوێتە بیر: تەنانەت دڵنیاش نیم لەوەی کە من لە کاتێکدا دەیانخۆم ناویان بزانم. لەگەڵ ئەوەشدا چاکم بەبیردا دێتەوە، کە ئێمە لەنێو ئەوانەدا هەریەکەو بە خواردنی تاجشە کرۆکەکەمانەوە کاتمان بەسەر دەبرد، و لەگەڵ ئەوانیشدا بۆرگۆنێك(2)ی گەلێك خۆشمان خواردەوە. من هەردەم حەزم لە شەکرۆك بووە، هەروەها شێوە بەرجەستەییە تایبەتییە پولەکەدارو سەوزە تۆخەکانیان، هەرگیز خۆم بۆ لەزەتێکی وا نایابی وەك ئەو جارە ئامادە نەکردووە.

رۆژەکەی خۆش بوو، رۆژێکی کاڵی سەپتەمبەر: یەکێك لەو رۆژانەی پایزێکی پێش وەخت داهاتووە بەخت هێنەرانە، ئەو رۆژانەی کە رووناکییەکانیان و ماخولیا کەمەکەیان پێشتر هەندە جار فریای ئەوە کەوتبوو کار لە ئەستمان بکات، کە ئەوە ئەو هەستە هەڵچوونەی ئێمە کە پێشتر بانگیش کرابوو قەمچی کردوون رێیان پێدرا بچن بۆ پشوودان بۆ ئەوەی جێگا چۆڵبکەن بۆ هەستکردنێکی زیاتر لە ئاسودەیی دونیایی. ئاسمان پاك و شین دەدرەوشایەوە، گەزەندەکان لەنێو گەڵاڕێزانەکانی بان سەرمان و دەوروپشتمانەوە وێزەوێزیان بوو، ئاوەکە

دەدرەخشــایەوە، میناکــە و شــارەکە لـــە دوورەوە تارماییان دیاربوو.

ئا، ئەوە رۆژێکی گەلێك خۆش بوو.

لـــە کـــاتێکدا گلاســـەکەم رووەو خۆرەکـــە بەرزکردبووەوە و بــە چاوێکیشــم پرتــپرتم دەکــرد، پرسیارم لە هاوڕێکەم کرد:

–شەکرۆکەکەی مــن زۆر بەشکۆیە، ئــەی ئــەوەی تۆ چۆنە؟

هاوڕێکەم وتی:

–ئێجگار بێ وێنەیە، هــەندەی تر لـــەوەی تــۆ چاکترە.

ئـــەو بـــە پێکـــەنینێکی تاریکـــەوە ئەوەشـــی خستەسەر، کە ئێخۆ لە راسـتیدا غـەوارە بـوو لەگـەڵ دەموچـاوە ساغ و سووری گوڵەباخییەکەی لەگــەڵ ماسولکە بەندییە خۆرەتاو کردووەکەیدا.

–مــن بەتایبــەت حــەزم لــە شــەکرۆکە، ئــەوە پاشـتامێکی لە ترشـی پرووسـیك(3)بیانــەی هــەندە بەلەزەتی هەیە.

من بۆ پشتگیری کردنی ئەو بەمزو بـرژاوی سەرم بۆی لەقاند، لە کاتێکدا خەریکی هەڵمژینی یـەکێك لـە گـەورەترین پۆلـەکان بـووم، کــە بــۆ دوایـی بــەجێم هێشتبوو. ترشی پرووسیك، با وابێ.. مـن ئـەوەم بە شتێکی باوەڕ پێکـراو نـەدەبینی کـە رۆـی تێ بچێـت تاجشـە کرۆك تـامی ترشـی پرووسـیك بـدات،.لــەنێو هەموو رووداوەکاندا لە تواناما نەبوو گفتوگـۆ لەسـەر باسەکە بکەم.

گەزەندەکان ویزە ویزیـان دەکـرد. ئاوەکـە لـەنێو دارەکاندا دەبریقایەو. ئیتر هەورێکی بچکۆلانــە خزایە سەر خۆرەکە.

ئیتر نازانم بۆچی هاوڕێکەم ئـەوەی بـە پێویسـت دەبینـی کـە هـەر ئێسـتا دەسـت بـە گفتوگۆ لەسـەر رووداوێکـی ناڕەحـەت کـەر بکـات، کـە لـەو رۆژانـــەدا تێپــەڕی کردبــوو وە کارەسـاتێك کـــە یـــەکێ لـــە هاوناسـیاوە فانییــەکانمان رۆڵــی ســـەرەکی تێـــدا بینیبوو.

ئەو وتی: بە راستی بەسەرهاتێکی تۆقێنەرە.

لەوەدا ئەو راستی دەکرد، چونکە ئەوە بەراسـتی وابوو. بەڵام بۆچی ئەو ئێستا باس لەو شـتە دەکات، ئایا لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت کە هـەورێك خـزاو بـەری مانگی گرت؟ بەهەموو دڵنیاییەکەوە یەکسـەر وەڵامـم داوە:

–بەڵێ، بەراسـتی ئـەوە زۆر خـەمناك بوو. ئـەوە هەر سەر لەبەیانی زووی دوێکە بوو پێـم زانـی، و مـن هەر هەموو پێش نیوەڕۆکە خەم دایگرتبووم.

راستییەکەی ئەوەیە کە من زۆربەی جـار هـەموو پێش نیوەڕوانێك هەستدەکەم خەم دامدەگرێت.

هاوڕێکەم بـەبێ ئـەوەی چـاو بـتروکێنێت وەڵامـی دامەوە:

–بـەڵێ، مــن ســەراپای شــەو خـــەو بـــە چــاوم نەکەوتووە.

هیـچ وەڵامێکـم نـەداوە، بـەڵام لـەژێرەوە بـــەدزە نیگایەکی تا رادەیەك سارد سەرنجیم دەدا. هاکـا ئـەو مەنوکە پەلەپەل لێکراوەیە لە هـەموو لایەنێکـەوە لـە بەرامبـەر دژە هاوبڕکێکـەیدا، دەبێـت بـە شـتێك کـە بەرگەی ناگرێت.

مـن یەکسـەر ئـەو دەربڕینـەی ئـەوم هێنایـەوە خـەیاڵم، کـە تاجشـە کـرۆك تـامی ترشـی پرووسـیکی هەیـە؛ و یەکسـەر خـەیاڵێکم بـۆ هـات. لـە سـ رەتای ؛ کتری ناسـیندا پیـاو لـە بـەرچاوی یـەکتریدا کـەمێك خۆیـان عـەرز دەکـەن. ئەگـــەر بێـــت و مـــن داوێکـــی بچکۆلانـــە بنێمـــەوە وەکـــو چەشـــەیەك و ترشـــی پرووسیکی پێوە بکەم، ئایا ئەو خۆی دەدا لەو داوە؟ باببینین.

بـەگرێی پـەنجـەی شـایەتمان لابـــەلا تێـم ژەنــدو بەتونێکی گرنگی پێدان، زۆر چالاکانە لێم پرسی:

–ئەوە چی بوو کە تۆ لە پێش تۆزێکا وتت، ئایا تاجشە کرۆك تامی ترشی پرووسیك دەدات؟

ئێخۆ ئەوە مەحاڵە بۆ ئەو کە بزانێ من بەتەمای کوێم: ئەوەی کە من دەمتوانی لە دەموچاوی ئەودا بیخوێنمەوە ئەوا هێشتاکە تەنها بڕیارێکی جێگرە کە تا ئەوپەڕیشی خودی تاقیکردنەوەکە پارێزگاری لە خودی باوەڕنامەی کۆتایی دەکات.

بەخەندەیەکی چکۆلانەی هێمنەوە وەڵامی داوە: بەڵی بێگومان، ئایا تۆ پێشتر ئەوەت نەزانیوە؟

–نەخێر، من ئەوەم نەزانیوە. کەواتە من نازانم ترشی پرووسیك تامی چی دەدات. بەڵام لەوانەیە تۆ بزانیت چۆنە؟ هەرچەندە پێم کرا بەستەزمانانە ئەوەم خستە سەری، هەروەکو بڵێی بەخێرایی بە تەنیشتا تێپەڕ بکەیت. فەرهەنگە تازەکە لەوێدا کەوتبوو. ئەو ئاگادار نەبوو، کە من لەسەر پلانێکی روونەوە قسەم دەکردو کەوا هیچ هۆیەك نەبوو کە من بە مەبەستەوە شتێك زیاد بکەمە سەر پرسیارەکە؛ ئەو دەبێت ئەو رێکەوتە تاوانبار بکات، خۆشی بێ سنووری قسەی بۆش. من بەلای خۆمەوە هەموو شتێکم کرد بۆ ئەوەی ئەو تێگەیشتنە لەلای ئەو دروست بکەم؛ هێشتا بەتەواوی قسەم نەکردبوو، پێش ئەوەی بانگی ساقییەکەم کردو منگە منگێکم دەربارەی چروت کرد، ئەو ماوەیەی کە هەر ئەوکاتە پرسیارەکە شێوازی وەرگرت بەوەی کە بە رێکەوت پێشنیاز کراو لە هەمان ساتەوەخت کە پێشنیاز کرا لەبیر چوەوە، بەهەر شێوەیەك کە پیاو بتوانێ یا نەتوانێ وەڵامی بداتەوە، هەرکامیان بێت هیچ مانایەکیان نییە. کەواتا پێویستە بەخۆم بڵێم، کە ئێخۆ بۆچوونێك هەیە، ئەگەرچییەکیش لاوازە، کە بەراستی هاورێکەم کە جارێك لە جاران کارێکی لەگەڵ ترشی پرووسیکدا هەبووە، وە لەگەڵ ئا ئەم رێتێچوونە بەتەواوی لەبەر چاو زۆر بچوکە ئەوا ناچار بووم بەوەی پرسیارەکە بەشێوەیەك بکەم، کە بواری ئەوە بۆ ئەو برەخسێت خۆی لێ گێژبکات. گەر ئەو ئەوەی بەو شێوەیە بووبێت. بەڵام ئەو خۆشبەختانە نەیدەویست، لە هەمان کاتدا منیش حیسابی ئەوەم کردبوو.

ئیتر پاش چەند چرکەیەکی شەڕی رۆحی بەرچاو بە برۆی گرژەوە بووەوە وەڵامی دامەوە:

–تۆ خۆت لە بابەتێك دەدەیت، کە من لەبەر چەند هۆیەك رقم هەڵدەستێت لەوەی خۆم بکەمە نێو مجادەلەیانەوە. با ئێمە باس لە شتێکی کە بکەین!

قیوقرم لێکرد؛ بەڵام لەناخی ناخمەوە هەلایەکی بێدەنگ بڵند دەبووەوە.

وە هەتاوەکو ئەم رۆژەش، لەکاتێکدا بەهۆی نووسینی ئەو بەسەرهاتە بێ مانایەی کە دەینووسمەوە بە دوای کەمکردنەوەی ساتێکی بۆش و فریودەر دەگەڕێم، وە هەتاوەکو ئەمڕۆکەش ئەو تاجشە کرۆکەیە شادمانم دەکات، کە بەر لە سێ ساڵ زیاترە کە من خواردوومە.

**پەراوێز:**

*1–تاجشە کرۆك (تاجکەرتەشی): "Cynaru scolynus" رووەکێکە هەر لە چاخی ئەنتیکەوە لەناوچەی دەریای ناوەڕاستدا دەچێنرێت بۆ خواردن. رووەکێکی دڕکاوییە گوڵەکەی دەخورێت و دەزوولەی ملری بەسەرەوەدایە.*

*2–بێرگۆن: نیۆی فینێکە.*

*3–"Prussic": جۆرە ئاوێتەیەکی کیمیاوییە.*

## فەرووەکەی یالمار سوێدەربێری

### نووسینی: تۆشین هیگێرفۆش

لە نیسانی ساڵی **1898**دا "سەرگوزشتۆکەکان"ی یالمار سوێدەربێری بڵاوکرایەوە. بەرگەکە بیست پەخشانە شیعری لەنێو خۆدا گرتبوو، هەر هەموویان پێشتر لەجێگای جیاجیادا بڵاوبوونەوە، ژمارەیەکی زۆریشیان لە رۆژنامەی "سفێنسکە داگبلادێت" لەنێو "سەرگوزشتۆکەکان"دا "فەرووەکە" پایەیەکی تایبەتی هەیە. بە تەنها ئەویان، ئەوکاتەی کە بۆ یەکەمجار لە رۆژنامەی ناوبراو لە ساڵی **1897**دا بۆ خوێندنەوە بڵاوکرایەوە، سەرناوی چیرۆکی پێ بەخشرابوو. بەڵام وە هەروەها لەبەرئەوەش بوو کە لە بونیادی دراماتیکیانەی کاریگەری پاشینەی دوا مەبەستی چیرۆکەکەدا مۆپاسانی وەستای ستیلی چیرۆکنووسی ساڵانی **1800**ی فەرەنسی لە هزردا بووە.

"فەرووەکە" بەجۆرێك لە راڤەکردن، سەرەتایەکی خۆئامادەکردنی پێ دراوە. لەمەیاندا نووسەر زانیاری دەربارەی وەرزی ساڵ و رۆژ بۆ بەسەرهاتی چیرۆکەکەو نازناوی ئەو کەسە پیاوانەی رۆڵی تیادا دەبینن بە دەستەوە دەدات. رێگەمان دەدرێت بزانین. کە ئەوە زستانێکی نائاسایی ساردبووە، کە کات بووە بە شەوی یەلدا و پاڵەوانە سەرەکیە پیاوەکان نازناویان ریکارت و هێنکە، ئەوەی پێشەوەیان بەڕێوەبەری جێبەجێکەرە لە دەزگایەکی تازە دامەزراودا، زگورتییە و فەرووداره، ئەوەی دواوەیان دکتۆرێکە بە ژنێکی جوان و سێ منداڵەوە و بێ فەرووە. بەهۆی بەخشینی پایەی سەردادوەری هەرێم بە ریکارت، نووسەر ئەوەی داوە بەدەستەوە کە رووداوی چیرۆکەکە لە سوید روویداوە.

ئەو لە سەرەتای خۆئامادەکردنەکەدا رێگە بە گومانکردنی هۆشیاری ئۆسکار وایلد ئاسا بەخۆی دەدا: "هەندێك مرۆڤ هەن کە ژن دەهێنن قەڵەو دەبن، هی تریش هەن کە لەڕواڵواز دەبن". وە ئەو دوابەدوای ئەم رستەیە ئەوە ئاشکرا دەکات، کە هێنك لە ماوەی ژن هێنانیدا لە ڕواڵواز بووە. پاش ئەم ئاشناکردنەی خاوەن رۆڵەکان رووداوەکە دەتوانێ دەست پێبکات.

لە دیمەنی یەکەمی چیرۆکەکە رێگەمان پێ دەدرێت گوێ لە مۆنۆلۆژێکی هێنك بگرین. ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبێت کە ئەو دکتۆرە، کە ئەو لەماوەی ئەو ساڵەی لە تێپەڕبووندایە عیادەیەکی زۆر کەم دەرامەتی بەڕێوەبردووە. کە ئەو هەست بە ماندووبوون و نەخۆشی خۆی دەکات و ئاواتەخوازە، کە ئەو هەرچۆنێك بێت ماکاو دەمرێت، ئەوە دەبێ بەر لەوەی کە قستی تەئمینی ژیان کە لە کۆتایی مانگی کانوونی دووەم، کاتی دانی دێت روویدات. لە مۆنۆلۆژەکەدا نووسەر لە شێوەی پەیوەندی نێوان کەسەکاندا زانیاری پێیانەوە پەیوەست کردووە، کە هێنك لە کاتژمێری سێی پاش نیوەڕۆی شەوی یەڵدادا بەڕێوەیە بۆ لای ریکارتی هاوڕێی دێرینی بۆ ئەوەی پارەی لێ قەرزبکات و کە ئەو کەسەش پێشناوی جۆنە.

دیمەنی دوای ئەوەی بەتەواوی بە هێمای پەیوەندییەوە بەڕێوە دەچێت. سەرەتا لەوێوە بۆمان ئاشکرا دەبێت، کە رووداوەکە لە ستۆکهۆلم روودەدا،،، ئەو شارەی، کە یالمار سوێدەربێری وەکو

قەڵەمڕەوێکی تایبەتی بۆ خۆی قۆرخـی کردبـوو. بەتەواوی لـەو کاتـەی هێنـك لـە چوارڕێیـانی جادەی ڕژێم و جـادەی مینـا تێپـەڕدەکات پێـی دەخـزێ و بەدەما دەکەوێت. بەشێکی درێژبـووەوەی تـاخوڕکێك کە بە تەنیشتا ڕەتبووە شەبەقێکی گەورە لە پاڵتۆکە دروسـت دەکـات. پاشـان یارمـەتی دەدرێت بکەوێتـە سەرپێی خۆی و بەو موناسەبەشەوە لەلایەن خـەڵکی بەدەنگـەوە هاتوویـەوە خـەریکی دەبـن -"کـوڕە شـازادەیەك لەوانـەی مـاڵی پاشـا". لەگـەڵ ئەوەشـدا بـەهۆی ئامـادە بوونیـەوەو دەستنیشـان کردنـی جێگاکە بـۆ سـتۆکهۆلم بـەهێزتر دەکرێـت- دەتوانـی بەردەوام بێت لەو پیاسە پچڕاوەی.

دیمەنی سێهەم لە نووسینگەکەی ریکارتدا نمایش دەکرێت. هێنك لەلایەن ریکارتەوە تەنها سـەد کرۆنـی پێ بەقەرز نادرێت بەڵکو هەروەها فەرووەکەیشی، کە وەکو شـێوەیەکی ئاسـایی ریکـارت بـۆ نـانی شـەوی یـەڵدا لـەماڵی هینکـەوە بـانگێش دەکرێـت. لـەم دیمەنـەدا دیـالۆگی بەرسـڤەکان و پەیوەندییـەکان ئـاڵوگۆڕ لەگـەڵ یـەکتریدا دەکـەن. دیالۆگـەکان بـە تەواوەتی خەست کراونەتەوەو پەیوەندییـەکانیش بـۆ بچووکترین شێوە بچووك کراونەتەوە.

نووسەر بە ئەستێرەیەك کۆتـایی بەشـی یەکـەمی چیرۆکەکـەی نیشـان کـردووە. بەشـێوەیەکی تـر پێکهاتووە لە سەرەتایەکی "ئێکسپۆسیشین"[1] ئاسا وە لـەدوای ئەوەشـەوە بەشێکی دراماتاسا لـە سـێ دیمەندا.

بەشـی دووەمـی چیرۆکەکـە بگـرە ئـەوەندە کـە دەتوانیت هـەر هـەمووی پێکـهاتووە لـە مۆنۆلۆژێکـی تازەی هێنك. هەروەکو بەهۆی جادوویەك ئـەو فـەرووە قەرزکراوە بەرزکردنەوەی هەستی ژیـانی بەخشـیبێت بەو پیاوە پەشێوحاڵە. خۆی پرسیار لەخۆی دەکات، کە ئایە ئەو بۆ نەهاتووەتە سەر ئەو خەیاڵەی کـە بـە قست بۆ خۆی فەروویەك نەکڕێت. گومـانی تێدا نییـە دانەیەکی لەو بابەتە باوەڕ بـەخۆمێنانی و لەبەرامبـەر نەخۆشەکانیشـی پایـەی بەرزدەکاتـەوەو دەستکەوتێکی باشیش بۆ ئەم مسۆگەر دەکات:

"پیـاو ناتوانـێ هـەندە پـارەی کـەم بـدات بـە دکتۆری کە لەتۆی فەروودایە هەروەك بە دکتۆرێك کە لـەتۆی پاڵتۆیـەکی ئاسایی دایـەو کونـە تۆپچـەکانی داڕزاون".

وە لەوانەشە بەرزبوونەوەی دەستکەوت لە هەمان کـاتدا ئـەو پەیوەندییـە پـڕ خۆشەویسـتیەی سـاڵانی رابردووی نێـوان ئـەو و ژنەکـەی بخاتـەوە سـەر بـاری ئاسایی خۆی، هێنك بـەردەوام بـوو لـە گفتوگۆکانی. ئەو ژنی دکتۆرە تـا لـێرەدا لـە نەناسـراوەییەوە سـەر قـوت دەکاتـەوە ئاشکرا دەبێـت کـە نێـوی هێللێنـە. "لەم ماوەیەی دوایدا" ئەو ساردوسڕی و ناحـەزی لـە بەرامبەر هێنك پێشانداوە بەڵام دۆستانە لـە بەرامبـەر ریکارت -کە عەشقی تەمەنی کیژۆڵەیی بوو- لە پاش ئـەوەی ئەمـە فەروویـەکی بۆ خـۆی پـەیدا کـردووە. ئەرکی مۆنۆلۆژەکە ئەوەیـە، کـە هێنك وەکو شانزە ساڵییەك ئـارنۆلدی ئۆپـێرا چڕی لـە ڕۆڵـی فاوسـتدا بینیـوە -کـارل ئۆسـکار ئـارنۆلد (*1830-81*) کەلـە کانوونی یەکەمی ساڵی ***1859***وە تاوەکو ڕۆژی مردنی خـۆی گرێدابـووە شـانۆی شاهەنشـامیەوە؛ هـەروەها لەوانەیە لـەنێو کەوانـەدا نێـوی بـهێنرێت کـە گـاوندی فاوسـت لـەوێدا بـۆ یەکـەمین جـار لـە بـەهاری سـاڵی ***1862***دا پێشکەشـکرا -وادەکـات کـە بـە دڵنیاییـەوە

رۆژی ڕووداوەکە بۆ کۆتایی سالانی **1800** کان بگونجێ. وە زانیاری دەربارەی پەیوەندیەکان. کە مێنك ڕێگەی گەڕانەوە بۆ ماڵەوەی پیاسەی شەوی یەلدادا بەنێو کونگس ترێدگۆرد دەبات، تەئکیدی ئەوە دەکات کە نووسەر ویستیوویەتی باسێك لە نێو ژیانی ستۆکهۆلمەوە بهێنێت.

لە بەشی سێهەم زیاتر خۆ گردەوە کردووتر لەوەی لە بەشی یەکەمدا یالمار سوێدەربێری پەیوەندی، مۆنۆلۆژو دایەلۆگی چیرۆکەکە پێکەوە دەچنێت. پاش دەورووبەری دوو سەعات و نیو لەماڵ دەرچوونیدا مێنك دەگەڕێتەوە ماڵەوە، بارکراو بە دیاری جەژنی یەلداو موشتاقە بەوەی کە ئەو چۆن، بە فەروو لەبەرکراوی، لەلایەن ژنەکەیەوە پێشوازی لیٚ دەکرێت، شێوازی بەخێرهاتنی ژنەکە لەسەرووی جەسارەتی ئاواتەخواستی ئەو بووە:

"بە دزییەوە لە سووچی تاریکی دالانەکەوە خۆی نووساند بە مێردەکەیەوەو هەردوو باڵی لکاند بە ملییەوە ماچێکی گەرم و گووڕی کرد. پاشان سەری سماندە نێو یەخەی فەرووە گەرمەکەی‌و چرپاندی (..)".

بەلام دڵنیاکردنی خۆشەویستن مەبەست مێنك نەبوو بەلکو بۆ ئەو میوانی نانی ئێوارە چاوەڕوانکراوەیە، جۆن ریکارت. وەك دەزانن وەکو کۆتایی هێنانێك بوو مەراسیمی بەخێرهاتنە گەرموگوڕە، مێللێن مێنك دەچرپێنێ:

"گوستاف هێشتا لەماڵەوە نییە".

بۆ یەکەمین جار لێرەدا پێشناوی ژنە خاوەن ڕۆڵە سەرەکییەکە ئاشکرا دەکرێت. هەروەها سەیر لەوەدایە. کە مێنك، ئەوکاتەی وەلامدەداتەوە، وەکو کەسی سێهەم باس لە خودی خۆی دەکات.

لەدوا بەشی چیرۆکەکە مێنك و ریکارت پاش نانخواردنی نانی ئێوارە بەدیار ئاگردانی گڕدارەوە لە ژووری کاری یەکەمیانەوە دانیشتوون، بەتەنها خەنەخەن و تەپەتەپی منداڵەکانە ژیانیان خستووەتە ئەو نێوە، خاتوو مێنك و منداڵەکان لە ساڵۆنەکە خەریکی داگیرسانی دارکاژی یەلدان. بۆ ئەوەی کۆتایی بهێنێت و بەو بارە خەمناکە ریکارت وا بۆی دەچێت کە مێنك خەمی پالتۆ دڕاوەکەیەتی. مێنك وەلامی دەداتەوە، کە ئەو بەلکو بەپێچەوانەوە خەمی فەرووەکەیەتی بەردەوام دەبێت لە ئاشکرا کردنەکانی، کە ئەو وەکو دکتۆر، شارەزاییەکی تەواوی هەیە لە بارەی ئەوەوە کە ئەو چەند رۆژێکی کەمی لە ژیاندا ماوە. بۆیەکە دەیەوێت ئەو ڕێکەوتە بقۆزێتەوەو سوپاسی ریکارت بکات بۆ هەموو ئەو بەلگەی سەلماندنی دۆستایەتیەی کە لەلایەن ئەوەوە تاقیکراوەتەوە. بەتایبەت ئەو جاری قەرزکردنی فەرووەکە. ئەوە بەپێی قسەی خۆی "ئەو فە[illegible]ە دوا چرکەی لە بەختیاری" کە ئەو لەو ژیانەدا زانیبێتی بۆ ئەوی پەیداکردووە. هەر نەبێ ئەو تاوە کورتانە کردوویانەتە سەر وەهمی ئ[illegible]ەی کە خۆشەویستە.

فەرووەکە چیرۆکێکە زۆر بە خەستی بونیات نراوە. لەبارەی شێوازی هونەریەوە لێکچوونی گەورە لەنێوان ئەوداو ترازیدیایەکە کلاسیکی-فەرەنسیدا دەبینرێتەوە، هەتاوەکو لە بارەی مەرجی یەکە جێگا بە ووردی لە چیرۆکەکەدا بەتەواوی پڕنەکراوەتەوە. نووسەر توانیویەتی بە ئامرازی کەمەوە کاریگەری

چاوەڕوان نەکراوی بەهێز بەدەست بهێنێت: قەرزکردنی فەروویەك لەلای قەرزارەکە میزاج گۆڕینێکی تەواوی بەدەستهێناوە؛ پێنج وشە، لە داڵانێکی تاریکدا چپێنرا، پیاوێك لەزاتی ژیانی تازە بەدەستهێنراوی بێبەش دەکات و ئەو خاڵی مەیلی دراماتیکیە کە "پێرپێتی"[2]ی چیرۆکەکە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت.

زمانی چیرۆکەکە ساکارە، ستیلەکەی روون و ریالیستیانە، بەرسڤە دایەلۆگیەکان کورت و سروشتین، میتافۆر[3]ەکان و شوبهاندنەکانی دەژمێردرێن. وە لەلایەکی کەشەوە هەڵبژاردنی میتافۆرەکان تاڕادەیەك باشن: لە کاتێکدا هێنك لە تاریکایی داڵانەکەدا بە سۆزەوە دەستی بە قژی ژنەکەیدا دەهێنا، دەنگی "چکێك شەکاوە" بوو؛ منداڵەکان بەدیار مێزی نانخواردنی شەوەوە "دەیانجریواند". بەتەنها دوو شوبهاندن لە چیرۆکەکەدا دەکرێت، هەردووکیشیان لە کشیوەری گیانلەبەرانەوە هێنراون: هێنك لە مۆنۆلۆژەکەدا دەربارەی خۆی دەڵێت "هێندە بەسانایی ڕێدەکات، هەروەك باڵندەیەکە چکۆلانە". ئەو "وە ئیتر"[4]ی بادانەوەیەی کە لە هـ.س. ئەرسین سروشت وەرگرتووە لە چیرۆکەکەدا بەلای کەمەوە لە سێ جار کەمتر بەکار نەهێنراوە (لە سەرەتای خۆئامادە کردنەکەدا، لە بەسەرهاتی پێ خزانەکەو لە مۆنۆلۆژە درێژەکەی هێنك). لە هەر سێ پێشهاتەکاندا ئەو پیادا چوونەوەیەی باسکردنێك دەکاتەوە. لە پێشهاتی یەکەمدا پیاچوونەوەکە زۆر نائاگایانە ڕوودەدات، کە ئەوە زەردەخەنەیەك لەلای خوێنەر دروست دەکات: "دکتۆر هێنك لەڕ بوو؛ وە ئیتر کات بوو بە شەوی یەڵدا".

بەشێوەیەکی گشتی ستیلی بەخشانی چیرۆکەکە لە هەموو رووکەشیەکی ئازادی هەڵخەڵەتێنەردا سەرتاپا کاری تێداکراوەو حیسابیشی بۆ کراوە. ئەوە بۆ نموونە لە بیناکردنی جووتێك رستەی لەم شێوەیەدا لەزەتی بەنووسەرەکە داوە: "ئیتر دووبارە هەموو شتێ پاکبووەوە جگە لە پاڵتۆکەی" (بەسەرهاتی پێ خزانەکە)؛ "دەنا هیچ شتێك نەبوو ئەو رووداوە بچووکەی پێش نیوەڕۆ بەبیربهێنێتەوە، جگە لە فەرووەکە" (هێنك لەکاتی گەڕانەوەیدا لە پیاسە کردنەکەیدا).

هەروەها لەوانەشە بەکارهێنانی ئامرازی نەفیکردنی "نە"* و "نا"** لە دایەلۆگ و مۆنۆلۆژەکانی چیرۆکەکە بایی ئەوە بن لێکۆڵینەوەیەکیان لەسەر بکرێت. هەردوو ریکارت و ئێللێن هێنك "نە"ی رۆژانە بەکاردەهێنن، ریکارت لە یەکەم دایەلۆگی چیرۆکەکە، ئێللێن لە تاقە بەرسڤەکەیدا. هێنك لە مۆنۆلۆژی یەکەمیدا "نا"ی رەسمیات بەکاردەهێنێت، وە لە مۆنۆلۆژی گەورەکاندا، ئەو کاتانەی هۆشی تێکەیشتنی کەمدەکاتەوە دەیگۆڕێت بۆ "نە" بەڵام لە سوپاس و خواحافیزیەکانی کۆتاییدا دووبارە دەگەڕێتەوە سەر "نا". گۆڕین لەنێوان "نە" و "نا" لە دایەلۆگ و مۆنۆلۆژەکانی چیرۆکەکە زەحمەتە پەیوەندی بە ڕێکەوتێکەوە هەبێت.

باسکردنی ژینگە لە چیرۆکەکە تارادەیەکی زۆر زۆر کورتە. نێوی چوارریانەکە و پارکێك هاوکات بە

ئامادەبوونی شازادەیەك لەكاتی كارەساتی هەڵخزانی هێنكدا نووسەر ئەوە وا دەبینێ كە ئەوە بەس بێت بۆ بەخشینی خەت رشتنی جێگاكە. وە هەروەها ئەو لەنزیكەوە باس لە دیوی ناوەوەی كونتوری ریكارت و ماڵی هێنك ناكات. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندەمان رێگە دەدەن كە بیزانین، وەكو ئەوەی كە ماڵی هێنك گەلێك فراوانە، كە ئەوە -جگە لەو داڵانە بە دیمەكە- ساڵۆن، ژووری نانخواردن و ژووری كار بە قەنەفەو قەنەفەیەكی لێنی لە چەرم گیراوی لەخۆ گرتووە، ئێ كەواتە ئەو ماڵە بەتەواوی بایی ئەوەیە خێزانێكی چینی ناوەندی باڵای تیادا بژێت.

بەهەمان ئەو شێوە كەمیەوە نووسەر بە وردی گوێ لە باسكردنی ژینگەی چیرۆكەكە دەدا، ئەو گرنگی خۆی داوە بەوەی كە تەماشاكەرانە نەخشەی رووی دەرەوەی كەسەكان بكێشێت. هێنك روون دەكرێتەوە كە "لەڕولاوازو كەمڕەنگ" ژنەكەی "جوان" بوو. دەربارەی شێوەی ریكارت و منداڵەكان هیچ زانیارییەك نییە. لەجیاتی ئەوەی نووسەر ئاراستەی خۆی كردووەتە سەر ئەوەی كە پۆرترێتێكی سایكۆلۆژیانەی رۆڵی سەرەكی چیرۆكەكە بدات.

بەشێوەیەك لە شێوەكان هێنك بەخۆی یەكێكە لە دروستكراوە ئامادەكراوەكانی "*fin-de-siecle*"[5]ی یالمار سوێدەربێری. دەنا ژیانی ئەو لەرووی دەرەوە تا رادەیەك رێڕەوێكی تر دەگرێتە بەر، بەشێوەیەكی گشتی شوبهاندن لەگەڵ پارل بۆڤار[6]ی فلۆبێردا: ئەو پیاوە خیانەت لێكراوەكەو ئەو دكتۆرە سەرنەكەوتووەكە. بەشێوەیەكی گشتی ئایا ئەو چەند لەبووندا سەر لێشێواوە. بەرسڤەكانی ریكارت گەواهی ئەوە دەكەن، ئەو كاتەی كە ئەو لە كۆنتورەكەی ئەمدا بە پاڵتۆیەكی دڕاوەوە خۆی پیشان دەدات و دەگێڕێتەوە، كە ئەو بووە بەژێر تاخوڕكە فایتوونێكەوە: "ئەوە بە تەواوی لەتۆ دەوەشێتەوە". ریكارت بەرسڤە چاوەڕوانكراوەكەی لەگەڵ پێكەنینێكی دۆستانەوە پێ دەدرێت..

وا هەست دەكرێت كە منداڵەكان لەلایەن هەستەوە كەمترین رۆڵ بۆ هێنك دەبینن. بەڵام سۆزی بەندكراویی بە ژنەكەیەوە بەهێزێكی ئاشكراوەیە. "ئەوە چەند سەیرە"، ئەو خەیاڵەیە كە لەكاتی هاتنە ژوورەوەدا بۆی دێت، "ئەوە چەند سەیرە كە هێشتا دڵم بەكوڵ دەگری لە هەر كاتێكدا كە لە ژوورەكەی تەنیشتمەوە گوێم لە هەنگاوەكانی دەبێت". هەر بۆیەكە تاقانە بەرسڤێك كە بە ژنەكە دراوە بڕیاری ژیان و مردنی لە بەرامبەر ئەو بەدەستە. لە یەكێتیەكدا كە ئێستاكە ناو دێنێت بە خەونەكانی بۆ كڕینی فەروو، وە گەڕانەوە سەركەوتنی خێزانداری بۆ ئەو، هەموو نیگەرانییەكانی لە بەرامبەر لاوازی تەندروستیداو كەم دەرامەتی ئابوورییەوە. بێ ترس سكاڵی كردار لەنێو بەرسڤی سوپاسكردنەكانی -ی خواحافیزیەكانیدا لەسەر سەری ئەو كەسەی كە مەبەستە هەڵدەڕێژێت- ریكارتیش لەژێر ئەو فشارەدا سەختی دەسەڵات بەسەر خۆدا هێنانی دەبێت و ناچار دەبێت رووی دوور بۆ لایەكی تر وەرچەرخێنێت. بەڵام لە كۆتایی نەمانی جەسارەتیدا، كە هینك تیایدایە، ئەوا بێگومان دەبێت بە ویستی خۆی بڕیاری گەڕان بەدوای مەرگدا بدات وەكو بەسەرهاتەكە بەبێ ئەوەی سەرنجی كەس بەلای خۆیەوە رابكێشێت. (لەو

خاڵەدا ئەو فیلمە تەلەفزیۆنییە بێدەنگەی "فەرووەکە" کە لەم بەینەدا پێشکەش کرا بە تەواوەتی لە کەسایەتی مێنکی چیرۆکەکە لایداوە. ئەو لەبەر پەردەی شانۆی لادراودا لە شەوی یەڵدادا بەهۆی ژەهر خواردنەوە هەستێت بە خۆکوشتن).

یالمار سوێدرەبێری گرنگیەکی بەرچاوی بۆ جلوبەرگ هەبوو. لەم چیرۆکەی کە کاری تیادا دەکەین بە ئاشکرا جارِی بۆ کردبووە. لە گۆشە نیگایەکدا دەتوانرێت بوترێت شێوەیەکە لەو بابەتە کلاسیکیەی "*vestis virum reddit*"[7]، جلوبەرگ پیاو دروست دەکات. فەرووەکە بۆ مێنکی چیرۆکەکە هەر بەتەنها مانایەکی عەمەلی نییە بۆ ئەو کە لە سەرما بیپارێزێت؛ ئەوە هەروەها بۆ ئەو بووە بە سیمبولی پلەو پایە، نرخ پێوەرێکی پلەی پێشکەوتنی نێو کۆمەڵگاو نیشانەیەکە بۆ کەشخەییەکی کەم وێنە. سوێدەربێری لە بارەی لاوێتی خۆیەوە دەگێڕێتەوە، کە ئەو بە هەندێك لە مزی یەكێك لە یەکەمین مزی کاری رۆژنامە نووسییەکانی کڵاوێکی لە فەروو دروستکراوی کڕیبوو: "بێگومان من "*Haablose Slaegter*"[8]ی "*Herman Bang*"م خوێندووەتەوە هیوادار بووم کە بەو نزیکانە، هەروەك "*Bernhard Hoff*"[9]ی کتێبەکە، بمتوانیبایە بەرهەمی لە فەروو دروستکراو لە بەر بکەم، بەڵام من هەرگیز لە کڵاوێك زیاترم تێپەڕ نەکرد".

مێنك لە کارەساتی هەڵخزانەکە کڵاوێکی هەبوو. شازادەیەك لە نەوەی "*Bernadotte*"[10] ئەوەی هەڵگرتەوەو لەسەر تەوقی سەری ئەمی دانا. ئایا ئەوە کڵاوێکی لە فەروو دروستکراو بوو؟

**سەرچاوە:**

*Novell analyser, under redaktion av: Vivi Edstrom & Per- Arne Henricson; Prisma, Halmstad, 1970, P. 49-54.*

**پەراوێز:**

*1– "exposition": بەشی دەستپێکردنە لە دراما و رۆماندا کە بارو کەسەکان دەناسێنرێت.*

** و ** ئەم دوو ئامرازی نەفیکردنە کە لە سویدیدا بەکاردەهێنرێت، من ج وشەیەکی هاوتام نەدۆزییەوە کە بیان شوبهێنم پێیان، بەڵام لە هەندێ رستەدا هەمان ئەو دوو ئامرازە دەگەیەنن.*

*2– "Prepeti" خاڵی گۆڕان لە درامادا.*

*3– "metafor" مەجاز.*

*4– ئەم "وە ئیتر"ـە لە سێ جێدا دێت بەڵام لەبەر خاتری جوانکاریی و سازاندنی زمانی چیرۆکەکە بۆ زمانی کوردی ناچار بووم بە سێ دەربڕینی جیاواز بیاننوسمەوە.*

*5– دەربڕینێکی فەرەنسیە بەمانای کۆتایی سەدەیە، وە هەروەها نێوی شانۆگەرییەکە کە لە ساڵی 1882دا لەلایەن "F. de Jouvenot" و "H. Micard"ـەوە نووسراوە.*

*6– "Charles Bovary": پاڵەوانی سەرەکی رۆمانی مەدام بۆڤاری فلۆبێرە.*

*7– ئەمە دەربڕینێکی لاتینییە کە لە هەمان مانای "جلوبەرگ پیاو دروستدەکات" دەگەیەنێت.*

*8– رۆمانێکی هێرمان بانگە کە لە ساڵی 1880دا بڵاوکراوەتەوە.*

*9– "Bernadotte" نازناوی ئەو خێزانەیە کە ئێستا لە سوید دەسەڵاتی شاهەنشاهیان بەدەستە.*

# وێستگەکانی سەردەم

- سەروەریی نیشتمانی
- سامۆییل هانتنگتۆن و پێکدادانی شارستانییەکان
- پەیوەندیی ڕۆشنبیران
- ئەمین مەعلوف و بەندەرەکانی خۆرهەلات
- ڤۆلتێر: منارەی ڕۆشنگەری
- بیست سەعات مانەوەکەی گراهام گرین لە هاڤانا





امين معلوف

موانىء المشرق



# سەروەریی نیشتمانی

■ جۆرج تەرابیشی

● و. لە عەرەبییەوە: ب. لاوکۆ

یەکێك لەو مەسەلانەی تا سەردەمانێکی نزیك بواری دەست تێوەردان و دەسکاری کردنی نەبوو (سەروەری نیشتمانی) بوو. تەنانەت وەك هەر شتێکی رەها کە پرسیار هەڵناگرێت، رێگەی ئەوە نەدەدرا لە پێکهاتە مێژوویەکەی بکۆڵدرێتەوە. شایەنی باسە (سەروەری) وەك مومارەسەیەکی عەمەلی هاوشانی کاروانی مێژووی دەوڵەتان بووە، بەتایبەت ئیمپراتۆریەتە مەزنەکانی وەکی ئیمپراتۆریەتی فیرعەونی و فارسی و رۆمانی و چینیو عەرەبی ئیسلامی. بەلام چەمکە تیۆریەکەی سەروەری تەنها لەگەڵ بەراییەکانی سەردەمی مۆدێرنێتیدا بەدیارکەوت و هاتە ئارا، بەتایبەت لەسەر دەستی هەریەك لە (جان بودان) و (تۆماس هۆبن) و دواتریش لە فیکری سەردەمی رۆشنگەری و رۆشی فەرەنسیدا.

بیرۆکەی سەروەری نەدەبوو وەك چەمکێکی تیۆری لە دایك بێت و بگاتە ئاستی کامڵی و پێگەیشتن گەر لە ئەورووپادا (ئەورووپای لانکی تازەگەری سیاسی) بەسێ قۆناغی گۆرانکاری مەزندا تێپەر نەبوایە: یەکەم/ ململانێی ئیمپراتورو پاپاکان، دووەم/ ململانێی پادشاو ئەمیرەکان، سێیەم/ ململانێی نێوان شاهەنشاکان و میللەتان.

دەکرێت بڵێین بەدرێژایی دوو سەدەی تەواو لە شۆرشی فەرەنسیەوە *1789* تا لەبەریەك هەڵوەشانی یەکیەتی سۆڤیەت *1989*، بیرۆکەی (سەروەری نیشتمانی) لەسەروی لیستی پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان و فەلسەفەی سیاسیەوە بوو، بەو پێیەی تەعبیرێکی یاسایی نمونەییە لە دەسەلاتی باڵاو بێ سنووری دەوڵەتی نەتەوە لەسەر خاك و میللەتی خۆی. لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە (سەروەری نیشتمانی) خۆی بەسەر فەلسەفەی سیاسی و یاسای نێودەوڵەتیدا سەپاند. چونکە هۆکاری هەلایسانی ئەو

جەنگە وەما دەست نیشان دەکرا کە رەنگ بوو ئەو جەنگە رووی نەدایە گەر رژێمی نازی (سەروەری نیشتمانی) دەوڵەتانی ئەورووپی دراوسێی خۆی وەك نەمسار چیکۆسلۆڤاکیاو، بەتایبەتیش پۆڵۆنیای پێشێل نەکردایە.

لە ماوەی جەنگی ساردیشدا کە جیهان بەسەر دوویەرەدا دابەش بوویوو، بیرۆکەی (سەروەری نیشستمانی) هاوجووت بوو لەگەڵ بەرژەوەندی ستراتیژی هەردوو بلۆکی رۆژهەلات و رۆژئاوادا. خۆرئاوا پێی وابوو (سەروەری نیشتمانی) بەشێکە لە کەلەپوورو پێکهاتەی ئەو بەمایانەی هەلگریەتی و، بەمەش دەتوانێت رێگا لە بەرفراوان بوونی بلۆکی سۆسیالیستی بگرێت لە دوای ساڵی **1948**وە.

لە بەرامبەردا یەکیەتی سۆڤیەتیش ئەمەی کردە بەمانەیەك تا نەهێڵێت خۆرئاوا دەست لە کاروباری ناوخۆی وەربدات، بۆ ئەوەی بەبێ هیچ لێپرسینەوەیەکی نێودەوڵەتی سیاسەتەکانی خۆی بسەپێنێت. هاوکات ولاتانی جیهانی سێهەمیش کە تازە لەژێر دەستی کۆلۆنیالیزم رزگاریان بوویوو، جەختیان لەسەر پرانسیپی (سەروەری نیشتمانی) دەکردەوە بە مەبەستی جێ پێ قایم کردنی خۆیان وەك دەوڵەتێکی نوێی سەربەخۆ. بەلام دەبێت بووترێت کە لە پشت دیوارەکانی (سەروەری نیشتمانی)یەوە تاوانی زۆر قێزەون ئەنجامدرا.

لە جیهانی سێهەمدا زۆر لە ولاتانی رووەو ئیستبدادیەتی سیاسی و دیکتاتۆریەتی سەربازی و دەسەلاتی تاك حیزبی چوون و، دەستیان کرد بە سەرکوت کردنی هێزە دیموکراسی و شۆرشگێرەکان و، هاوکات مافەکانی مرۆڤ پێشێل کران و پەیرەوی پاکتاوکردنی عیرقیش کرا.

لە جیهانی سۆسیالیستیشدا تۆتالیتاریەتێکی شەرانگێز هاتە ئارلوە، تۆتالیتاریەتێك کە لەگەڵ خۆیدا (گولاگ)ەکانی هانی و لە رێی حوکمی ئاگرو ئاسن و، بەزنجیری تانکەکان شۆرشی گەلانی مەجەر **1956** و، راپەرینەکانی گەلی پۆڵەندا **1956** و **1970** و، قەسابخانەی بەهاری پراگی **1968** ئەنجامدا. دوو ملیۆن کەس لە کەمبۆدیاو، بیست ملیۆن کەس لە چین لەسەردەمی (شۆرشی روناکبیری گەورەدا) لەناوبران.

خۆرئاواش سەرەرای دیموکراسی بوونی لەو تاوانانە بەدەر نەبوو، هەر لە دروست بوونی دیکتاتۆریەتەکانی پورتوگال و ئیسپانیاو شەرەکانی ڤێتنام و جەزائیرو.. هتد، کە ملیۆنەها قوربانی لێکەوتەوە تا دەگاتە (ماکارتیەت) لە ولاتە یەککگرتووەکانی ئەمریکا کە توێژی رۆشنبیرانی دووچاری گەورەترین نەهامەتی کرد.

بەلام لە سەرەتای نەوەدەکانەوەو لەگەڵ هەرەسی بلۆکی رۆژهەلات دا گۆرانێك رووی‌دا، وەك ئەوەی چەمکی (سەروەری نیشتمانی) رۆڵی خۆی تەواو کردبێ و پێویستی بەوە هەبێت تا چاوی پێدابخشێنرێتەوە. لە بەرامبەردا چەمکێکی تر هاتە ئارا کە چەمکی (مافی دەستێوەردان) بوو. بەمەش پرانسیپێکی تازە چەسپی کە دەوڵەت و دەسەلاتدارانی دەوڵەت، لە چوارچێوەی سنوورەکانی خۆیاندا ئازادی رەهایان نیە، بەلکو یاسایەکی نێودەولەتی هەیە پێویستە پابەند بن پێیانەوە هاوکات رێ‌ غراوی نێودەولەتیش هەیە، کە پێویستە دەوڵەت لە بەرامبەریاندا دەستبەرداری بەشێك لە سەروەری خۆی بێت. لەو باوەرەوە کە دەڵێت کۆمەلگەی نێودەولەتی –ئەمەش چەمکێکی تازەیە– مافی ئەوەی هەیە دەستوەرداتە کاروباری ناوخۆیی

هەر دەوڵەتێك، گەر هەست بەوە کرا ئەو دەوڵەتە سەرپێچی هەندێ یاساو بنەمای کردووە کە دەوڵەتانی جیهان بڕیاریان لەسەرداوە.

ئەوەی لەم چەند ساڵەی دوایدا بە ئاشکرا دیارە ئەوەیە دەوڵەت تەنها بکەرێك نیە لەسەر شانۆی جیهانی، بەڵکو لە پاڵ ئەودا نەتەوە یەکگرتووەکان و کۆمپانیا فرە رەگەزەکان و سندوقی دراوی نێودەوڵەتی و بانکی دەولی و رێکخراوەکانی مافی مرۆڤ و ژینگەپارێزەکانیش هەن.

ئیتر دەوڵەتێك نیە ئازادی خۆی هەبێت لە سیاسەتە ئابووریەکانیدا، یاخود لە سیاسەتی ئاسایشی ناوخۆی خۆیدا.

هیچ دەوڵەتێك نیە خاوەن سەروەری یاسایی تەواوبێت. ئەوەتا دەوڵەتێکی وەك شیللی دەستەوسانە حەسانەتێکی یاسایی بۆ سەرۆکی پێشووی (ئۆگستۆ بینۆشێ) دابین بکات. یان ئەوەتا حکومەتی لیبیا ناچار دەکرێت، دوای ماوەیەکی زۆر ئەو هاوڵاتیانەی تاوانبارن بە کێشەی لۆکەربی، تەسلیم بە دادگا بکات تا لەبەردەم دادگایەکی بیانیدا دادگایی بکرێن. بەم جۆرە ئیتر هیچ دەوڵەتێك ئازاد نیە لەوەی کەمە نەتەوەیەتیەکانی ژێردەستی خۆی بچەوسێنێتەوە. ئەوەتا کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی ناچار بوو دوو جار بچێتە یوگسلافیاوە، تا رێگە لەو پرۆسەی پاکتاوکردنی عیرقیە بگرێت کە لەوێدا پەیرەو دەکرا. هاوکات دەوڵەتان مافی ئەوەشیان نیە ژینگە پیس بکەن، گەر نا ئەوا دوچاری لێپرسینەوە دەبن. ئەو فشارە زۆرانەی لەسەر حکومەتی بەرازیلی و حکومەتەکانی خۆرهەڵاتی ئاسیا هەیە، بەو مەبەستەیە تا دارستانەکانی ئەو ناوچانە بپارێزن و تێکیان نەدەن. وەك چۆن هەمان فشار لەسەر ولاتانی ئەمریکای باکوورو ئەورووپای خۆرئاوا هەیە تا بەهۆی پاشماوەی کارگە پیشەسازیە زەبەلاحەکانیانەوە ژینگە پیس نەکەن و، نەبنە هۆی کونکردنی چینی ئۆزۆن. هەروەها لە رووی ژمارەی دانیشتوانیشەوە پێویستە دەوڵەتان سیاسەتێکی نوێ بگرنەبەر، ئەوە بوو ساڵی **1994** کۆنگرەی قاهیرە سنوورێکی بۆ قەبەبوونی دیموگرافی و زیادبوونی دانیشتوان دانا.

هەرچەندە ئەمڕۆ بەزەقی ئەوە دەبینین کە بیرۆکەی (سەروەری نیشتمانی) رەهای دەوڵەتان لەق بووەو وەکی خۆی نەماوەتەوە، بەڵام ئەوەشی لەمڕۆدا روودەدات وامان لێدەکات بڵێین: جیهان لەبەردەم ئەگەرێکی وادایە تا لە سبەینێدا زیاد لە هەرکاتێکی تر ببێتە خاوەن سەروەریەك.

**سەرچاوە:**


*رۆژنامەی (الحیاة)، ژمارە (13434).*

# ساموٚییل هانتنگتوٚن و
## پێکدادانی شارستانییەکان

● و: سەردەم

**+لە کتێبەکەتدا باس لەوە دەکەیت کەوا پێکدادانی شارستانی لەسەر ئاستێکی بەرفراوان روودەدات و، تەواوی جیهان دەگرێتەوە. دەکرێت مەزەندەی سیناریۆی ئەو جەنگەی ئایندە بکەیت، کە لە نێوان شارستانیەتی خۆرئاواو شارستانیەتی ئیسلامیدا روودەدات؟**

–پێشبینی کردنی ئەوە کارێکی گرانە. ئەستەمە تەواوی خۆرئاوا بگلێتە شەڕێکی راستەوخۆ لەگەڵ ئیسلامدا. بەلاَم رەنگە شەڕی ناراستەوخۆ لەنێوان هەندێك وڵاتی مەسیحی خۆرئاوایی لەلایەك و، هەندێك ولاتی ئیسلامی لەلایەکی ترەوە رووبدات. لەمەشدا هەریەك لەو دوو لایەنە پەیڕەوی برێك توندوتیژی دیاریکراو دەکەن بەرامبەر بە یەکتری، وەك چاندنی بۆمب و، لەبەرامبەریشدا لایەنەکەی دی بەهێرشی ئاسمانی وەلاَم دەداتەوە. بەهۆی کوێتەوە خۆرئاوا لە دژی دەوڵەتێکی ئیسلامی نەیاری کەوتە شەڕەوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەڵایسانی جەنگێکی حەقیقی لە نێوان شارستانیەتەکاندا وەکی ئەوەی تۆ داوات لێکردووم مەزەندەی بکەم، کارێکی مەحاڵ نیە. رەنگە ئەمە بۆخۆی ببێتە واقعێك گەر گروپێکی توندڕەو هەوڵی ئەوەیدا یەك لە حکومەتە عەرەبیەکان – لەوانەی کە دۆستمانن– لەسەر کار لابەرن، یان هاوپەیمانێتی لەگەڵ (سەدام حسێن)دا ببەستن بۆ داگیرکردنی ناوچەی کەنداو و گرتنەوەی نەوت لە خۆرئاوا.

**+هێزی هەندی ولاتانی عەرەبی و ئیسلامی شان بەشانی خۆرئاوا چوونە شەڕەوە بۆ رزگارکردنی کوێت، ئەوە بۆ خۆی پێکدادانێك نەبوو لە نێوان شارستانیەتەکان دا، بەڵکو شەڕێك بوو بەهۆی نەوتەوە..**

–باشە، بەلاَم رەنگە شەڕێك بەهۆی نەوتەوە بگۆڕێت بۆ شەڕ لە نێوان شارستانیەکاندا. ساڵی 1973 لە خۆرئاوا باس لەوە کرا

ڕێوشوێنی سەربازی دژ بەو وڵاتانە بگیرێتە بەر کە ئەندامن لە ڕێکخراوی ئۆپێکدا، وەکی هەوڵێك بۆ گێڕانەوەی ئەو نەوتەی پێویستیانە.

**+وڵاتە بچووکە دەوڵەمەندەکان لە بەرامبەر دیاردەی ئسوڵیەت دا دەبێت چی بکەن؟**

–لەو باوەڕەدام هەرچیەکیان پێ بکرێت دەیکەین بۆ پاراستنی ئەو ئاسایش و ئارامیەی توندڕەوەکان هەڕەشەی تێکدانی دەکەن.

**+پێشبینی دروستبوونی پێکدادانێك لە نێوان شارستانیەتی ئیسلامی و شارستانیەتی چینی دا دەکەیت، پێکدادانێك ڕەنگە بەهۆی ئەو سەرکوتکردنەوە بێتە ئارا کە موسڵمانەکان لە چین دا ڕووبەڕووی دەبنەوە؟**

–بە فیعلی باروئۆخەکە بەرەو ئەوە دەچێت، ئەویش بەهۆی چەوسانەوەی موسڵمانەکانی ئەوێ و ئەو هەوڵانەی بۆ سڕینەوەی ناسنامەیان دەدرێت. ئەمەش باروئۆخێکی هاوشێوەی کۆسۆڤی لێدەکەوێتەوە. پێدەچێت کێشەی موسڵمانەکانی چین زەنگێك بێت بۆ ئاگاداربوون لە هەڕەشەو مەترسیەك. چین ڕێگا بە هیچ میللەتێکی ژێردەسەڵاتی خۆی نادات لێی جیابێتەوە. گەر شارستانی ئیسلامیش بڕیاریدا شەڕێك بۆ ڕزگارکردنی موسڵمانەکانی چین بەرپا بکات، ئەوا پشت بەو بنکە ئاسمانی و سەربازیانە دەبەستێت کە لە وڵاتانی یەکیەتی سۆڤیەتی پێشوو هەن. ئەمەش کێشەی لۆجستی لێدەکەوێتەوە وەك ئەوەی دووچاری ئەمریکا بوو لە جەنگی دژ بە عێراق دا، یان ئەوەی ڕووبەڕووی بەریتانیا بووەوە لە کاتی سەندنەوەی دورگەکانی فۆکلاند لە ئەرجەنتین. ئەرجەنتین وەك عێراق پێی وابوو دووری ئەوان لە نەیارەکانیان وا لە بەرامبەرەکەیان دەکات دەست لە ڕزگارکردنی ناوچە داگیرکراوەکان بکێشێتەوەو بێ وزە بن.

پەلاماردانی چین لە ڕێی هێزی ئاسمانیەوە لە قیرغیسزتانەوە یاخود تاجیکستانەوە بەو فڕۆکانەی پێش وەخت ڕێگایان پێ دراوە بە ئاسمانی هەریەك لە وڵاتانی تورکمانستان و ئۆزبەکستان دا گوزەر بکەن، بۆ خۆی مەسەلەیەکە لە دەست ئەو وڵاتانەدایە کە خاوەنی هێزێکی ئاسمانی پێشکەوتوون، وەکی ئێران و عێراق و چەند وڵاتێکی هاوشێوەی ئەوان. هەرچی ئاکامی کۆتایی ململانێکەشە ئەوا کارێکە ناتوانم پێشبینی بکەم.

**+گەر زەمانمان وەك پێوەرێکی سەرەکی وەرگرت ئەوا دەبینین لە چین دا چوار تا پێنج شارستانیەت هەیە، بەڵام بە پێی ئەو وەسف کردنەی تۆ دوو شارستانیەت هەیە (کۆنفۆشیۆسی و ئیسلامی). سەرباری ئەوەش پێ دەچێت تۆ لەوە دڵنیا نەبیت کە چین بەهەمان شێوەی یەکیەتی سۆڤیەتی جاران دووچاری لەبەریەك هەڵوەشان بێت؟**

–بەڵێ پێم وایە چین یەکگرتوویی خۆی دەپارێزێت، ئەوەی لە ئێستاشدا دەیبینین چەند گۆڕانکاریەکە بە مەبەستی کەم کردنەوەی دەسەڵاتی مەرکەزی، بە جۆرێك بکرێتە دەسەڵاتێکی فرە ناوەند لە ڕێی بەخشینی هەندێ دەسەڵات بە حکومەتی هەرێم و ناوچە جیاجیاکانی دیکەی چین. هاوکات وەك پێش بینیش دەکرێت ڕەنگ ناوەندی دەسەڵاتی دیکە لە دەرەوەی دەسەڵاتی دەوڵەتدا دروست بێت، بەڵام سەرەڕای ئەوەش پێم وایە چین دووچاری دابەشبوون نابێت.

**+ئەم سەدەیە دابەشبوونی هەندێ وڵات یان لێك جیابوونەوەی هەندێ بەشی بەخۆیەوە بینی، لە هەردو حاڵەتەکەشدا ڕەوشەکە وەکی خۆی مایەوەو نەبووە مایەی پاشەکشەو گەڕانەوە بەرەو دوا.**

**ئایێت پێشبینی دابەشبوون و لێك جیابوونەوەی تازە لە ناوچەكانی بەلكان و ئەیبیریاو ئەوروپا بكرێت! ئاخۆ ئەم ئاراستەیە تیۆرییەكەی تۆ سەبارەت بە ڕووبەڕووبوونەوەی شارستانیەتی خۆرئاوا لەگەڵ شارستانیەتی ئیسلامی، هەر لە یەمەنەوە تا چین و ئەلبانیا لاواز ناكات!**

=پێویستە مرۆڤ لە نێوان حاڵەتە جیاجیاكانی جیابوونەوەو دابەشبووندا جیاوازی بكات: سەربەخۆیی چ مانایەكی هەیە كاتێك بە ئامانجی خۆی دەگات؟ سكۆتلەندا دەیەوێت لە ناو یەكێتی ئەوروپادا بمێنێتەوەو ئەلبانیای موسڵمانیش هەوڵی بە ئەندام بوون دەدات: پێدەچێت سكۆتلەندا بیەوێت لە ڕیزی ڕێكخراوی كۆمۆنوێلس دا بمێنێتەوەو دەستبەرداری سستمی پاشایەتیش نەبێت، وەك هەریەك لە وڵاتانی جامایكاو كەنەداو نیوزلەندا: پاش ئەوەی مۆزەمبیق لە پورتوگال جیابووەوە بووە ئەندامی وڵاتانی كۆمەنوێلث، هەرچەندە لە ڕیزی ئەو وڵاتانەشدا نیە كە بە زمانی ئینگلیزی قسە دەكەن: یەكێتی ئەوروپاش یەكگرتوویی شارستانیەتی خۆرئاوا پتەوتر دەكات: هەر بۆ نموونە ڕێگا لەوەش دەگرێت باكوری ئیتالیا لەو وڵاتە جیابێتەوە: جیاوازیەكی زۆر لە نێوان دابەشبوون و جیابوونەوەدا هەیە، بەڵام جیابوونەوە بە چ ڕێگایەك دەبێت؟ ئایا هەمیشە بە ڕێگاچارەی ئاشتیانەو پەرلەمانی دەبێت، وەك ئەوەی پێشبینی دەكرێت سكۆتلەندا بیگرێتە بەر تا سەربەخۆیی خۆی لە بەریتانیا وەرگرێ؟

بێگومان ململانێی هەڕەشەیەكە لەسەر یەكێتی و یەكگرتوویی هەر شارستانیەتێك: ئایا ناسیۆنالیستە هەژارە بێ كارەكان وەكی كاتۆلیكە ئیرلەندییەكان پەنا دەبەنە بەر شەڕ؟ بەڵام ناسیونالیستە دەوڵەمەندەكانی تر لەوانەی سەرقاڵی ئەو جۆرە كارانەن كە قازانجی باشی بەدوادایە، پەنا بۆ شێوازی گفتوگۆو دانوستان دەبەن؟

**+پێت وایە هندستان هەنگاوی بەرەو پێشەوە بنێت و لە ڕووی گرنگیەوە بگاتە ئاستی چین، یان پێش یابان بكەوێت! دەكرێت ئەم تا زۆر مێژووی ئەم گۆڕانكاریەمان بۆ بڵێیت!**

=مەبەستم نەبوو باری سەرنجێكی لەو جۆرە بخەمەڕوو: پێم وایە هندستان دەبێتە هێزێكی سەرەكی، قەبارەی ئەو لە ڕووی دانیشتوانەوە وای لێدەكات لەو توانستانەی ئەو هەیەتی بۆڕی تواناكانی چین بداتەوە، لەكاتی پێویستیشدا ململانێی یابان بكات: بەڵام لەو باوەڕەدام هندستان ڕووبەڕووی كێشەو گرفتی گەورە دەبێتەوە بۆ گەیشتنە وەها ئامانجێك: جێی خۆیەتی بڵێین بەراوردكردن لە نێوان هندستان و چین دا لە پەنجاكانەوە لە بەرژەوەندی یەكەمیان دا نەبووە؛ لەبەرئەوەی لە سەرجەم ئاستەكانی ژیان دا هندستان پاشەكشەی بەخۆیەوە بینیوە؛ وەك گەشەی ئابووری لەسەر ئاستی گشتی و گوزەرانی ئاكەكەس و بواری پەروەردەو خوێندن: بەم جۆرە دەبینین ڕێگای هندستان پڕ كەندوكۆسپە؛ بەڵام پێم وایە ئاییندەیەكی گەشی لە بەردەمدایە:

**+چ كاتێك بەرووبوومی ئەم ئاییندەیەی دەچنیتەوە!**

=ئەمەیان دەگەڕێتەوە بۆ هندیەكان خۆیان: ئەوان میللەتێكی بێ ئەندازە زیرەكن: بەڵام دەبێت بگەنە قەناعەتێكی وا كە پێویستە چارەسەری ئەو جیاوازیە كۆمەڵایەتی ئابووریانە بكەن و، حكومەت كۆنترۆڵی ئابووری وڵات بكات: كارێك كە چینیەكان پەییان پێ بردو پێیان وابوو دەبێت سنوورێكی بۆ دابنرێت:

**سەرچاوە:**

گۆڤاری (الوسط) ژمارە (375):

# پەیوەندیی رۆشنبیران

## بە سیستمە دیسپۆتیزمیەکانەوە

■ ئەلسەید ولد ئەباه

● و: ش

لە فەرەنسا بیرمەندی چەپڕەوی ناسراو (رێجیس دۆبرێ) پاش گەڕانەوەی لە سربیاو، نووسینی وتارێك لە رۆژنامەی (لومۆند)دا هەڵلایەکی گەورەی نایەوە. چونکە ئەو وتارەی وەها لێکدرایەوە کە هاوسۆزە لەگەڵ سەرکردەی رەگەزپەرستی توندڕەو (سلۆبۆدان میلۆسۆڤیچ) و ، لەبەرامبەریشدا ئیستێکی لەبەردەم ئەمامەتی و ماڵوێرانیەکانی گەلی کۆسۆڤۆدا نەکردووە، ئەو گەلەی رووبەڕووی لەناوبردنی دەستەجەمعی و بەدترین پاکتاوکردنی عیرقی بۆتەوە.

قەڵەم گەلێك کە راوبۆچوونی خۆیان لەسەر ئەم مەسەلەیە دەربڕی، پرسیاریان لە نهێنی ئەوە کرد کە بۆچی بیریارە دیارو ناودارەکان شوێن سستمە دیسپۆتزمیەکان دەکەون؟ لە کاتێکدا دەبوو قوڵی فیکرو ئاستی بەرزی رۆشنبیرییان رێگای ئەوەی نەدابان. هەڵەی رۆشنبیران لەم مەسەلەیەدا بەلگەی ساویلکەییەکی منداڵانەیە، ئەگەر لە گوناهێکی دەست ئەنقەستیشەوە سەرچاوە نەگرێت.

ئەم هەڵوێستە وای لێکردم بە قوڵی لەم بابەتە رابمێنم، ئەویش لە رێی هێنانە پێشچاوی نمونەی ئەو فەیلەسوف و ئەدیبە بەناوبانگانەی لە سەردەمی تازەدا شوێن رژێمی نازیزم و ستالینیەت کەوتن. بێگومان بەناوبانگترینیشیان مەزنترین فەیلەسوفی سەردەمی ئێستامان (مارتن هایدگەر)ە کە پشتیوانی لە هتلەر کردو لە پرۆژەکەی ئەودا بونیادنانەوەی سەرلەنوێ نەتەوەی ئەڵمانی دەبینی. هەروەها فەیلەسوف و ئەدیبی فەرەنسی بەناوبانگ (ژان پۆل سارتەر)یش، کە لە ئەوجی ئەو تاوانکاریانەی ستالینیەت ئەنجامیدا ئەو لەگەڵیدا بوو.

سەرەکی ترین پرسیارێك لەم رووەوە کە پێویستکات بخرێتە روو، ئەوەیە کە بۆچی زۆر لە رێچکە فەلسەفی و ئاقارە ئەقڵانیەکان لە رێزی دەسەڵاتدارە دیسپۆتیزمیەکان دا بوون؟

سەرەڕای ئەوەی جەوهەری فیکری ئەوان هەمیشە بە ئەرزش و بەهای دادپەروەری و ئازادی دەست نیشان دەکرێت.

لەم رووەوە دەکرێت هەندێ نمونەی دیارو ئاشکرا بهێنینەوە، سەرەتاش با باس لە نمونەی فەلسەفەی یۆنانی بکەین، کە بەرەنجامی دیموکراسیەتی بەناوبانگی ئەسینا بوو. ئەوەتا (ئەفلاتون)ی دامەزرێنەری راستەقینەی فەلسەفە، کە تەواوی هەوڵەکانی خۆی لە مەسەلەی دادپەروەریدا چڕکردبۆوەو، دەیویست لە پرۆژە فیکری و سیاسیەکەیدا دیموکراسیەتی ئەسینایی رزگار بکات و پشتیوانی لێبکات، بەوە گەیشت پلانگێڕی لەم دیموکراسیەتە بکات و لە دژیدا دەست لەگەڵ رژێمە کودەتاچیەکان دا تێکەڵ بکات. هاوکات (ئەرستۆ)ش لەم ئاراستەیە بەدوور نەبووە. هەمان شتیش بۆ فەیلەسوفە عەرەبەکانی سەدەی ناوەڕاستیش راستە. ئەو فەیلەسوفانەی بەزۆری لەژێر سایەی فەرمانڕەواکاندا ژیاون و، نووسین و مشتومڕەکانیان جگە لەکات بەسەربردنێکی فکری کە مایەی خۆشحاڵی خەلیفەکان بووە، شتێکی تر نەبووە.

(فارابی، ئیبن سیناو ئیبن روشدو ئیبن توفەیل و ئیبن خەلدون) نمونەی دیارن لەسەر ئەو راستیەی کە بە دەگمەن پسپۆڕان ئاوڕی لێدەدەنەوە. بگرە چاوپۆشیشی لێ دەکەن، بەوەی رۆڵێکی رۆشنگەریی هەڵبەستراو دەدەنە پاڵیان. تەنانەت موعتەزیلەش کە نوێنەرایەتی ئاقارێکی ئەقڵانیان دەکرد، هاوکاری فەرمانڕەواکانی وەك خەلیفە (مەئمون)یان کردووە، بەمەبەستی سەپاندنی رێبازەکەیان بە توندو تیژی و بەزەبری هێزو پاکتاوکردنی نەیارەکانیان.

لە سەردەمی تازەشدا فەیلەسوف و بیریاران لەم ئاقارە لایان نەدا، تەنها لەو قۆناغەدا نەبێت کە پێی دەوترێت (سەردەمی رۆشنگەری). لەم سەردەمەدا مۆدێلێکی نوێ لە بیرمەندان هاتنە ئارا ئەوانیش (رۆشنبیران)ن، کە خواست و داخوازیەکانی کۆمەڵگاکانیان گرتبووە ئەستۆ رووەو ئازادی و لێکبووردن، نمونەکانیشیان وەك (فۆلتێرو رۆسۆو دیدرۆ)یە.

ئەوەتا (دیکارت) وەلائی خۆی پێشکەش بە (کاترین)ی شاژنە فەیلەسوف دەدات و، (هیگڵ) تیۆریزە بۆ دەوڵەتی پروسی ستەمکارو دەوڵەتی پۆناپارتی پاوانخواز دەکات. ئەوەش (مارکس) کە دەرفەت بۆ (دیکتاتۆریەتی تاك حیزبی دەڕەخسێنێ، وەك بەهانەیەك بۆ دیکتاتۆریەتی پرۆلیتاریا).

گەر سەرنج لە ئاراستەی فیکری عەرەبی چاوچەرخیش بدەین، دەبینین زۆر کات پەیڕەوی ئاقاری کودەتاخوازی و سەنتەریزمی سیاسی دەکات. ئەوەتا بیریارانی نەتەوەیی هاوپەیمانێتیان لەگەڵ ئەفسەرو دەرەجەدارانی سوپادا هەڵبژاردو، چەپڕەوەکانیش شۆڕشی کرێکارییان بە شۆڕشی سەربازی گۆڕییەوە، بەمەبەستی دروستکردنی گۆڕانی کۆمەڵایەتی بە زۆرو بە زەبری هێز. هەندێ لایەنیش کە دروشمی ئیسلامیان بەرزکردۆتەوە رێگای تیرۆرو توندوتیژیان گرتەبەر.

رەنگە زەقترین نمونەیەکیش کە تەعبیر لەو پەیوەندیە بەدگومانەی نێوان رۆشنبیران و سستمە دیسپۆتزمیەکان بکات، جۆری ئەو مامەڵە کردنە بێت کە بەشێکی زۆری بیرمەندانی عەرەب لەگەڵ قەیرانی کوێتدا کردیان، لەکاتی داگیرکردنی لەلایەن عێراقەوە لە هاوینی ساڵی *1990*دا. ئەگەرچی زۆریەی ئەو بیرمەندانە بانگەشەی ئەرزشی ئەقڵانی و پلورالیزمی دەکەن، بەلام لە جەوهەردا هەمان هەڵوێستی ئەو ئاقارو لایەنانەیان دووبارە کردەوە کە بە کۆنەپەرست و دواکەوتوو ناویان دەبردن.

**سەرچاوە:**

*رۆژنامەی "الشرق الاوسط"*

# بەندەرەکانی خۆرهەڵات

● فەرهاد

**بابەت: ڕۆمان**

**نووسینی: ئەمین مەعلوف**

**وەرگێڕانی بۆ سەر زمانی عەرەبی: نهلة بیضون**

ئەمین مەعلوف لە ڕۆمان نووسە دیارەکانی دنیای عەرەبە، ئەگەرچی بە زمانی فەرەنسی دەنووسێت و لە پاریس نیشتەجێیە بەلام فەزای ڕۆمانەکانی دنیای عەرەبە. تا ئێستا چەند خەلاتێکی گەورەی فەرەنسی وەرگرتوە. لە بەرهەمە ڕۆمانەکانی: سمرقند، حدائق النور، القرن الأول بعد بیاتریس، صخرة تانیوس، موانیء الشرق کە ئەم نووسینە خوێندنەوەیەکیەتی.

شوێنی ڕووداوە سەرەکیەکانی ناو ڕۆمانەکە ئەستەمبول و ئەدەنەو بیروت و پاریسن، کەسی سەرەکیش کە هەر خۆیشی ڕووداوەکان دەگێڕێتەوە (عصیان)ە. باوکی عصیان بە ئەسڵ تورکەو لە خێزانێکی سەڵتەنەتیە کە وەك خۆی دەڵێت: بۆ ماوەیەکی زۆر حوکمی خۆرهەڵاتیان کردوە، باپیری عصیان پزیشکەو بە ئەسڵ فارسەو لە ئەستەمبول دەژی و ڕێکەوتێکی سەیر دەیکاتە مێردی (ئیفیت) کە کچی یەکێك لە سوڵتانەکانی تورکە. ئیفیت بەهۆی کوژرانی باوکیەوە تووشی هیدمە (صدمة) دێت و تێك دەچێت، لە باتی ئەوەی بخرێتە نەخۆشخانەی شێتانەوە دکتۆر -کتبدار- دەیهێنێت و باوکی عصیانی لێ دەبێت. لێرەوە ڕووداوی ناو ڕۆمانەکە تەشەنە دەکات و بەرەو ئاڵۆزی پەیوەندیو کارەساتەکان دەچێت. چونکە کوڕی کتبدار-




کە باوك فارس و دایك تورکە- کچێکی ئەرمەنی دێنێت. لە کاتێکدا کە تورکەکان لە قەلاچۆکردنی ئەرمەنیدان. لەم کچە دوو کوڕو کچێکی دەبێت کە یەکێکیان پاڵەوانی سەرەکی ڕۆمانەکەیە کە عصیانە: باوك تورك و دایك ئەرمەن. بەلام

خێزانێکی زۆر دەوڵەمەندن کە میراتی سوڵتانی باپیریان بۆ ماوەتەوە. ئەم خێزانە لە ژێر فشاری داب و نەریتی ناجۆری تورکیدا کە نەدەبوو پیاوێکی تورك کچە ئەرمەنیەك بێنێت، بەناچاری لە تورکیاوە دێنە لوبنان و لە بیرۆت جێگیر دەبن. عصیان بۆ خوێندن روو لە پاریس دەکات. بەڵام شەڕی دووەمی جیهان و داگیرکردنی فەرەنسا لەلایەن نازیەکانی ئەڵمانەوە دەیخەنە ریزی ڕێکخراوە بەرگریکەرەکانەوە(مقاومة) کە دژی نازین. عصیان بەناوی خوازراوی -باکو- وە چالاکترین کەسی ناو ڕێکخراوەکەیەو ناوبانگی دیارە. ئەویش هەر لەناو ڕێکخراوەکەدا کچێکی جولەکە دەناسێت بەناوی -کلارا- دوای کۆتایی هاتنی شەڕو سەرکەوتنی فەرەنسیەکان عصیان دەگەڕێتەوە لوبنان و لەماڵی باوکی دەمێنێتەوە، دەبێتە جێگای شانازی باوك و کەس و کارو تەنانەت شارەکەی. کلارایش بە سەردان دێتە لای و ئەم دەیخوازێت، بێئەوەی ئاینە جیاکەیان ڕێگایان لێ بگرێت. بەڵام شەڕی عەرەب و جولەکە (*1948*) بەرپا دەبێت و ئەو ژن و مێردە خۆشەویستە لەیەك دادەبڕێن. کلارا دەکەوێتە شاری حەیفای فەلەستین و ئەم لە بیرۆت دەمێنێتەوە، کلارا لە حەیفا کچێکی دەبێت ناوی دەنێت -نادیا- عصیان بەهۆی ئەو شەڕەوە ناتوانێت بۆ ماوەی چوار ساڵ ژن و کچەکەی ببینێت، براکەیشی -سالم- کە چەند جارێك لەسەر قاچاخچیەتی گیراوەو ناوی خێزانەکەی ناشیرین کردوە دوای مردنی باوکیان دەست بەسەر هەموو موڵك و سامانەکەدا دەگرێت. ئەم دوو رووداوە عصیانی روناکبیرو شۆڕشگێڕ تووشی هیدمە دەکات و تێك دەچێت، براکەی دەیخاتە نەخۆشخانەی شێتانەوە. نزیکەی بیست ساڵ لەو نەخۆشخانەیەدا دەمێنێتەوە. ژنەکەی دەڕواتەوە پاریس و کچەکەی شوو دەکات و دەڕوات بۆ ئوستراليا. بەڵام عصیان لە نەخۆشخانەکەدا هەست بە هەموو شتێك دەکات، تەنانەت خوێنەر لەلایەنی هونەری ڕۆمانەکە تووشی گومان و دوودڵی دێت کە چۆن ئەم کەسە تێك چووە، هەست بە هەموئەو شتانە دەکات و ڕووداوەکانی خۆی دەگێڕێتەوە. ساڵ دەگاتە (*1976*) و شەڕی ناوخۆی لوبنان دەست پێدەکات. شەڕەکە دەکەوێتە نزیك خەستەخانەکەیانەوەو عصیان فرسەت دێنێت و رادەکات. جارێکی تر خۆی دەگەیەنێتەوە پاریس و بەدوای ژن و کچەکەیدا دەگەڕێت. کۆتایی ڕۆمانەکە بە پێك گەیشتنەوەی عصیان و کلارای ژنی دێت. مەبەستی سەرەکی ئەمین مەعلووف لەم ڕۆمانەدا بەرچاوخستنی ئەو گیانی لێبوردن و مرۆڤ دۆستیەیە کە دەشێت لەنێو هەموو ئاینە جیاوازەکان و نەتەوە جیاوازەکاندا پیادە بکرێت. گیانی پێکەوە هەڵکردن و چاوپۆشی کردن لەو ڕۆحە شەڕەنگێزیەی کە میراتیەکی گەندەڵەو مرۆڤ دەتوانێت بەسەریدا زاڵ بێت. دەشێت ئەوەی داهاتوو پەروەردەی ئەو کەلەپوورە نەبێت و، لەبەردەم ئەو گیانی ئاسوودەی پێکەوەژیانەدا نەوەیەکی تر بخاتەوە دوور لە هەموو دەمارگیریەکی ئاینی و نەتەوایەتی. بە کورتی ڕۆمانی -بەندەرەکانی خۆرهەڵات- بانگەشەی روناکبیرێکی عەرەبە بۆ هەڵکردن لەگەڵ جولەکەدا پێش هەر نەتەوەو ئاینێکی دی. بێجگە لەوەی کە دەلالەتێکی تریش هەڵدەگرێت ئەویش مەرگەساتی خۆرهەڵات و ئاسوودەیی خۆراوایە، مرۆڤە هەرە چاك و خۆشەویستەکان لەنێو کارەسات و رق و ناتەبایی خۆرهەڵاتیدا بەچۆکا دێن، شێت دەبن، ئاوات و ئایندەیان لێ تێك دەچێت، هەر خۆراوایە کە ئەنجام چاکیان بکاتەوەو ئەو جۆرە مرۆڤانە پێك بگەیەنێت. خۆرهەڵاتی خۆشەویستی و جوانی کوژو مۆلگای شەڕی ئاین و نەتەوەکان و خۆراوای لێبووردەو جەرگەی ئاشتی و ئاسودەیی.

ڕۆمانەکە (*244*) لاپەڕەی قەبارە مام ناوەندیە، دارالفارابی لە بیروت چاپی کردوە.

# ڤۆڵتێر..

## منارەی رۆشنگەریی ئەورووپیی

■ : هاشم سالح

● و: باران

مێژووی فیکر کەسێکی بەخۆیەوە نەدیوە هێندەی (ڤۆڵتێر) هەموو ژیانی خۆی بۆ دژایەتیکردنی دەمارگیریی ئایینی تەرخان کردبێ. لەبەرئەم هۆیەش ناوی ڤۆڵتێر بۆتە سیمبولێك کە خەڵکی لە هەموو شوێنێکی جیهاندا پەنای بۆ دەبەن: واتە ئەو کاتەی بوغزو کەڵلەرەقی لە ئاییندا لە سنووری خۆی تێدەپەڕێ، یا ئەوکاتەی توندڕەوەکان گەندەڵیی لەسەر زەوی بڵاودەکەنەوە. ڤۆڵتێر لە پێناوی لێبووردن یا پێکەوەژیانی ئاشتیانەی نێوان ئایین و رێبازە جیاوازەکاندا یەك لەسەریەك و بێ هیچ دوودڵی و بێزارییەك کتێبەکانی خۆی دەنووسی. لەوانەیە هەر لەبەر ئەم هۆیە بووبێت (نیچە) یەکێك لە کتێبەکانی خۆی پێشکەشدەکات و دەڵێ: "پێشکەشە بە ڤۆڵتێر، یەکێك لە گەورە ئازادیخوازانی رۆحی مرۆڤایەتی". ئەو (واتە ڤۆڵتێر) تەنها بە نووسین و تیۆریزەکردنەوە نەوەستا، بەڵکو دابەزیە ناو گۆڕەپانی شەڕەوە بۆ بەرگریکردن لەوانەی بەهۆی بیروڕاو فیکریانەوە دەچەوسانەوە. بەو شێوەیەش ئەو کە خۆی کەسێك بوو پشتاوپشت کاتولیکی بوو بەرگری



ڤۆلتێر

لە پرۆتستانت دەکرد، چەندین جاریش لە پێناوی ئەم مەسەلەیەدا ژیانی خۆی خستۆتە مەترسیەوە: دواتر لەسەر رێڕەوی ڤۆڵتێر گەورە رۆشنبیرانی گۆڕەپانی فەرەنسی وەکو (هۆگۆ، زۆلا یا سارتەر) و دەیەهای دیکەی وەکو ئەوان لە پەنجاکاندا

بەرگرییان لە مافی سەربەخۆیی جەزائیر کرد، لەو کاتەدا دژی سیاسەتی وڵاتەکەی خۆیان دەوەستانەوە لە پێناوی هەقیقەتدا، وەك چۆن ڤۆڵتێر دژی مەزهەبەکەی خۆی وەستایەوە لە پێناوی بەرگری کردن لەو کەسانە کە تەنها لەبەرئەوەی سەر بە مەزهەبێکی دیکە بوون دەچەوسێنرانەوە.

ئەو کە زۆر دەوڵەمەند بوو دەیتوانی بە تەنیاو ئاسودە دوور لە تەنگ و چەڵەمەو، بێئەوەی دوچاری مەترسیو رق ببێتەوە بۆ خۆی بژیو لە (بورجی عاج) دانەبەزێ. بەڵام هەر زوو ئەوەی زانی ئەگەر بێدەنگی بکات لەو تاوانانەی دەماریگیرە کاتولیکەکان بەناوی ئایینی مەسیحیەوە دەیکەن، خۆی لە باشترین و بەنرخترین شتێك دادەماڵێ (کە رۆشنبیر لەوانی دی جیا دەکاتەوە) ئەویش بریتیە لە بەرگریکردن لە کێشەکانی هەق و دادوەریی.

یەکێك لە گرنگترین ئەو مەسەلانەی ڤۆڵتێر بەرگری لێکردووە کێشەی ئەو خێزانە پرۆتستانتیە بوو کە لە شاری (تولون) ناسراو بە (کالاس) دەژیان. (جان کالاس)ی باوك بەوە تاوانبار کرا کە (ئەنتوان)ی کوڕی خۆی لەبەرئەوە کوشتووە گوایە ویستویەتی مەزهەبەکەی خۆی بگۆڕێ و ببێتە کاتولیکی. ئیدی هەموو جەماوەری شاری (تولون) هەستانە سەرپێ و کردیان بەهەرا، ئەوکات فەرەنسیەکان زۆر دەمارگیربوون، داوایان کرد پیاوەکە بدرێت بە دادگا یاخود دەستبەجێ سەربببڕدرێت. دادوەرانیش لەژێر فشاری کەفوکوڵی خەڵکی لەسەر شەقام و جادەکان و هەست و سۆزی تایفی زۆربەی کاتولیکەکان، فەرمانێکی بەپەلەیان دەرکرد بۆ ئەشکەنجەدانی لەسەر دۆلاب و تێکشکاندنی ئێسکوپروسکی تا ئەوکاتەی دان بەو تاوانەدا دەنێ کە نەیکردووە. کاتێ ئاگریان کردەوە بیسوتێنن (تەواو وەك ئەوەی لە سەردەمی دادگاکانی پشکنیندا روویدەدا) پاڕایەوە لێیان (کە ئەم کەسێکی بەساڵاچووە) بەڵکو بەرلەوەی فڕێی بدەنە ئاگرەکەوە بیکوژن. پاش چەند رۆژێك یا چەند هەفتەیەك دوای ئەو مەسەلەیە بۆیان دەرکەوت پیاوەکە بێتاوانە، ترسان لەوەی ئابروویان بچێ و دەسەڵاتەکانی سەرەوە دەستیان خستەکارەکەوە بۆ ئەوەی مەسەلەکە کپ بکەنەوە تاکو بڵاونەبێتەوە. بەڵام سەرەڕای ئەم کارەیان هەواڵەکە هەر بڵاوبۆوە. کاتێ ئەم هەواڵە گەیشت بە ڤۆڵتێر، شێتی دایگرت و تووڕە بوو. ئیدی لە سەرانسەری ئەوروپادا (نەوەك تەنها فەرەنسا) دەنگی نارەزایی دژی فەندەمینتالیستە کاتولیکەکان بەرز بۆوە. ئەوکاتە ڤۆڵتێر لە ترۆپکی ناوبانگ و سەروەریی خۆیدا بوو. پاش ئەوەی بە وردی لە دۆسیەی روداوەکەی کۆڵیەوە، دەسەڵاتی دادوەریی ناچار کرد سەرلەنوێ دادگاییەکە بکەنەوە. هەرواش رویداو بێتاوانی (جان کالاس) سەلما. هەموو زانیان کە ئەو بوو بە قوربانی دەمارگیری تایەفەگەری کوێرانە. هاوکاتی ئەم کێشەیە ڤۆڵتێر نامە بەناوبانگەکەی خۆی نوسی (وتارێك لە بارەی لێبووردنەوە). با بزانین چۆن گرفتەکە بە بەربڵاوی دەخاتە بەر باس و بەمەش بزووتنەوەی رۆشنگەریی فیکری و لێبوردن لە هەموو شوێنێکی ئەوروپادا بڵاودەکاتەوە. ئەو دەڵێ: "ئەگەر پێتان وایە باوەڕ نەبوون بە ئاینی زاڵ و باو یا ئاینی زۆرینە تاوانە، ئەوا بەم کارە دژی باوباپیرانی مەسیحی خۆتان دەوەستنەوە کاتێ لە ئیمپراتۆریەتی رۆمانیدا لە کەمینەیەك زیاتر نەبوون، بەڵکو پاساو بۆ ئەشکەنجەدان و چەوساندنەوەیان لەوکاتەدا

دەهێننەوە. بەلام دەزانم پێم دەڵێن: (جیاوازی زۆرە لە نێوان ئەو حاڵەتەو حاڵەتی ئێستاماندا، هەموو ئاین و مەزهەبەکانی دیکە مرۆڤ دروستیکردوون جگە لە مەزهەبی کاتولیکی پاپایزمی رۆمانی کە خوا دروستیکردووە). بەلام ئەگەر وامان دانا راستدەکەن، ئایا دەبێ ئاینەکەمان لە رێگەی رق و کوشتن و ئەشکەنجەدان و تیرۆرەوە زاڵ و بالادەست بێت؟ مادامەکی ئاینی مەسیحی ئاینێکی یەزدانیە، ئیدی قەدەغەیە مرۆڤ دەستی تێبخات و بەناویەوە حوکم بدات ئەگەر خوا خۆی ئەم ئاینەی دروستکردووە ئەوا هەر خۆی دەتوانێ بەبێ پاڵپشتی ئێوە بیپارێزێ، ئێوە دەزانن کە دەمارگیری جگە لە کەسانی یاخی و دووڕو کەسی تر بەرهەمناهێنێت. چ هەڵبژاردنێکی شومە؟!. دەتانەوێ لە رێگەی جەلادەکانەوە پاڵپشتی رێگەی خودا بکەن و رۆشنی بکەنەوە، لە کاتێکدا هەر جەلادەکان بوون دامەزرێنەرەکەیان کوشت کە مەسیحە. وا دەڵێم و هەموو زۆر باش دەزانن کە مەسیح لە ژیانیدا جگە لە چاکەو لێبوردن و سەبر رێگەی بە هیچی تر نەداوەو هەموو ئینجیلیش شاهیدی ئەمەیە. پاش ئەوە بە ماوەیەکی کەم فەندەمەنتالیستە کاتولیکەکان ناشرینیەکی دیکەیان نواند کە لەوەی پێشتر کەمتر نیە، ئەویش چیرۆکێکە بە چیرۆکی (دولابار) ناویانگی دەرکردووەو ئەمەش پوختەکەیەتی: لە یەکێك لە شارە بچوکەکانی فەرەنسادا چیرۆکێکی سەیر رویدا. بەیانی کە شار خەبەریان بۆوە بینیان ئەو خاچەی لەسەر پردی شارەکە هەڵواسراوە لایەکی براوەتەوە. هەموو شار لەم کارە ترسان کە مانای (لەناوبردنی مەزنترینی شتە پیرۆزەکانی مەسیحیەت کە خاچەکەی مەسیحە) دەگەیەنێ. لەو سەردەمەدا خەڵکی زۆر پەیوەست بوون بە ئاین و کەلەپوورەکەیانەوە. مەترانی ناوچەکە داوای لە خەڵکی کرد لە شێوەی سروتێکی ئاینیدا بە کۆمەڵ رێپێوان بکەن تا سەرپردەکە بۆ ئەوەی رووبکەنە خواو داوای لێبوردنی لێ بکەن. مەتران لەبەردەم خاچە شێوێنراوەکەدا ئامۆژگاریەکی ئاینیداو تیایدا گوتی: "ئەوانەی ئەم کارەیان کردووە شایەنی ئەوەن لە ژیانی ئەم دنیا ئەشکەنجە بدرێن و لەو دنیاش تا هەتا هەتایە تۆڵەیان لێبکرێتەوە". هاوکاتی ئەمە بۆیان دەرکەوت پەیکەرەکەی مەسیح لە گۆڕستانەکەدا پیسایی پیاکراوەو شێوێنراوە. ئیدی هەموو خەڵکەکە هەستان و تووڕە بوون و کۆمەڵێ گەنجی هەرزەکاریان بەم کارە تاوانبارکرد کە لەنێو خەڵکیدا قێزەون بوون و کارەکانیان بوو بووە مایەی شەرمەزاری و ئابڕووچوون.

ئەمانە سەر بە باشترین خێزانەکانی شارەکە بوون و هەموویان کوڕی زۆرینە کاتولیکیەکان بوون. هەروەها هیچ گرفتێکی مەزهەبی یا تایفیان نەبوو، هێندەی هەیە کۆمەڵێ لاو بوون و وەك هەر گەنجێکی دیکەی هاوتەمەنی خۆیان بەدوای خۆشی و رابواردندا دەگەڕان. دواخەمیشیان ئەوە بوو بچن بۆ کەنیسەو نوێژە ئاینیەکانیان بکەن و فەرزە ئاینیەکان جێبەجێ بکەن. لەنێو ئەو کەسانەدا کوڕێك هەبوو ناوی (جان فرانسو لوفیفەر) بوو کە پێیان دەوت (دولابار). ئەم گەنجە بێ دایك باوك و هەتیو بوو، بۆیە پوری کە سەرۆکی کەنیسەکە بوو لەو بینایەدا کە لە پشت کەنیسەکەوە بوو پەروەردەو بەخێوی دەکرد. لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر لە خەڵکانی شارەکە دەیانویست تۆڵە لە خێزانەکەی بکەنەوە

ئەمەش لەبەر چەند هۆیەکی مادی یاخود کێشەی کۆنیان کە هیچ پەیوەندییەکی بە ئایین و باوەڕدارییەوە نەبوو، هەموو چاویان خستە سەری و گومانیان لێکرد. ئیدی تۆمەتی جنێودان و کفرکردن یا گاڵتەکردن و بە سوکگرتنی شتە پیرۆزەکانیان بۆ هەڵبەست. سەرەڕای ئەوەی لێکۆڵینەوە دەریخست کە لەو شەوەدا کە خاچەکەی تیا شێوێنراوە ئەو لەسەر پردەکە نەبووە، هەر سوربوون لەسەر تاوانبارکردنی. بەو شێوەیە پرۆسەیەکی ساختەیان داتاشی و تۆمەتێکی درۆیان بۆ هەڵبەست. لە راستیدا پاش ئەوەی ژورەکەیان پشکنی چەند کتێبێکی گومانلێکراویان تیا دۆزیەوە، بۆ نمونە ئەو کتێبانەی باس لە غەزەل و ئافرەت و سێکس دەکەن سەرباری فەرهەنگی فەلسەفی فۆلتێر. ئەمە جگە لەوەی ئەو کاتەی رێ و رەسمە ئاینیەکە بە بەردەمیا رۆیشتووە، دەموچاوی خۆی شاردۆتەوەو سەری هەڵنەبڕیوەو ئەمەشیان کردە بەڵگە بۆ بێباوەڕی ئەم کەسە. هەروەها کردیانە پاساوێك بۆ پارچە پارچە کردن و سوتاندنی چونکە تەنها مانەوەی لەسەر زەوی مەترسیە بۆ پیسکردنی پاکێتی مەسیح. خەڵکی سەریان لەم سزایە سوڕما کە لەگەڵ قەبارەی تاوانەکەدا ناگونجێ، چونکە یاسای باوی ئەوکاتە کە لویسی شانزەیەم لە ساڵی (*1666*)دا دایڕشتبوو تەنها سزای (داخکردنی لێو)ی ئەو کەسەی داناوە کە جنێو بە ئاینی مەسیحی بدات؛ ئەمە ئەگەر حەوت جار جنێو بدات یا پیرۆزیەکان بشێوێنێ نەوەك یەکجار. بەڵام لەوە دەچوو کەلەرەقەکان بە فرسەتێکی گونجاویان زانی بۆ ئەوەی حسابی خۆیان لەگەڵ فەیلەسوفانی رۆشنگەریدا یەکلایی بکەنەوە کە ئەوکات بیروڕاکانیان بە خێراییەکی لە رادەبەدەر لەنێوەندی خوێندەوارانەدا بڵاودەبۆوە. راوێژکاری دادگاش خۆی کەسێك بوو لەش و لارێکی رەق و تەقی هەبوو دەنگ و میزاجی زۆر توندڕەوانە بوو کە پێیان دەوت (باسکین) و سەر بە توندترین توێژی فەندەمەنتالیستەکان بوو: توێژی جانسینیەکان کە پەرلەمانی پاریسیان کۆنترۆڵ کردبوو. لەکاتی دادگاکەدا هێرشێکی توندی کردە سەر بیروڕای فەیلەسوفەکان بەتایبەتی فۆلتێر کە ناوی هێناو باسی کرد. پوختەی قسەکانی ئەم مانایەی دەگەیاند: دەبێ دەرسێکی ئەو کافرانە دابەین لەمڕۆ بەدواوە بیریان نەچێتەوە. هەروەها داوای کرد توندترین سزای ئەو گەنجە بچکۆلەیە بدەن کە ئیدی خۆیشی نەیدەزانی پاش ئەو هەموو بوغزوکینەیەی بەرامبەری هەیە چی بەسەردێت.. بەڵام وەکو هەر رایانکێشا بۆ قەسابخانەو لەبەرچاوی خەڵکیدا پەراسوەکانیان پارچە پارچە کرد ئەمەش بەرلەوەی بە شمشێر سەری لە جەستەی جیابکەنەوە. دەڵێن تا ئەو کاتەشی سەری لە جەستەی جیاکراوەتەوە چاوی و لێوەکانی هەر دەجولان. ئەم رووداوە دیمەنێکی زۆر ترسناك بوو سەری پیاوی سپی دەکرد. (داوای لێبوردن لە خوێنەر دەکەم کە باسی ئەو هەموو وردەکاریە باس دەکەم چونکە دەزانم لە وزەی مرۆڤ بەدەرەو تەحەمول ناکرێ.. بەڵام حەزدەکەم بڵێم چاوی لە زۆر وردەکاری دیکە پۆشیوە.. پاشان بە ئەوە بزانرێت کە فەندەمەنتالیستەکان لە هەموو شوێنێك هەر فەندەمەنتالیستن و دەتوانن ناشرینترین کارە دڕندەو بەربەریەکانی خۆیان ئەنجام

بدەن). کاتێ ڤۆلتێر ڕووداوەکەی بیست تۆقی و ترس دایگرت. هەڵدەستاو دادەنیشت، هەڵدەچوو و پاشان سارد دەبۆوە، ئیدی نەیدەزانی چی بکات.

بۆ یەکەم جار بوو شێخی فەیلەسوفان توشی ترسێکی راستەقینە بێت. ئیدی لەبەرچاو ون بوون تاوەکو ئاژاوەکە هێور بۆوە ماوەی سێ مانگ ماڵەکەی خۆی بەجێهێشت. لە راستیدا ئەو چوو بۆ لای پرۆتستانتەکانی دیکە کە لەولای سنورەوە بوون، بەشێوەیەك کە ئیدی دەستی (برایانی کاتولیك) نەیگاتێ. لەو ساتەدا ڤۆلتێر بیری لەوە کردەوە گروپی فەیلەسوفەکان لە پاریسەوە بانگ بکات بۆ ئەوەی شوێنێکی ئارام و بێلایەن هەڵبژێرن و تیایدا بژین، چونکە ئیدی فەرەنسا ژینگەیەکی لە بارو گونجاو نەبوو بۆ حیزبی ڕۆشنگەریی. بۆیە پێشنیاری کرد بچن بۆ لای دکتاتۆری ڕۆشنگەر (فریدریکی دووەم) پاشای بروسیا. ئاشکرایە کە ئەم پاشایە هاوڕێی بوو، وە بە پێچەوانەی لویسی پانزەی پاشای فەرەنساوە پشتگیری بیروڕای تازەی دەکرد. ڤۆلتێر پێی گوتن: دەتوانین لەوێ سەنتەرێکی لێکۆڵینەوەی بچوك دروستبکەین و بە ئاشکرا دژایەتیەکی فیکریانەی فەندەمەنتالیستەکان بکەین. یا دەیانبەزێنین یا دەمانبەزێنن، (لەسەر ئاستی فیکری) یا هەرەسیان پێدەهێنین، یا هەرەسمان پێدەهێنن. بەم (دیدرۆ) کە سەرۆکایەتی گروپی (یەسوعیەکان)ی دەکرد لە پاریس ئەمەی رەتکردەوە بەو بیانووەی کە ناتوانێ لە ژن و منداڵەکانی جیابێتەوەو وای بە باش زانی هەر لە پاریس و لە شوێنی خۆیەوە کاربکات و بەردەوام بێ.. (دولامبێر) و ئەوانی دیکەش هەر وایان کرد. ڤۆلتێر بە دەنگێکی بەرز بیری دەکردەوەو دەیگوت: پێنج یا شەش فەیلەسوف و چاپخانەیەکم بەسە، دڵنیاش بن لەوەی دەتوانین لەم دوو سێ ساڵەدا شۆڕشێکی گەورە لە عەقڵی خەڵکیدا بکەین. لە راستیدا کارەکەی ڤۆلتێر وەهم بوو یا با بڵێین زیاد لە پێویست گەشبینانە بوو. چونکە یەکلایی کردنەوەی کۆتایی لەگەڵ فەندەمەنتالیزمی مەسیحیەتدا تەنانەت پاش مەرگی خۆیشی زیاد لە سەدەیەکی خایاند. راستە ڕۆشنگەری لە نیوەی دووەمی سەدەی هەژدەیەمدا لەسەر ئاستی ژینگە ڕۆشنبیریەکانی پاریس سەرکەوت، بەڵام پرۆسەی یەکلاییکردنەوە لەسەر ئاستی میللی- سیاسی لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەدا ڕوویدا. ئەوکات راسترەوە کاتولیکە فەرەنسیەکان بۆیان دەرکەوت ململانێکردن لەگەڵ ئەو ژینگە کولتوریەدا بێسوودەو بیروڕاکانی ڕۆشنگەریی و عەقڵانیەت و مۆدێرنە بوون بە راستیەکی حاشا هەڵنەگر. بەم شێوەیەش ڤۆلتێر پاش مەرگی خۆی سەرکەوت و بوو بە منارەیەکی پرشنگدار بۆ هەموو نەوەکانی داهاتوو.

**سەرچاوە:**

*ڕۆژنامەی (الشرق الاوسط)*

*ژمارە (7909)، 2000/7/24*

# بیست سەعات مانەوەکەی

## گراهام گرین لە هاڤانا


- دەقی: گابرێل گارسیا مارکیز
- و: کامیل محەمەد قەرەداخی





گراهام گرین ماوەی بیست سەعات لە هاڤانا مایەوە، پەیامنێرانی ڕۆژنامە بیانیەکان هەمو جۆرە شیکردنەوەکانی خۆیانیان بۆ ئەم ڕووداوە کرد، هەر دەبو وا بکەن. چونکە گرین بە فڕۆکەیەکی تایبەتی گەشت کە حکومەتی نیکاراگوا پێشکەشیان کردبو. خۆسێ دی خیسۆس مارتینس ی شاعیرو ئوستادی بیرکاریی پەنەماییش هاوەڵی بو، ئەم مارتینسە یەکێك بو لە دۆستە هەرە نزیکەکانی ژەنەراڵ عومەر تۆریخۆس. لە فڕۆکەخانەش فەرمانبەرانی ڕێورەسمە تایبەتیەکان پێشوازییان لێکردن. ئەم شتە هێندە بەنهێنی ڕویدا، کە تا گەشتەکە تەواو نەبو هیچ ڕۆژنامەوانێك پێینەزانی. هەردووکیان گوازرانەوە بۆ ماڵێك کە بۆ میوانە گەورەکان و، بەتایبەتیش سەرۆکی وڵاتە دۆستەکان تەرخان کرابو، ئۆتۆمبێلێکی مارسیدس بەنزی ڕەشی کەشخەشیان درایە دەست، کە یەکێك بو لەو ئۆتۆمبیلانەی ئۆ ساڵ لەوەوپێش لە کۆبونەوەی

شەشەمی کۆنگرەی وڵاتانی بێلایەندا بەکارهێنرابو، بەڵام لە راستیدا ئەوان ئۆتۆمبیلەکەیان بەکارنەهێنا، چونکە ئەوان لەماڵەکە نەچونە دەرەوەو هەر لەوێدا هەندێکی هاوڕێ کوبایییە دێرینەکان ئەوانەی کە هەواڵی سەردانەکەیان بیستبو، نوسەر خۆی ئاگاداری کردبون، سەردانیان کردن.

رێنێ پۆرتوکاریرۆی وێنەکێش هاوڕێیەتیەکی ئەوکاتەی لەگەڵ گراهام گریندا هەیە کە گرین بۆ تاوتوێکردنی کەشەکانی رۆمانی (پیاوەکەمان لە هاڤانایە) چوبوە هاڤانا ئەمیش درەنگ هەواڵەکەی بیستبو، کە هاتبوە سەردانی، ئەم دەمێك بو گەڕابۆوە ئەو شوێنەی کە لێوەی هاتبو. لە ماوەی ئەو بیست سەعاتەدا لە تەنها یەك جار پتر نەیویست نان بخوات، وەك چۆلەکەیەکی تەڕ لەهەر دەفرێك پارویەکی هەڵئەگرت. بەڵام لەسەر سفرەکە یەك بتڵی تەواو شەرابی ئیسپانیی سوری باشی خواردەوەو لەومانەوە کەمەی ناو ماڵەکەدا حەوت بتڵ ویسکیشی خواردەوە. کە رۆشتەوە بۆچونێکی سەیری لەزەینی ئێمەدا بەجێهێشت، وەك ئەوەی کە تەنها لە کەسێتیە ئازارچەشتوەکانی ناو رۆمانەکانی روەبدەدات، خۆیشی هۆی ئەو هاتنەی نەدەزانی بەدوو سەعات پاش گەشتنەکەی من چوم بۆ لای. چونکە هەر کە زانیبوی من لەو شارەدام پەیوەندیی پێوەکردم، منیش بەوە زۆر دڵخۆش بوم، دیارە نەك تەنها لەبەر ئەو رێزە دێرین و گەورەیەی کە من، وەك نوسەرێك و وەك مرۆڤێك لەوی دەگرم، بەڵکو لەبەر ئەوەی ساڵانێکی دورو درێژ بەسەر دوا دیدارماندا تێپەڕیبو. ئەوە دوا دیدارمان بو –کە وەك ئەوەی ئەویش لە یادیەتی– بەیەکەوە لەناو وەفدێکی نەمایی رەسمیدا بۆ ئیمزا کردن لەسەر رێکەوتنەکانی کەناڵ چوین بۆ واشنتەن، بۆچونی هەندێکی رۆژنامەکان لەو رۆژگارەدا وابو کە بڵێن بانگهێشت کردنی ئێمە بۆ بەشداریی ئەو وەفدە مانۆڕێکی عومەر تۆریخۆسە بۆ جوانکردنی وەفدە رەسمیەکەی بەناوی دوو نوسەری ناودارەوە کە پەیوەندیان بەو چالاکیەوە نیە بۆی دەچن.

لە راستیدا ئێمە هەردوکمان پەیوەندییەکی لەوە زۆرترمان بە گفتوگۆکانی رێکەوتنەکەوە هەبوو کە رۆژنامەکان دەیانزانی: بەڵام داوەتکردنی ئێمە لەلایەن ژەنەراڵ تۆریخۆسەوە بۆ هاوەڵیکردنی بۆ واشنتەن نە لەبەر ئەو هۆیە بو کە ئێمە دەمان زانی و نە ئەوەش کە ئەوان دەیانوت، بەڵکو بۆ ئەوەبو کە تۆریخۆس دەیویست گاڵتەیەکی باش بە سەرۆك جێمی کارتەری هاوڕێی بکات. مەسەلەکەش ئەوەیە کە گراهام گرین و منیش–وەك زۆر نوسەرو هونەرمەندی تری جیهان– ساڵانێکی دورو درێژە لەبەر چەند هۆیەك کە تەنانەت سەرۆکی ئەو وڵاتانەش ناتوانن شیی بکەنەوە، چونە وڵاتە یەککگرتوەکانمان لێ قەدەغە کراوە. ژەنەراڵ تۆریخۆسیش بەڵێنی چارەسەرکردنی ئەم کێشەیەی دابو، ئەم مەسەلەیەشی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری ئەو گەورە فەرمانبەرە ئەمریکیانەدا باس کردبو کە لەو کاتەدا سەردانیان دەکرد، دواجاریش گەیاندبوی بە خسودی کارتەرو ئەویش مەسەلەکەی پێ سەیر بوو بڕیاریدا

بوو کە مەسەلەکە زۆر بەخێرایی چارەسەر بکات. بەڵام پێش ئەوەی بتوانێت وەڵامەکەی پێشکەش بکات، ماوەی سەرۆکایەتیەکەی کۆتایی هات.

کاتێك کە تۆریخۆس وەفدی چون بۆ واشنتەنی دروست دەکرد، بیرۆکەیەکی وای بۆ هات کە من و گراهام گرین بە قاچاخی بباتە وڵاتە یەککرتوەکانەوە، ئەم مەسەلەیە بوبو بە غایلەی، بە ماوەیەکی کەم پێش ئەوە پێشنیاری بۆ گراهام گرین کردبو کە لە بەرگی کۆلۆنێلێکی پاسەوانی نیشتمانیی پەنەمایدا خۆی بشارێتەوەو لە چالاکیەکی تایبەتدا بچێتە واشنتەن بۆ لای سەرۆك کارتەر، ئەوەش تەنها بۆ ئەوەی بەشێوازەکەی خۆی گاڵتەیەك لەگەڵ کارتەردا بکات: بەڵام گراهام گرینی فرە سەلارتر لەوەی کە لە هەندێك لە کتێبەکانیدا دەردەکەوێ، حەزی نەکرد جەستەی بەشکۆی خۆی بداتە دەست ئەو خوازەیە، بەڵام ئەگەر ئەوە ڕوی بدایە بێگومان یەکێك دەبو لە خۆشترین ڕوداوەکانی ناو بیرەوەریەکانی. لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك کە ژەنراڵ تۆریخۆس پێشنیاری ئەوەی بۆ کردین بە ناسنامەی ڕون و ڕەوانی خۆمانەوە بەشداریی ڕێوڕەسمی ئیمزاکردنی ڕێکەوتنەکان بکەین، بەڵام بە پەساپۆرتی پەنەمایی ڕەسمی وەك ئەندامانی وەفدی ئەو وڵاتە بچین، هەردوکمان بە ئاسودەییەکی منالانەوە بە مەسەلەکە قایل بوین. بەمشێوەیە بەیەکەوە گەشتینە بنکەی سەربازیی ئەندرۆس. ئێمە پانتۆڵی کاوبۆو کراسی سوکمان لەبەردا بو لەناو وەفدێکی کاریبیانەدا بوین کە ئەندامەکانی بەرگی ڕەشیان لەبەردا بوو، هەمویان لە دەنگی تەقینەوەی بیست و یەك تۆپەکەی پێشوازی کردن و، لە دەنگی مۆسیقا جەنگیەکەی سرودی نیشتمانیی ئەمریکایی، کە وەك بەشێك لە لاواندنەوە وابو، تۆقیبون.

گراهام گرین هەستی بەو بارگە ئەدەبییە کردبو کە لەو چرکەساتەدا هەبو، کە لە پەیژەی فڕۆکەکە دادەبەزین چپاندی بە گوێمدا (ئای خوایە لەم شتانەی کە لە وڵاتە یەککرتوەکان ڕودەدەن) کاتێك کە ژەنەراڵ تۆریخۆس باسی یارییە فێڵبازانەکەی خۆیی بۆ کارتەر کرد، ئەویش خۆیی پێنەگیرا، پێکەنی و ددانە سپیەکانی کە لە ددانی بێژەرەکانی سەر تەلەفزیۆن دەچون دەرکەوتن.

لە پاش ئەو هەمو ساڵانە گەڕامەوە بۆ دیداری گراهام گرین، ئەو گراهامەی کە هەمیشە گەنج دەبێتەوە و هێشتا زەینە روونەکەی یەکێکە لە سەیرترین و جێگیرترین سیفەتەکانی. هەروەك جاران قسەمان کرد، لەسەر هەمو مەسەلەکان هەر مەسەلەو تۆزێك لەسەری دواین، بەڵام ئەوەی لە هەمو شتێك پتر سەرنجی ڕادەکێشام ئەو شێوە گاڵتە ئامێزەی بو کە ئیشارەتی پێ دەدایە ئەو چوار دادگایی کردنەی کە دەبو لە چوار دادگای جیاوازی فەرەنسەدا ڕوبەڕویان بێتەوە. لەبەر ئەوەی ئامیلکەیەکی تاوانبارکردنی لە دژی مافیاکەی شاری نیس بڵاوکردبۆوە. ئەوانەی بە جیهانی خواروی کەناری شینی فەرەنسە ئاشنان هەست دەکەن ئەوە گرین ئاشکرای کردوە، شتێکی نوێ جاڕ نادات. بەڵام ئێمەی هاوڕێیانی نوسەر سەبارەت بە ژیانی ئەو نیگەران بوین. خۆی

کوێـی پێنـەدەدا، بـەڵکو لـە هەڵمـەتی پـەردە هەڵماڵینەکـەی بەردەوام بـو، خـۆی وتـی (مـن ئەگەر بـە شێرپەنجەی پرۆستات بمرم، پێم باشە بە گوللەیەك بمرم کە بە سەرمەوە بنرێت)، من کاتی خۆی لە شوێنێکدا کە ئێستە لە یادم نیە کوێیە وتبوم، گراهـام گریـن بـەم هەڵمەتـەی خـۆی یارییەکی رۆلێتی ئەدەبی دەکـات، وەك ئـەو یاریـەی کـە لـە بیرەوەرییـەکانیدا گێڕاویەتیـەوە کـاتی لاوی بـە دەمانچەیـەکی سمسـی پێـوەری 23 کردویـەتی، ئـەو لـەم سـەردانەی منـدا ئـەو لێدوانەمی یاد کەوتەوەو کردی بـە سـەرەتای دەسـتپێکردنی گێڕانـەوەی وردەکاریـەکانی هـەر چوار دادگایی کردنەکەی.

لـە دەوروبـەری کـاتژمێر (یـەك)ی پـاش نیوەشـەودا بـو، فیدیـڵ کاسترۆ هاتـە سـەردانی. ئێمـە لـە سـەرەتای شۆڕشـەوە، سـەرەتایەکی زوی شۆڕشـەوە یەکتریمان ناسی. ئەوکاتـە گراهـام گرین ئامـادەی وێنـەگرتنی فیلمـی (پیاوەکەمان لە هاڤانایە) بو پاش ئەوەش لە سەردانە یـەك لـەدوای یەکـەکانی گراهـام گریندا، چـەند جارێك یەکترمان بینی، بـەڵام وەك دیـاریو ئـەوان لـە دوایـین دوو گەشـتدا یـەکتریان نـەبینیبو، لەبەرئـەوەی کـاتێك کـە تەوقـەیان کـرد گراهـام گریـن پێـی وت (نزیکەی شانزی ساڵێکە یەکترمان نـەبینیوە) وا هاتنـە پێشـچاوم هەردوکیان هەندێك بە شـەرم بن، ئەوان هیچیان پێیان ئاسان نـەبو دەست بـە قسـە بکـەن، بۆیـە من دەربارەی ئەو سـەربردەی رۆلێتـە روسییە پرسیارم لە گراهـام گرین کـرد، کـە لـە بیرەوەرییـەکانیدا دەیگێڕێتـەوە، هـەردووچاوە شینەکانی بریسکەیان دایەوە (ئەو دوو چاوە بێگەردترین چاوی شـین بون کە من بینیبم) وتی (ئەوە ئەو کاتـە رویدا کـە مـن بـە تەمـەنی نـۆزدە سـاڵیی مامۆسـتای خوشکەکەمم خۆش ویست) ئەمجا بۆی گێڕاینەوە کە بە راستی لـەو کاتـەدا بـە دەمانچەیـەکی کۆنـی براگەورەکـەی یـاریی رۆلێتـی روسیی کردەوەو چوار جـاری تـرو لـە چوار بۆنـەی جیاوازدا چـەند بـارەی کردۆتـەوە. دووجـاری یەکـەمیان نزیکـەی هەفتەیـەك نێوانیـان بـو، بـەڵام دووجـاری دوایـین بـەدوای یـەکدابوون و هەرچەند خولەکێکیان نێوان بو.

کاسـترۆش کـە نـاتوانێت رەوتەنییانە بەسـەر مەسـەلەیەکی وادا تێپـەڕێ و دەبـێ دوایـین وردەکارییـەکانی بپرسـێت، لێـی پرسی، شانەی دەمانچەکەت چەند فیشـەکی دەگرت، گراهـام گریـن وتـی "شـەش فیشـەك" لـەوێدا کاسترۆ هەردوو چـاویی نوقـاندن و بە چپەچپ چەند ژمارەیـەکی لێك دا، ئـەمجا دواجار سـەیری کـاکی نوسـەری کردو پێیـوت (بە پێـی حسـابی گریمانـەکان، تـۆ دەبـێ ئێسـتا مردبیـت) گراهـام گریـن بزەیەکی هێمنی بۆ کرد، بزەیـەك کە هـەرچی نوسـەرێك هەسـت بکات کەڕوداوێکی نـاو کتێبێکـی خـۆی دەگوزەرێنـێ دەیکـات، ئـەمجاوتی (لـە خۆشـبەختیم هەمیشە لە بیرکاریدا تەمەڵ بوم) وابزانم لەبەرئەوەی باسەکە لەسەر مردن بو، خـێرا فیـدڵ کاسـترۆ چاوی خستە بونیـادی پتـەو، و لەشی دروستی نوسەر، لێی پرسی چ مەشقێك دەکات؟ کاسـترۆ کـە پەروەردەی جەستەیی بـە یـەکێك لـە مەسـەلە بنچینەییـەکانی ژیـان دادەنـێ، نـەدەبو پرسـیارێکی وای

بەسەردا تێپەڕێ، چونکە خۆی هەمو رۆژێک چەند کاتژمێرێک مەشقە وەرزشیەکان دەکات، وەرزشەکەشی هەر بەو رێژە زۆرە دەکات کە هەمو ئەرکەکانی تری خۆیی پێ رادەپەڕێنێت، ئامۆژگاریی هەمو هاوڕێکانیشی دەکات کە سیستمێکی وەرزشیی لەو شێوەیە لەبەرچاو بگرن.

ئەو لە چاو پیاوانی هاوتەمەنی خۆیدا تەندروستیەکی جەستەیی ناوازەی هەیەو ساغیی هۆش و بیریشی بۆ ئەوە دەگەڕێنێتەوە، بۆیە زۆر بەلایەوە سەیر بو کە گراهام گرین و لەوەلامدانەوەیدا وتی هەرگیز لە ژیانیدا هیچ مەشقێکی وەرزشیی نەکردوە و لەگەڵ ئەوەشدا کە تەمەنی حەفتاو نۆ ساڵەو هەست دەکات زەینی پوخت و بێخەوشەو هیچ بشێویەکی دروستیی نیە، هەروەها ئەوەشی ئاشکرا کرد کە لە خواردندا هیچ جۆرە پارێزێکی تایبەتی ناکات و رۆژانە حەوت تا هەشت سەعات دەنوێ، ئەمە مەسەلەیەکی سەیر بو بەلای پیرێکەوە کە چەند خوویەکی جێگیری هەیە، ئەمجا وتی رۆژی وا هەیە یەک شوشە ویسکی دەخوات. لەگەڵ هەر ژەمە خواردنێکیشدا یەک ژەم شەراب، بەبێ ئەوەی هەرگیز بەدەست خۆگرتن بە کحولەوە بناڵێنێ.

بۆ ساتەوەختێ وا لە فیدێل کاسترۆ دەرکەوت کە لە کاریگەریی سیستەمە تەندروستیەکەی خۆی کەوتبێتە گومانەوە، بەڵام زوو هەستی کرد کە گراهام گرین ناوازەیەکی سەیرە، تەنها ناوازەیەک و هیچی تر، کە ماڵئاواییمان لە یەکتر کرد، وردە وردە خەریک بو دڵنیابم لەوەی کە زوبێت یان درەنگ ئەو دیدارە لە یاداشتەکانی یەکێکماندا، یان رەنگە هەرسێکماندا، دەبێ باسی بکرێ.

**سەرچاوە:**

*کوبا فی زمن الحصار - غابریل غارسیا مارکیز- ت. صالح علمانی- دمشق 1998 ص 101- 111.*

